٥٩

# سەردەم

سالی یانزەهەم

هاوینی

٢٠٠٩

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کلتوری بیانی

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

خاوەنی ئیمتیاز:

شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر:

ڕەووف بێگەرد

سکرتێری نووسین:

شوان ئەحمەد

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی

د. شاهۆ سەعید

دەرهێنان و کاری کۆمپیوتەری

تاڤگە فائق

هەڵەچنی چاپ:

ساکار رەووف

بەرگ :

نەرمین مستەفا

-سەردەم گۆڤارێکی وەرزییە، تایبەتە بە نوسین و وەرگێڕانی کولتوری بیانی لەبواری فەلسەفە و رەخنە و زانستە مرۆییەکان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیکیدا.

-داوا لەو بەڕێزانە دەکەین کە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەکەن، هاوپێچ ناوی تەواوی نووسەر، وەرگێڕ، سەرچاوەو زانیارییەکانی تایبەت بەچاپ و بلاوکردنەوە، لەگەڵ کۆپییەك لەدەقی ئەسڵیی بابەتی وەرگێردراو بنێرن.

-ئەو بەڕێزانەی بە نوسین و ئامادەکردن بەشداریدەکەن پێویستە هەموو مەرجە ئەکادیمیەکان، لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە، پێڕەوبکەن.

-باشتروایە بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ کرابن، هاوپێچ لەگەڵ سی-دی و دەقی چاپکراوی بابەتەکەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیکترۆنی نوسەر یان وەرگێڕدا.

-ئەو بەڕێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێڕن پێویستە هاوپێچ ناونیشانی تەواوی سایت و لینك و رۆژی بلاوکردنەوەی سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکە بنێرن.

-بەرهەمەکان گەر بلاوبکرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەکانیان.

-پەیوەندییەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە ئەنجام دەدرێن.

# ناوەڕۆکی:
# سەردەم - ژمارە ٥٩

## فیکر و فەلسەفە



## ئەدەب



## گفتوگۆ

## وێستگەکانی سەردەم




**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**

Tel _ Fax: 00447543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی
ژمارە (615/ 14665 و 616/ 14665) تاران

**لە ڕێگەی (ئیمەیل)ەوە:**
govarysardam@yahoo.com

www.sardam.inf
www.sardam.net
www.sardam.org

**ناونیشان:**

سلێمانی - شەقامی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
تەلەفۆن: سەرنووسەر ٠٧٤٨٠١٣٦٦٥٩

دەزگای سەردەم ٣١٢٩٦٠٩


**نرخی (١٢٥٠) دینار**

# رۆشنگەری

ری پۆتەر
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

## ١- چەمکی سەرەتایی رۆشنگەری:

فەیلەسوفی ئەڵمانی ئیمانۆئیل کانت، کەمێک زیاتر لە دوو سەدساڵ پێشتر وتارێکی نوسی بەناوی (رۆشنگەری چیە). بە بڕوای کانت رۆشنگەری بریتیە لە قۆناغی کامڵبوونی کۆتایی مرۆڤ، رزگاربوونی هوشیاری لە کۆتوبەندی جەهل و گومڕاهی. کانت بڕوای وابوو رەوتی ئازادی فیکری مرۆڤایەتی، لەسەردەمی هاوچەرخی خۆیدا رویداوە. هێزی بزوێنەری ئەم جوڵە روو لەپێشە، پێشکەوتنی زانینی مرۆڤ، ناسینی سروشت و بەهەمان شێوەش بەدەستهێنانی ناسینە لەبارەی خۆیەوە. دروشمەکەی کانت بریتی بوو لە ئازایەتی زانینت هەبێت کە ئەم دروشمەی لە هوراتێۆسی شاعیری رۆمیەوە وەرگرتبوو.

بەڵام تەنها مێژوونوسانێک کە دیدێکی بەشێوەیەکی گشتی نارەخنەگرانەیان هەیە، دەتوانن بەهەمان دڵنیایی کانتەوە رایگەیەنن ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە بەسەردەمی رۆشنگەری سەدەی هەژدەی ناودەبەین، واتە هەموو ئەو باوەڕ و پێشنیارە «پێشکەوتوو» و «لیبرالانە»بەهۆی رۆشنبیران و بانگەشەکارانی ئەو سەردەمەوە بەرەو پێشەوە دەبران، بێ چەندو چون هەنگاوێکی بڕاوە بووە لە رەوتی پێشکەوتنی مرۆڤدا. مێژونوسان بە گومانەوە تەماشای ئەو قسانە دەکەن کە بیریارانی پێشوو لەبارەی سەردەمی خۆیانەوە گوتویانە. لە هەموو قۆناغێکدا ریوایەت و ئەفسانەگەلێک لەبارەی «روبەروبونەوەی بەرەی باش بیرکەرەوانو خراپ بیرکەرەوان»، و سەرکەوتنی «پاڵەوانانی» ئایندەبین، بەسەر ستەمکاران و بیروشکە کۆنەپەرستەکاندا بۆ

هەمواركردنی ڕێگەیەكی ئایندەی باشتر بۆ مرۆڤ هەیە. ئەو تیشكانەی زەمەن دەیخاتە سەر ئەم وێنانە، لایەنگیری و پێشداوەریان ئاشكرادەكات. لەبنەڕەتدا خودی ئەو وێنایەی كە ڕۆشنبیرانی سەردەمی ڕۆشنگەری دەیانتوانی بەرنامەیەكی كامڵ و تیروتەسەل بۆ پێشكەوتنی مرۆڤ بدۆزنەوە، وێنایەكی هەڵەیە. ڕاستیەكەی ئەوەیە ڕۆشنگەری خۆی هەندێك مەسەلەی تازەی بەدوای خۆیدا هێنا كە دەبوو بەهۆی مێژوونوسانەوە شیبكرێتەوە و لێی وردبێتەوە. بزوتنەوەی ڕۆشنگەری بۆ ماوەیەكی دورودرێژ لەژێر فشاری جۆراوجۆردا بوو. «سەردەمی عەقڵ» (زاراوەیەكی فرەمانایە كە زۆرجار بە بیركردنەوەكانی سەدەی هەژدەهەم دەگوترێت) لە قۆناغی ڕومانسیزم و مەلیكە ڤیكتۆریادا وەك سەردەمی بیریارانی ساوێلكە و میكانیكی كە بڕوایەكی نەگۆڕیان بە عەقڵی ئەبستراكت هەبوو، ڕەخنەكرا. بەپێی بڕوای زوربەی بیریارانی سەردەمی ڕۆشنگەری، عەقڵ بەتەنیایی دەتوانێت ئەگەری ناسینی مرۆڤ، كۆمەڵگا، سروشت و بوون بۆ مرۆڤ بڕەخسێنێت، و ئامرازی ڕەخنەی هەلومەرجی هەنوكەیی (STATUS QUE) سیاسەت و مەزهەبی بۆ دەستەبەر دەكات.

عەقڵ بەر لەهەر شتێك پایە تیوریەكانی ئایندەی یۆتۆپی ئامادە كرد. لەبەرامبەر ئەمەدا ڕۆمانسیەكان ئەوەیان دەردەبڕی كە بوونی جیهان زۆر هەمەڕەنگترە لەوەی كە فەیلەسوفانی خەیاڵپەروەر و بیرۆكراتی سەردەمی ڕۆشنگەری وێنایان دەكرد: خەون، هەستەكان، هێزی ئۆرگانی مێژوو و نەریت، و ڕاز و نهێنیەكانی ڕۆحیش بەشێكن لە هەرێمەكانی تری ئەم بوونە. بەپێی باوەڕی ڕۆمانسیەكان، تێزەكانی سەردەمی ڕۆشنگەری هەندێكجار ساوێلكانە و هەندێكجاریش وروژێنەرن، بەڵام هەمیشە لەرووی ناوەڕۆكەوە بەتاڵن، و مێژوو پیشانیداوە كە بەشێوەیەكی ترسناك مەترسیدارن. زۆرێك لە ڕەخنەگرانی سەدەی نۆزدە بڕوایان وابوو توندوتیژی دژی مرۆڤ و ئەو تاوانانەی لەسەردەمی شۆڕشی فەڕەنسی و پاش ئەودا ڕویاندا، ڕەگیان لە هیومانیزمی نمایشی سەردەمی ڕۆشنگەریدا هەبوو. ئەمڕۆش ڕەخنەگرانێك كە لەگەڵ بیركردنەوەكانی ڕۆشنگەریدا نین، ئاماژە بۆ چەندان خاڵی هاوشێوەی ئەمە دەكەن.

لێرەوە «سەردەمی عەقڵ» لەسەدەی نۆزدەهەمدا لایەنگرانێكی كەمی هەبوو. ڕۆمانسیەكان بە بێ ڕۆحیان دەزانی، كۆنزەرڤاتیڤەكان بە زیاد لە پێویست ڕادیكالیان دەزانی، لەكاتێكدا ڕادیكالەكان بەداخەوە ڕایاندەگەیاند كە پێشڕەوان و بیریارانی سەردەمی ڕۆشنگەری وەك ڤۆڵتێر، لە بنەڕەتدا پێشەنگی دنیاپەرستی «WORLDLY ELITISTS» بوون كە حەزیان بە دانیشتنە ئاهەنگیەكان زیاتر لە چالاكیە شۆڕشگێڕەكان دەكرد. ئێمەش لەسەدەی ئێستادا كاتێك تازە لە بەهای تەنزی هوشیارانەی بیریارانی سەردەمی ڕۆشنگەری دەگەین، كە ئاڵۆزیەكانی پەیوەندی نێوان ئایدۆلۆژیا و پراكتیكمان دەرك كردبێت.

هەنوكە هەموو مێژوونوسان لەسەر ئەوە كۆكن كە ناونانی بەرچەسپی »سەردەمی ڕۆشنگەری» بۆ سەدەی هەژدە- بەتەواوی گۆمڕاكەرانەیە. زۆرێك لە بیریارانی بەرجەستەی سەردەمی ڕۆشنگەری، فەیلەسوفانی عەقڵباوەڕ و سیستەمسازی سەدەی حەڤدەهەم، بەتایبەتی لایب نیتز و دیكارتیان (تیورەكانی دیكارت لەبارەی «ئایدیا ڕوون و دیاریكراوەكان» كە بۆ عەقڵ بەدیهین) ڕەخنە دەكرد. ڕۆشنبیرانی سەدەی هەژدە ئەمانەیان بەهەمان ئەو توندیە ڕەت دەكردەوە كە سەفسەتەبازی لەفزی ئیلهایاتی سكۆلاستیك و عەقڵباوەڕیان بە بێ بایەخ دەزانی، كە یەكەمجار بەهۆی تۆماس ئەكیونۆسەوە داڕێژرا، و پاشان بەهۆی بیریارانی دژ بە ریفۆرمی دینیەوە وردكرایەوە. بیریارانی سەردەمی ڕۆشنگەری لەژێر تیشكی سەركەوتنی زانستی نیوتنیدا، بڕوایان وابوو ئەزمون و تاقیكردنەوە، نەك عەقڵی پێشینەیی، ڕێخۆشكەری زانینی ڕاستەقینەیە. بەبڕوای ئەم بیریارانە مرۆڤ بەهەمان ئەندازە كە ئاژەڵێكی

بیرکەرەوەیە، ئاژەڵێکی هەستیاریشە. بێگومان «گۆیا» هەقی بوو بڵێت: «سەرخەوشکاندنەکانی عەقڵ، دێو دروستدەکات». بەڵام ئەگەر عەقڵ لە ئەزموون و هەست دورکەوێتەوە، بەهەمان ئەندازە بە هەڵە و نالۆژیکی کۆتایی دێت. وەک چۆن ڤۆڵتێر لە ڕۆمانی فەلسەفی کاندید «CANDIED»دا بە ناسکی دەریدەخات، باوەڕی میتافیزکی لایب نیتزی چاوانی دکتۆر پانگلۆسی، بەشێوەیەک کوێر کردووە کە «لەباشترین ئەم جیهانە مومکینەدا کە هەر شتێک دەستی بە باشترین شکڵی خۆی دەگات»، بە تەواوی لەو ستەم و ڕەنجە بێ ئاگایە کە لەبن گوێیدا کە باشترین گوێی مومکینە ڕوودەدات.

وەک گی سەلماندوێتی نوێنەرانی بەرجەستەی سەردەمی ڕۆشنگەری، نە ئەو عەقڵباوەڕانە بوون کە بڕوایان بە عەقڵ وەک سەرچاوەی هەمەکی زانین بێت و نە ئەو دژ بە عەقڵباوەڕیەی کە هێزی دیاریکردنی خۆی بۆ هەست، باوەڕی شهودی یا بایەخی یاسایی کورتبکاتەوە. ئەوان هەموو جۆرە پەڕگیریەکی ساوێلکانە و کورتکەرەوەیان ڕەخنە دەکرد، چونکە بەر لەهەر شتێک ڕەخنەگر بوون و ئامانجیشیان ئەوەبوو سود لە عەقڵ وەک ئامرازێک بۆ ناسینی سروشتی مرۆڤ و شیکردنەوەی وەک بونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و ناسینی ئەو دەوروبەرە سروشتیەی لەناویدا دەژی وەربگرن، یان بە بڕوای ئەوان دەبێت جیهانێکی باشتر بەپێی ئەم زانینە بیناکرێت.

بیریارانی سەردەمی ڕۆشنگەری خۆیان بە فەیلەسوف ناودەنا، ئێمەش ئەم وشەیە (بەو مانایەی لە زمانی فەڕەنسیدا هەیەتی، چونکە هاوتایەکی وردی لە زمانی ئینگلیزیدا نیە)، وەک ناوێکی هەمەکی بۆ گروپێک لەم کتێبەدا بەکاردێنین و هەندێکجاریش «ڕۆشنگەر»مان بەکارهێناوە. بەڵام ئەم فەیلەسوفانە باوانی مامۆستا بیروشکەکانی فەلسەفە لە سەردەمی ئێستادا نین کە لە بورجی عاجی ئەکادیمی خۆیاندا دانیشتوون و سەرقاڵی جیاوازیە ناسکەکانی وشەکانی زمانن. لەراستیدا بیریارانی ڕۆشنگەری پیاوانی کار بوون: ڕۆژنامە نوس، وروژێنەر و ئەکتیڤیستی سیاسی. ئامانجی ئەوان تەنها تێگەیشتن نەبوو لە جیهان، بەڵکو گۆڕینیشی بوو. بەمشێوەیە دیدرۆ و دالامبێر فەیلەسوفیان لە ئەنسکلۆپیدیادا وەک کەسێک پێناسدەکرد کە «پێشداوەریەکان، نەریت، تێڕوانینە باوەکان، دەسەڵاتی باڵادەست و بەیەک وشە هەموو ئەو شتانەی کۆتوبەندێک بۆ بیرکردنەوە پێکدەهێنن، دەخاتە ژێر پێوە. فەیلەسوف کەسێکە جورئەت دەکات بەشێوەیەکی سەربەخۆ بیربکاتەوە». ڤۆڵتێر لە دەیەی ١٧٦٠دا پێشەوای خەبات دژی نادادپەروەریە یاساییەکان بوو، تۆرگۆی فەیلەسوف و ئابوریزانی بەرجەستە، ماوەیەکی کورت بەرپرسیاری کاروباری دارایی لەدەوڵەتی فەڕەنسادا لەئەستۆ بوو، بن فرانکلینی بەرجەستەترین بیریاری ئەمەریکایی بەکارهێنانی پراکتیکی زانستی ئەلەکترۆنی بونیادنا، و داهێنەری عەینەکی دولایەنە و سەرەڕای ئەمەش دەورێکی چارەنوسسازی لە دروستبونی کۆماری تازەی ئەمەریکادا بینی.

ناسینی هەمەلایەنەتر بۆ ڕۆشنبیرانی هاوچەشنی دیدرۆ و کۆندریسە، ئەو وێنە باوە بۆ فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری بێبایەخ دەکات کە وەک سیستەم سازانێکی دۆگما تەماشایان بکەین کە شەیدای پێشکەش کردنی ڕێگەچارە کلێشەییەکانن، بۆ ململانێ لەگەڵ کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوریەکاندا و شێتی «یۆتۆپیا خەیاڵیە پڕو پۆچ و دوور لە واقیعەکان بوون». لەهەموو ئەمانە گرنگتر ئەوەیە کە دەبێت خۆمان لە پێشکەشکردنی سادەکارانەی بیروڕاکانیان بەدوربگرین. ئەوان زۆرجار بۆ نفوزکردن لەناو جەماوەردا ناچاربوون تیورەکانی خۆیان گشتپەسەند بکەن و بۆ سەرنجڕاکێشانی خەڵکی، قسەکانی خۆیان وەک دروشم پێشکەش بکەن. بەڵام لە پشت ئەم دروشمانەوە، کۆمەڵێک بەڵگاندنی وردبینانە هەبوو. ڤۆلتێر لە دەوروبەری دەیەی ١٧٦٠دا خەباتێکی هێرشبەرانەی دژی زیانەکانی مەزهەب دەست پێکرد، کە پاشتر بوو بە دروشمی بەناوبانگی: «ئەم مایەی نەنگیە لەناوبەرن». لەهەمانکاتدا دەبێت خۆمان

لەو هەڵسەنگاندنە پەلەیە رزگاربکەین کە ڤۆڵتێر جەنگی دژی هەموو مەزهەبەکان راگەیاندبێت. ئەزمونی دەوڵەتە پۆلیسیەکان لە سەدەی بیستەمدا، تێگەیشتن لەم بابەتە سادەتر دەکات، کە بۆچی فەیلەسوفانی سەردەمی رۆشنگەری لە هەلومەرجێکی جیاوازدا، بەشێوەی جیاواز قسەیان دەکرد: هەندێکجار مەسەلەکانیان بەبێ پەردە دەهێنایە پێشێ و هەندێکجاریش بۆ تێپەڕاندنی دیواری بەرزی سانسۆر، ناچار بوون قسەکانی خۆیان بەشێوەیەکی ئاڵۆز و ئەفسانەییانە پێشکەشبکەن. هەمیشە نەیاندەتوانی بە ڕاشکاویو بێ پەردە قسە بکەن.

بەمشێوەیە کاتێک دەتوانین دوبارە ماهیەت و گرنگی سەردەمی رۆشنگەری هەڵسەنگێنین، کە خۆمان لە کۆتوبەندی ئەمجۆرە ئەفسانە و پێشداوەریانە رەگ داکوتاوانە، رزگاربکەین. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کارێکی وا ئاسان نیە. گی لە بەرهەمە درەوشاوە و گەورەکەی خۆیدا کە لە فەزای خۆشبینی دەیەی ١٩٦٠دا نوسی، سەردەمی رۆشنگەری وەک هەمەکیەک وێناکرد: «تەنها یەک بیرکردنەوەی رۆشنگەری بوونی هەبووە»، بەرهەمی کارێکی پێکەوەیی کە زوربەیان یەکتریان دەناسی، یان لانیکەم ئاشنای بەرهەمەکانی یەکدی بوون و نرخیان بۆ دادەنا. ئەوان لە وڵاتە گەورەکانی ئەوروپا یان لە بەشی ئینگلیزی زمانی ئەمەریکای باکورەوە دەهاتن. فەرەنسیەکانی وەک مۆنتسیکۆ، ڤۆڵتێر، دیدرۆ، تۆرگۆ و کۆندریسە، ئینگلیزیەکانی وەک هیوم و گیبون، رۆسۆ لە جنێف و کانت و هردەر لە ئەڵمانیا و بنجامینی ئەمریکیان لەناودا بوو. ئەمانە ناوکی ئەو رەوتانەیان پێکهێنا کە گی ناوی نابوون «خێزانێک» یان «گروپی بچووک» ی فەیلەسوفانی رۆشنگەری. قۆناغی پشکەوتنیان لەدەیەی ١٧٢٠وە تا پەیدابوونی کۆماری تازەی ئەمەریکا لە دەیەی ١٧٨٠دا، کاتی بەرەبەیانی شۆڕشی فەرەنسی بوو. کەسانێکی زۆرتریش هەبوون کە بەرهەمەکانیان کەمتازۆر خاوەن هەمان گرنگی و نفوز بوو: لامتریە، کۆندیاک، هلۆتیۆس، پێشەنگانی زانستی دەروونناسی، جرمی بنتام تاوانناسی ئیتاڵی کە نەیاری سەرسەختی سزای لەسێدارەدان بوو، ئادام سمیس کە ئابوری سیاسی کرد بە سیستەمێکی داڕێژراو. دواجار جفرسۆن و ئادامز و هامیڵتۆن کە دەستوری ئازادیەکان و مافەکانی ئەمەریکایان داڕشت و گەلێک کەسی دیش.

گی بڕوای وایە کە لەناو گروپی ئەم فەیلەسوفانەدا، وەک هەر گروپێکی دی جیاوازی بیروڕا هەبوو، لەگەڵ ئەمەشدا جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە هەموویان لەسەر چەند خاڵێکی سەرەکی تەبابوون. بۆ نمونە هەموویان بەئەرکی خۆیان دەزانی نادادپەروەری و کەموکوڕی رژێمی رابردوو (فەرەنسای پێش شۆڕشی ١٧٨٩) ئاشکرابکەن و رەخنەی بکەن و لەرێگەی زانین، پەروەردە و زانستەوە، مرۆڤ لە زنجیرەکانی نەزانی و گومڕاهی، خورافات، دۆگمە مەزهەبیەکان و چەنگاڵی بێ بەزەیی رۆحانیەت رزگاربکەن. هەموویان دەیانویست هیوای ئایندەیەکی باشتر لەدڵی خەڵکیدا بوروژێنن. گی بە دروستی ناوی نابوون «دوبارە بەرهەمهێنەرانی شەهامەت» و هەموشیان بۆ دەوڵەمەندکردنی ئاستی ژیان، یاسای دادپەروەرانەتر، حکومەتی میانڕەوتر، ئاسانگیری و لێکبوردنی مەزهەبی، ئازادی فکری، بەرێوەبردنی پسپۆرانەی کاروباری دەوڵەت و دواجار بەهەمان ئەندازە بۆ دەوڵەمەندبوونی خودهوشیاری تاکەکان، تێدەکۆشان. لێرە بەدواوە بەهۆی ئەو وێنە گشتی و هەمەکیەوە کە گی بۆ بیریارانی ئەم «حیزبی مرۆڤایەتیە» پێشکەشی دەکات، چیدی ناکرێت فەیلەسوفانی سەردەمی رۆشنگەری بە گروپێک رۆشنبیری خۆ دەرخەری ناگرنگ پیشانبدرێت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا نابێت وابزانرێت لێکۆڵینەوەکەی گی وەڵامی سەرجەم پرسیارەکانی تایبەت بە سەردەمی رۆشنگەری دابێتەوە. بۆ رونکردنەوەی ئەم مەسەلانە دەبێت لێکۆڵینەوەکەی گی وەک

خاڵی دەستپێکردنێک دابنێن، نەک وەک خاڵی کۆتایی. کێشەکانی تەفسیری تیورەکانی فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری، بە تاوتوێکردنێکی زیاتری ئەرشیفی بەڵگەکانی ئەم سەردەمە یان بە سەیرکردنیان لە ڕوانگەو دیدێکی تازەوە ئاشکرا دەبێت. کێشەگەلێک کە یەک ڕێگەچارەسەریان بۆ نادۆزرێتەوە کە هەموو لێکۆڵەرەوان لەسەری کۆک بن. یەکێک لەم کێشانە مەسەلەی پەیوەندی نێوان بیریارانی ئەم سەردەمە و جەماوەرە. ئەوەی کە گی زۆرترین بەشی لێکۆڵینەوەکەی بۆ «پیاوانی گەورەی» سەردەمی ڕۆشنگەری تەرخانکردووە، بۆتە هۆی بەهێزبوونی ناوبانگ-لە دیدی هەندێکەوە «بەدناوی»- سەرتاپاگیری کەسانی وەک ڤۆڵتێر و ڕۆسۆ (کۆنخوازەکان هەمیشە ئەم فەیلەسوفانە مەحکومدەکەن، وەک ئەوەی ئەوان تەنها بەهێزی خۆیان شۆڕشی فەڕەنسیان بردبێتە پێشەوە). هەڵوێست وەرگرتنی گی ئەو ئەگەرەی بۆ دەڕەخسێنێت کە بچێتە ناو دەروونی بوونی ئەم بیریارانەوە و دەریبخات کە ئەوان مرۆڤگەلێکی ئاڵۆز بوون- نەک ناوێک لەسەر بەرگی کتێبێک- کە بیروڕاکانی خۆیان لە مەحەکی ئەزموندابوو، لەکاتی پێویستیشدا ئەم بیروڕایانەیان دەگۆڕی.

لەهەمانکاتدا لە لێکۆڵینەوە زانستیەکانی ئەم دواییانەدا، زەمینەو ژێرخانی چاندنی بیرەکانی ڕۆشنگەری، زیاتر لە کەسایەتیەکانی ئەم سەردەمە جێی تێبینیکردن بووە. چ جۆرە چالاکیە فکریەکان و چ جۆرە ریزبەندیەکی نێوان نوسەران و خوێنەران ئەگەری دەروشانەوەی بیریارانێکی وا مەزنیان ڕەخساند؟ چ هەلومەرجێک یارمەتی دان بۆئەوەی تێزەکانی خۆیان لەناو ژمارەیەکی زۆرتری خەڵکیدا بڵاوبکەنەوە؟چ کەسانێک پاش کۆچی دوایی ئەم فەیلەسوفانە، درێژەیان بە ڕێگەکانیان دا؟ ئایا دەکرێت باسی شتێکی وەک «ڕۆشنگەری چینەکانی سەرەوە» و ڕۆشنگەری چینەکانی خوارەوە» بکرێت؟ ئایا لەپاڵ چیرۆکی دەستەبژێرەکاندا بۆ ڕۆشنگەری، تێڕوانینێکی گشتپەسەندیش بۆ ڕۆشنگەری هەبووە؟. هەڵسەنگاندنی ئێمە بۆ ڕادەی نفوز و کاریگەری فەیلەسوفانی سەردەمی ڕۆشنگەری، بە ئاشکرا پەیوەندی بەوەوە هەیە کە لەبنەڕەتدا ڕۆشنگەری بە بزوتنەوەی دەستبژێرەکان بزانین، کە لە لوتکەکەیدا ژمارەیەکی کەمی ڕۆشنبیرانی بەناوبانگ هەن، یان بە پێچەوانەوە وەک کۆمەڵێک تیورەی جیاواز تەماشایان بکەین کە لە پانتاییەکی بەربڵاودا بڵاوبووبونەوە. چەند رابەرایەتی بزوتنەوەی ڕۆشنگەری بچوکتر لەبەرچاوبگرین، قبوڵکردنی ئەو خاڵەی کە ڕۆشنگەری لەسەرەتادا شۆڕشێکی فکری ڕادیکاڵ بوو کە بەهۆی ئامرازی تازەی فکر و ڕەخنەوە، کەوتنە ململانێ لەگەڵ نەریتپەرستی شاراوە لەپشت سەردەم و سەدەکانەوە، لۆژیکی تر دێتە بەرچاو. لەناو ئەم ئامرازە تازانەی فکر و ڕەخنەدا دەکرێ ناوی باوەڕهێنان بە یەکێتی بوون(PANTHEISM)، دەئیسم، بێ خودایی (ATHEISM)، کۆماریخوازی، دیموکراسی و ماتریالیزم ببرێت. هاواری گەورەی مردن بۆ بۆرژوازی ڤۆڵتێر، کە پایەکانی کەنیسە و دەوڵەتی هێنایە لەرزین، هەنوکەش بەرگوێ دەکەوێت.

بەڵام تەفسیرێکی دیش بۆ سەردەمی ڕۆشنگەری هەیە، تەفسیرێک کە سەرنجی خۆی کەمتر بۆ ئەم گروپە بچوکە خەباتگێڕە و زۆرتر بۆ ئەو گروپە ڕوو لەزیادەی پیاوان و ژنانی دانا و قسەزانانە دەچێت کە لە سەرتاسەری ئەوروپادا بڵاوبووبونەوە. کەسانێک کە دانیال ڕۆشە بە خەڵکی خوێندەوار و خاوەن کلتوریان دەزانێت. ئەمانە بەگشتی کەسانێکی خوێندەوار بوون کە بە تیورە پێشکەوتنخواز و شێوازی ژیانی خۆیانەوە دەنازین، ئاراستەیەک کە خۆی بە ئاشناییەکی کەمتازۆر ڕوکەشیانەی بیروڕاکانی ڤۆڵتێر و هاوبیرانیەوە ڕازاندبۆوە، بەڵام بەگشتی بەشێک بوو لە شێوازێکی بەڕاستی تازەی ژیان.

بەپێی ئەم تێڕوانینە دەبێت بزوتنەوەی ڕۆشنگەری بە ڕەوتێکی گۆڕانکاری بنەڕەتی لەناو ڕژێمی پێشودا دابنێین، نەک وەک چالاکی گروپێکی تیرۆریستی کە ئامانجیان ڕوخانی ڕژێم بوو. لەم حاڵەتەدا

ئایا رۆشنگەری بزوتنەوەیەکی پێشڕەوی روشنبیری بوو؟ ئایا دەبێت وەک وشەیەکی نوێ کە لە ناوەندە رۆشنبیریەکانی سەدەی هەژدەدا باوی هەبوو، لەبەرچاو بگرین؟ بەهەر شێوەیەک بێت ئایا رۆشنگەری بەڕاستی بووە هۆی گۆڕانی ئەو کۆمەڵگایەی کە رەخنەی دەکرد یان نا؟ یان ئەوەی کە خودی رۆشنگەری بەهۆی کۆمەڵگاوە گۆڕانی بەسەردا هات و راکێشرا بۆی؟.

زۆرێک لە مەسەلەکانی تری تەفسیرکردنی رۆشنگەری پەیوەندیان بەوەوە هەیە کە وەک «ئاراستەیەکی خەبات» (MILITANT TENDENCY) تەماشای بکەین کە چالاکی دژی هەلومەرجێکی ناحەزانە دەکات (بەزمانێکی تەنزئامێز وەک هەمان چالاکی گروپە مەسیحیەکانی سەرەتا کە گیبۆن وەسفی کردوون)، یان بە ئایدۆلۆژیەک یان «زهنیەتێکی» (MENTALITY) سەرتاپاگیری بزانین؟ سەرەتا دەبێت ئەم مەسەلەیە بهێنینە پێشێ کە رۆشنگەری دەیتوانی چ کاریگەریەکی فعلی لە دروستکردنی گۆڕانکاریدا هەبێت. وەک گی بەدروستی جەختیکردووە، فەیلەسوفانی رۆشنگەری بە سوکایەتیەوە تەماشای ئەو خەیاڵانەیان دەکرد کە لە ئاسمانەکاندا دێن و دەچن. ئەوان پەیڕەوی شێوازێک بوون کە مارکسیەکان دواتر ناویان نا پراکسیس(PRAXSIS). کاتێک دیدرۆ لەسەر داخوازی کاترینی گەورە سەردانی روسیای کرد، بە دورودرێژی بۆ شاژنی رونکردەوە کە روسیا بەر لەهەر شتێکی تر پێویستی بە مامۆستای کار و پیشەساز هەیە . ڤۆڵتێر چیرۆکی ئەخلاقی و فەلسەفی کاندیدی (١٧٥٩) بەم رستەیەی پاڵەوانەکەی کۆتایی پێدێنێ کە «دەبێت کێڵگەکانی خۆمان بڕوێنین-بەدەربڕینێکی دی- هەوڵبدەین کارەکان ئەنجام بدرێن».

بەڵام گەر فەیلەسوفانی رۆشنگەری (وەک گی دەڵێت) گروپێکی بچووک بوون کە سەرمایە و ناوبانگی خۆیان وەک نوسەر بەدەستهێنابوو، نەک وەک دەوڵەتکار و سیاسەتمەدار، ئەوا لەم حاڵەتەدا ئایا دەکرێت چاوەڕێی ئەوە بکرێت ئەوان دەبێت وەک ناپۆلیۆن لە شانۆیی مێژوودا ئامادەبن و بە بەکارهێنانی دەسەڵات ئاراستەی رەوتی ژیانی مرۆڤ بگۆڕن؟ ئەم خاڵە جێی تێبینیە کە ئیدوارد گیبۆن چەندان ساڵی دورودرێژ ئەندامی ئەنجومەنی گشتی بوو، بەڵام بۆ یەکجاریش لە پەرلەماندا قسەی نەکرد.

بێگومان بەردەوام زنجیری کاریگەری ئاراستە فکریەکان لەسەر کردار، زنجیرێکی ئاڵۆسکاو و ئاڵۆز بووە. لێرەوە رەنگە ئەو راستیەی کە ڤۆڵتێر هەرگیز پلەیەکی دەوڵەتی نەبووە، گرنگ نەبێت، چونکە دەبێت ئەوەمان لەبیر بێت کە ڤۆڵتێر ساڵانێکی دورودرێژ هاوکاری لەگەڵ «شای ستەمکاری رۆشنگەر» فردریکی دوهەمی شای پرۆسدا هەبوو. گەرچی پێدەچێت پاشا زۆرتر لەوەی تێبینی تێڕوانینەکانی ڤۆلتێر بکات، چاوەڕێی ئەوەی دەکرد ڤۆڵتێری فەیلەسوف بیروڕاکانی ئەو قبوڵبکات. بێگومان فردریکی دوهەم کە بیروڕا نامەزهەبیەکانی خۆی بەئاشکراو بەبێ پەردە ئاشکرا دەکرد، بیروڕای پێشکەوتوخوازانەی هەبوو و دەزگای بەڕێوەبردنی پاشایەتی خۆی مۆدێرن کردەوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پرۆسی سەردەمی فردریکی دوهەم، سەرەڕای روکەشی هیومانیزمی عەقڵانیانەی خودی خۆی، دەوڵەتێکی سەربازی و جەنگخواز بوو کە ماف و ئازادیە سیاسیەکانی هاوڵاتیانی پێشێل دەکرد. لەراستیدا دەوڵەتی پرۆس نەک بەدیهێنانی ئامانجە واقعیەکانی «حیزبی مرۆڤ باوەڕ»(PARTY OF HUMANITY)، بەڵکو لادانێک بوو لێیان.

ئەوەی لێرەدا گرنگە لە سەرو کاریگەری کەسایەتیەکان، یان مەسەلەی نیەت و باوەڕی باش و خراپیانەوە (ئایا فەرمانڕەوایانی ستەمکارە رۆشنگەرەکان سودیان لە فەیلەسوفانی رۆشنگەری سادە ئەندێش وەرنەگرتووە؟)، مەسەلەی گرنگ تاوتوێکردنی ئەم مەسەلەیە کە بیروڕاکانی رۆشنگەری چ

بەکارهێنان و ئامانجێکیان هەبوو.

فەیلەسوفانی رۆشنگەری بڕوایان وابوو عەقڵی رەخنەگرانە توانای رزگاری بەخشینی خۆی دەسەلمێنێت. ئەوان دەیانگوت عەقڵ و زانست، مرۆڤایەتی خۆشبەختر و مرۆڤانەتر دەکات. بەڵام هەندێک لێکۆڵەرەوانی ئەم دواییانە بڕویان وایە رێک پێچەوانەی ئەمە رویداوە. کاتێک فەرمانڕەوایان و دەوڵەتداران پێشوازیان لە سەرکەوتویی «عەقڵ» دەکرد، لەبەرئەوە بوو کە دەسەڵاتی خۆیان زیاد بکەن و بایەخیشیان (AUTHORITY) پتەوتر بکەن، دەرئەنجامی ئەم رەوتەش زۆرجار بەزیانی بێدەرەتان و مرۆڤە لاوازەکانی کۆمەڵگا تەواو بووە، کە توانای قسەی خۆیان بەگوێی دەسەڵاتداران بگەیەنن. هەندێک لە فەیلەسوفانی رۆشنگەری وەک کویزنی و میرابۆ (ئابوریزانانێک کە بە فیزۆکرات (PHYSIOCRAT بەناوبانگ بوون) بڕوایان وابوو بازرگانی ئازاد، خوشگوزەرانی کۆمەڵایەتی زیاددەکات. بەڵام کاتێک پاش هەوراز و نشێوەکانی یاسای بازرگانی ئازادی دانەوێڵە لە فەرەنسا جێبەجێکرا، بازرگانەکان سودیان لێبینی و جوتیارانیش زیانیان لێکرد. هەندێک لە لێکۆڵەرەوانیش بڕوایان وایە وێرانکردنی پایەکانی مەزهەب کە فەیلەسوفانی رۆشنگەری هانیان دەدا، بەهەمان شێوە بووە هۆی نەهیلزمێکی ئەخلاقی و حکومەتی تیرۆر و توندوتیژی شۆڕشگێرانە لە فەرەنسا.

تیۆدۆرۆ ئادرنۆ و ماکس هۆرکهایمەر لە دیالەکتیکی رۆشنگەریدا دەڵێن: ئەوە رێکەوت نیە کە «عەقڵ» و «دیسپۆتیزم» زوربەی جار دەست لەناو دەستی یەک بەرەو پێشەوە چوون، چونکە زانست و عەقڵ راگەیەنەری ئازادی نین، بەڵکو بە قبوڵکردنی جیاوازی «رەها» لەنێوان ڕاست و ناڕاست، هەقیقەت و درۆدا، لەبری قبوڵکردنی هەمەڕەنگی چەندلایەنەی بەهاکان، هانی جۆرێک زهنیەتی رەهاگەرانە دەدەن. میشل فۆکۆ فەیلەسوف و بیریاری فەرەنسی، لەهەمان ئاراستەدا بەڵگە دێنێتەوە کە بنەماکانی رۆشنگەری دەست لەناو دەستی سیاسەتی ستەمکارانە و لەژێر ئاڵای دەوڵەتی عەقڵگەردا، هاوکاری بەهێزبوونی سیاسەتی کۆمەڵایەتی ستەمکارانە و نامرۆڤانەیان کرد. بۆ نمونە سەرجەم ئەو گروپانەی بە شتێکی نارێکی کۆمەڵایەتی دەزانران — پیرەکان، نەخوشەکان، سواڵکەران و شێتەکان- لە شەقامەکان کۆکرانەوە و وەک کۆمەڵێک زبڵی دژ بە عەقڵ لەیەک خانەدا کۆکرانەوە و لە دەزگای جیاوازدا دیلکران. ئەوەی لێرەدا وەک کرداری «رۆشنگەرانە» دەردەکەوێت، لەڕاستیدا هەنگاوێکی سەرکوتکەرانە بوو. لێرەوە نابێت بێ هیچ رەخنەیەک ستایشی هەوڵی بیریارانی سەردەمی رۆشنگەری لە هێنانە ئارا و چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکاندا بکەین. بەڵکو دەبێت دەرئەنجامە عەمەلیەکانی سیاسەتەکانیشیان هەڵسەنگێنین. مەحکوم کردن، سواڵکردن و سوکایەتیکردن کە بەرەو روی ئەو کەسە دەبێتەوە کە پێویستی بە یارمەتی خێرخوازانە هەیە، شتێکە و دۆزینەوەی رێگە چارەیەکی کاریگەر بۆ ئەو مەسەلانەی دەبنە هۆی فەقیری شتێکی ترە.

ئەوە بەڵگەنەویستە کە ژان ژاک رۆسۆ بڕوای وابوو زوربەی ئەو شتانەی فەیلەسوفانی تری رۆشنگەری لەژێر ناونیشانی عەقڵباوەڕی، شارستانێتی و پێشکەوتندا نرخی بۆ دادەنێن، لەڕاستیدا تەنها دەبێتە هۆی ئەوەی ئازادی و پاکێتی سروشتی و خوشبەختی مرۆڤ سنوردارتر بێت. رۆسۆ دژی بێباوەڕی ڤۆڵتێر و ماتریالیزمی هولباخ بوو، چونکە هەردوو ئەم شتەی بە کورتکردنەوە دەزانی. لەگەڵ هەمو ئەمانەشدا رۆسۆ بە یەکێک لە سیما درەوشاوە و بەرجەستەکانی رۆشنگەری دەژمێرێت. ئەمەش هەڵسەنگاندنێکی دروستە، چونکە هیچکەس هێندەی ئەو رقی لە رژێمی رابردوو (ANCIENT REGIME) نەبوو. ئایا هەر ئەم نمونەیە دەریناخات کە بەکارهێنانی خودی لەزگەی «رۆشنگەری» بۆ لەشکرێکی لێکنەچوو و جیاوازی ریفۆرمیستە کۆمەڵایەتیەکان، زۆرتر گومڕاکەرە تا رونکەرەوە؟.

ئەم کێشەیە بەشێوەیەکی واقعی هەیە، بەڵام تەنها تایبەت نیە بە رۆشنگەری. بێ ئەمجۆرە لەزگانە، بنەمای هەمەکی بەخشین (GENERALISATION) نامومکین دەبێت. لە هەندێک بارودۆخدا بەکارهێنانی ئەمجۆرە لەزگە ناوەختانە (ANACHRONISTIC) لەکرداردا پێویستە – هاوچەرخانی هەر سەردەمێک لەزگەکانی وەک ریفۆرمخواز، رادیکال، کۆنەپەرست و لەم بابەتانە لەخۆیان نانێن. لەهەمانکاتدا دەبێت ئەوەمان لەبەرچاو بێت کە سیما بەرجەستەکانی ئەوەی بەسەردەمی رۆشنگەری ناوی دەبەین، بەهەرشێوەیەک بێت خۆیان بە رۆشنگەر و هەڵگرانی هوشیاری و روناکی بۆ کەسانێک دەزانی کە گرفتاری نەزانی بوون.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەبارەی بزوتنەوەیەکەوە کە ناوی دەنێن رۆشنگەری، کێشەیەکی تایبەت هەیە، ئەم کێشەیەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە رۆشنگەری بەپێچەوانەی هەندێک رەوتی دیاریکراوی مێژوویی‌یەوە وەک حیزبە سیاسی یان گروپە مەزهەبیەکان، خاوەن دەستورێکی فەرمی، بەرنامە یان رێکخستنێکی حیزبی نەبوو. رۆشنگەری خۆشی بە «..ناسی» یا «ئیزم»ێکی دیاریکراوەوە سنوردار نەدەکرد. بۆ نمونە گروپی ناسراو بە «نەیاران» (DISSENTERS) نەیاری کەنیسەی ئینگلتەرا بوون، و «چارتیستەکان» (CHARTISTS)یش پشتگیری بلاوکراوەی خەڵکیان دەکرد. بەڵام بزوتنەوەی رۆشنگەری هیچ بلاوکراوەیەکی هاوبەشی نەبوو، هیچ پرۆگرامێکیشی بۆ «حیزبی مرۆڤایەتی» دانەڕشتبوو. لێرەوە بیروڕاکانی رۆشنگەری بەشێوەیەکی ناچارانە بێ شکڵ (AMORPHOUS) و هەمەجۆر بوون.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا قووڵکردنی ئەم تێگەیشتنە بەو مانایە نیە کە واز لە باسکردنی دیاردەیەک بەناوی رۆشنگەریەوە بهێنین، بەڵکو لەڕاستیدا دەبێت هەمەرەنگی و هەمەجۆری ئەم بزوتنەوەیە لەبەرچاو بگرین. وەک پێشتر ئاماژەم بۆ کرد، پتر گی بڕوایوایە «تەنها یەک رۆشنگەری» بوونی هەیە، لەکاتێکدا کە «هێنری می» بەشێوەیەکی قانع پێکەر باسی چوار شێوەی جیاوازی رۆشنگەری لە ئەمەریکای باکوردا دەکات. ئەگەر شێوەی بیرکردنەوەی «هێنری می» بە خاڵی دەستپێکردنی خۆمان دابنێین، دەتوانین پێویستیەکەی سەرەوە بە فەزیلەت دابنێن و بانگەشەی ئەوە بکەین کە فرەیی بیرکردنەوەکانی رۆشنگەری و نەبوونی بیروڕا بەڵگەنەویستەکان تیایدا، یەکێک بووە لە خەسڵەتە بەنرخ و بێوێنەکانی رادیکالیزمی فکری لەسەدەی هەژدەهەمدا. ئەم توانا تایبەتیەی رۆشنگەری –یان رەنگە لاوازیە چارەنوسسازەی- لەبەرامبەر رێکخستنە هاوئاهەنگەکانی وەک رێکخراوەکانی یەسوعیەکان (GESUITS) ئاشکرا دەبێت.

بەڵام نابێت ئەو هەقیقەتە فەرامۆشبکەین کە لەگەڵ ئەوەدا رۆشنگەری بەها بۆ «گەردونیبوون» دادەنێت، بەڵام شێوەی دەربڕین، گرنگیپێدانەکان و هەڵویستەکانیشی لەم ناوچەیەوە بۆ ئەو ناوچە و لەم وڵاتەوە بۆ ئەو وڵات جیاواز بوو.... ئایا ئەم ئەنجامگیریە کە رۆشنگەری سەرەڕای بانگەشەکانی دۆستان و دوژمنانی، هۆکاری رودانی شۆڕشی فەڕەنسی نەبووە، بە ئەندازەی ئەو حوکمە کە حیزبی کۆمنیست لە دروستکردنی شۆڕشی کۆمنستی لە هەندێک وڵاتدا سەرکەوتوو نەبووە، بڕاوەیە؟ ئەو ئەگەرەش هەیە کە رۆشنگەری هەرگیز ئەمجۆرە ئامانجە دیاریکراوانەی بۆ خۆی دانەناوە.

لێرەوە لەکاتی هەوڵدان بۆ هەڵسەنگاندنی کۆتایی دەستکەوتەکانی رۆشنگەری، هەڵەیە گەر چاوەڕێی ئەوە بکەین لەم سەردەمەدا خەڵکانێکی دیاریکراو بدۆزینەوە، کە هەنگاوی دیاریکراویان نابێت کە «پێشکەوتن»ێکی دیاریکراوی بەدوادا هاتبێت، بەڵکو لەبری چاوەڕوانیەکی وا، دەبێت گۆڕانی عاداتی فکری، نمونە سۆزداریەکان و شێوازەکانی رەفتار، (ئەگەر نا لای هەموو خەڵک) لانیکەم لەنێوان گروپە

کاریگەرە کۆمەڵایەتیەکاندا تاوتوێبکەین. لەحاڵەتێکدا رۆشنگەری بە بزوتنەوەیەک بزانین بۆ کردنەوەی چاوی خەڵک، گۆڕانی شێوەی بیرکردنەوە و هاندانیان بۆ بیرکردنەوە، ئەوا دەستمان بە هەڵسەنگاندنێکی تری ئەم بزوتنەوەیە دەگات.

لەڕاستیدا بۆ هەڵسەنگاندنی رۆشنگەری دەبێت سەرنج لەو خاڵە بدەین کە رۆشنگەری بەوردی قۆناغێکی مێژوویی ئەوروپایە، کە رۆشنبیرانی نامەزهەبی بە سودوەرگرتن لە زیادبونی خوێندەواری، چونە سەرەوەی ئاستی خۆشگوزەرانی و ژیانی خەڵکی و بڵاوبونەوە و پەرەسەندنی چاپەمەنی، توانیان وەک هێزێکی کەمتازۆر سەربەخۆیی کۆمەڵایەتی دەرکەون. لێرە بەدواوە خوێندکاران بەناچار خزمەتکارانی دەربار یان قسەکەرانی کەنیسە نەبوون. رەنگە وەک چۆن «جاناتان سۆیفتی» نوسەری بەرجەستەی سەدەی هەژدەهەم دەڵێت، قەڵەم دواجار ناتوانێت لە شمشێر دەسەڵاتدارتر بێت. لەگەڵ ئەمانەشدا سەردەمی رۆشنگەری سەلماندی کە قەڵەم چەکێکی بەهێزە. ئەوانەی قەڵەمیان کردە چەکی خۆیان، قسەکەرانی فەرمانڕەوا ستەمکارەکان نەبوون، بەڵکو رۆشنبیرانی یاسا شکێن و یاخیبوانێک بوون کە بێ سەرەوەری فیکری (INTELLECTUAL ANARCHY) زامنی «کۆمەڵگا ئازادە»کانیان کرد.

### ٢- ئامانجی رۆشنگەری، ناسینی زانستی مرۆڤ:

هەوڵی سەرەکی بیریارانی سەردەمی رۆشنگەری بۆ دەستگەیشتن بە «مرۆڤناسی زانستی» بوو. بیریارانی جیاواز لەبارەی ئەوەی ئەم ناسینە دەبێت چ شتێک لەخۆی بگرێت، بیروبۆچونی جیاوازیان هەبوو. لامتریە و ماتریالیزمەکانی دی (کەسانێک کە بوونی سەربەخۆی «زیهن»، «دەرون» و «رۆح»یان رەتدەکردەوە) ئومێدواربوون بتوانن فیزیۆلۆژیای زانستی-پزیشکی مرۆڤ بەجۆرێک فراوان بکەن کە بتوانن مرۆڤ وەک مەکینەیەکی ئاڵۆز و ورد، یان رەنگە تەنها وەک سەرکەوتوترین شیردەر (PRIMATE) پێناس بکەن. هەندێک وەک هلۆتیوس بڕوایان وابوو دەبێ بەر لەهەر شتێک میکانیزمی رەوتی فیکری مرۆڤ، بکەوێتە ژێر لێکۆڵینەوەوە. کەسانی دی وەک ڤیکۆی ئیتاڵی بڕوایان وابوو باشترین شێوەی ناسینی مرۆڤ ئەوەیە بگەڕێنەوە بۆ قۆناغەکانی پێشکەوتنی مرۆڤ لە سەردەمی پەیدابوونی لە هەلومەرجی سەرەتایی یان دۆخی سروشتیدا (قۆناغێک کە هەندێک بە سەردەمی ئاڵتونی و هەندێکی دی بە سەردەمی بەربەریەتی دەزانن). هەندێکی دیش بڕوایان وابوو شیکردنەوەی یاسا سیاسی و ئابوریەکانی باڵادەست بەسەر کاردانەوەی دولایەنەی نێوان تاک و هەموو کۆمەڵگادا، دەستگەیشتن بە مرۆڤناسی زانستی مومکین دەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا بیریارانی جیاواز بۆ ناسینی مرۆڤ، جەخت لەسەر خاڵی جیاواز دەکەن، بەڵام زوربەیان وەک ئەلکساندەر پۆپ دەڵێت، لەو خاڵەدا کۆک بوون کە »شێوەی دروستی لێکۆڵینەوە مرۆڤایەتی، لێکۆڵینەوەی خودی مرۆڤە«. زۆرێک لە بیریارانی سەردەمی رۆشنگەری لەگەڵ ئەم بانگەشەیەی دێڤید هیومی فەیلەسوفی سکۆتلەندیدا هاودەنگ بوون کە خۆی بە «نیوتنی زانستە ئەخلاقیەکان» (یان بە زمانی ئەمڕۆ زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتیەکان) دەزانی. تێگەیشتن لەو خاڵەی بۆچی ناسینی هەوڵدان بۆ دەستگەیشتن بە ناسینی زانستی مرۆڤ، ئەوەندە سەرنج راکێشەر و لەهەمانکاتدا ئاڵۆز و دولایەنە بوو، ئێمە بەرەو جەرگەی روداوە فیکریەکانی سەردەمی رۆشنگەری دەبات. لەکاتی بڵاوبونەوەی بەرهەمی کلاسیکی یاکوب بۆرکهارتەوە «شارستانێتی رێنسانس لە ئیتاڵیادا» لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا، ئەم گریمانەیە بە شتێکی بەڵگەنەویست دادەنرا کە شانازی دۆزێنەوەی «مرۆڤ» (بەجیاواز لە رێبازی مەسیحی) بەتایبەتی دۆزینەوەی تیورەی تاکخوازی (INDIVIDUALITY) مرۆڤ، پشکی

ئیتاڵیای مۆدێرن بووە. ڕاستیەک لەم قسەیەدا هەیە، بەڵام هیومانیزمی سەردەمی ڕێنسانس بە هیمەتی ڕۆحە بێباکەکانی وەک مۆنتان لە فەرەنسای سەدەی شانزەهەمدا، کە پرسیاری گۆمانکارانەی «چی دەزانم»ی دەهێنایە ئاراوە، توانی بە دەرونگەری (INTROSPECTION) وردبینانەی هەلومەرجی بوونی مرۆڤ کۆتای بێت. هاملێتی شکسپیر لەو بیرەدا قوڵدەبێتەوە کە «چۆن مەخلوقێکە، مرۆڤ».

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو «مرۆڤ»ەی ڕێنسانسیشی دۆزیەوە، بەگشتی سیمایەکی نەریتی هەبوو، ئەو هێشتا ئەو بونەوەرە کامڵە و بێ کەموکوڕە بوو کە خودای مەسیحیەت لەسەرەتای جیهاندا (بەرلە کەوتنە خوارەوە) بەپێی نمونەی خۆی دروستی کردبوو. بەمشێوەیە فەلسەفەی مرۆڤباوەڕانەی ڕێنسانس بەهەمان ئەندازەی لۆسەریزم یان هەر ئاراستەیەکی تری مەسیحیەت، بڕوای بە مەسیحیەت هەبوو. مرۆڤی ڕێنسانس کە بەهۆی هونەرمەندانی وێنەکێشەوە بەشێوەیەکی پڕ شکۆ «وەک مرۆڤێکی لەش ڕێکوپێک، جوان و رووت» یان مرۆڤی ڤیترویایی (VITRUVIAN MAN) بەپێی یاسا ئەندازەییەکان وێنە دەکرا، هێشتا دەکرا وەک جیهانێکی بچوک کە هاوشێوەی جیهانی گەورەیە دابنرێت (جیهانی بچوکی مرۆڤ وەک ڕەمزێک بۆ جیهانی گەورەی گەردون). لەراستیدا سەرجەم بیریارانی سەدەی حەڤدەهەم جگە لە کۆپرنیکۆس، هێشتا بڕوایانوابوو کە مرۆڤ ناوەندی بوون (HOMOCENTRIC) و زەویش ناوەندی جیهانە (GEOCENTRIC). ئەو باوەڕەی مرۆڤ نمونەی ڕێکخستنی جیهانێکە کە خودا دروستیکردووە، سەرەتا بەهۆی زانایانی یۆنانی دێرینەوە هێنرایە ئاراوە. لێرەوە زوربەی بیریارانی سەردەمی ڕێنسانس بەشێوەیەکی بڕاوە مێژووی مرۆڤیان لەڕێگەی شەجەرەیەکی بێ دابڕانەوە تا نوح و دواجار تا ئادەم دەگەیاند. بەمشێوەیە مرۆڤ جێگەی نەگۆڕی خۆی کە بەهۆی ویستی خوداوەندەوە دیاریکرابوو، لە شوێن و زەمەندا هەروا پاراست.

لەڕاستیدا کاتێک بیریارانی ڕێنسانس ستایشی هەموو شتێکی یۆنانی و ڕۆمیان دەکرد، ئەو باوەڕدارانەی کەنیسەی ئەنجیلیان بریندار کرد کە بەردەوام ئامۆژگاریان دەکرد کە مەسیح بۆ بەخشینی گوناهەکانی مرۆڤ و بۆ ڕزگارکردنی لە کفر و گومڕاهی کوژراوە. بەڵام کاریگەری بەربڵاوی «ئەنتیکۆمانیا»ی (ANTICOMANIA) ڕێنسانس دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی بیریارانی ئەم سەردەمە توانیان دیدێکی بەهێز و هاوئاهەنگ بۆ سروشت و چارەنوسی مرۆڤ بەهێز بکەن. فەیلەسوفانی ئەخلاق لە سەردەمی ڕێنسانسدا بڕوایانوابوو نمونەگەلێکی فەزیلەت و مەعنەویەت هەیە کە دەکرێت لای شاعیرانی کلاسیک، فەیلەسوفان، ئەخلاقباوەڕان، مێژوونوسان و دەوڵەتداران و بەر لە هەمووشیان لای سنکا، سیسرۆ، لیویوس بدۆزرێتەوە. بەپێی بڕوای ئەم بیریارانە مرۆڤی بەڕاستی لێهاتوو دەتوانێت پەیڕەوی لەم نمونە مەعنەویانە بکات بەبێ هیچ ناکۆکیەک لەگەڵ ڕێبازی مەعنەویەتی ڕزگاری لە مەسیحیەت و لە هاوئاهەنگی کامڵ لەگەڵ ئەودا.

بەمشێوەیە بەپێی تێگەیشتنی بیریارانی ڕێنسانس هێوا و چارەنوسەکانی مرۆڤ لەسەر دوو پایەی جیاواز و لەهەمانکاتدا تەواوکەری یەک دامەزراوە. ڕێنسانس سەرلەنوێ زانینی کلاسیکی بڵاوکردەوە و لەم ڕێگەیەشەوە شێوازەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەم جیهانەی دۆزیەوە. بەڵام لەهەمانکاتدا هەر ئەم دروشمە ڕەسەنانەی کلاسیکی لەگەڵ هەقیقەتی زوڵاڵی مەسیحیەت بەو شێوەیەی لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە و کەنیسا مۆری سەلماندنی لێداون تێکئاڵان. بڕواکردن بەم ئامانجە دولایەنیانە، واتە یەکێتی لەنێوان مرۆڤی باش و مەسیحی باشدا، بەر لەسەدەیەک لە ناوەندە فیکری و فەلسەفیەکانی ئەوروپادا باو بوو.

بەڵام ئەم دوو ئامانجە هێواش هێواش لەیەک جیابونەوە. یەکێک لە هۆکانی ئەم حاڵەتە، جیاوازی

رەق و توندوتیژی مەزهەبی و ململانێی زنجیرە سەڵتەنەتیە جیاوازەکان بوو، کە ئەوروپای لە سەرەتای بزوتنەوەی ریفۆرمی دینیەوە تا دەوروبەری شەڕی سی ساڵە هێنایە لەرزین. دەرئەنجامی ناچاریانەی ئەم روداوانە لە رزاندنی ئەو باوەڕە خۆشبینانەیەی رێنسانس بوو بەوەی کە مرۆڤ بونەوەرێکی پاک و رەسەنە کە چارەنوسی واقعیەت بەخشینە بە بوونی خۆی لەرێگەی بەشداریکردن لەژیانی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگایەکی ئازاددا. لە هەلومەرجێکی وادا بوو کە تیورەی سەینیکەڵ (CYNICAL) و بەدبینانەی مەکیاڤیلی لەبارەی مرۆڤەوە نفوزی خۆی ئاشکراکرد. هۆیەکی دی وەک پیتر بۆرک بەدروستی جەختی لێدەکاتەوە ئەوەیە کە لەگەڵ گەشەکردنی بەردەوامی هوشیاری مێژوویدا، تێگەیشتن و تێڕوانینێکی تازە بۆ رابردوو دروستبوو. ئەم دیدە تازەیە دواجار پەردەی لەسەر جیاوازی بەرچاوی نێوان «دنیای کۆن»ی یۆنان و رۆمی دێرین و «دنیای تازە بەدەسەڵاتی دەوڵەتی و دیبلۆماسیەکەیەوە و بە تفەنگ و دەزگای چاپییەوە، هەڵداوەتەوە. جگە لەمەش «دنیاکانی تر» بەتایبەتی ئەمەریکا دەدۆزرانەوە کە بۆ یۆنانی و رۆمیە دێرینەکان نەناسراو بوو. دۆزینەوەی ئەم ناوچانە بە دیمەنە نامۆ و خەڵکە «کافر و درندەکەیەوە»، ئەو باوەڕە خۆپەسەندانەی رۆشنبیرانی رێنسانسی لەرزاندا کە پێیوابوو فلۆرانس، ئەسینای تازە و ئیمپراتۆری پیرۆزی رۆم میراتگری خودی رۆمە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو گۆڕانانەی لە ئاستی باوەڕ و بیردا بەدرێژای سەدەی حەڤدەهەم رویاندا، چەندان جار خێراتر و بزوێنەرتر بوون لە گۆڕانە فیکریەکان لە سەدەی شانزەهەمدا. «زانستە درەوشاوە تازەکان» ئەستێرەناسی، گەردونناسی و فیزیا، کە پێشرەوەکانی زانایانی وەک کپلەر، گالیلۆ، دیکارت و پەیڕەوانیان بوون، ئەو هاوئاهەنگیەی پێشوی جیهانی مرۆڤ سەنتریان تێکشکاند، کە جیهانێکی داخراو و بچوک بوو کە ناوەندی جێی تێبینی خودی مرۆڤ بوو. هەم زانستەکانی یۆنانی دێرین و هەم ئەنجیل ئەم باوەڕە کۆنەیان دەسەلماند. ئەستێرەناسی کۆپرنیکۆسی کە بەهۆی زنجیرەیەک زانای بەرجەستەوە لە کۆپرنیکۆسەوە بگرە تا نیوتن لە سەدەی هەژدەهەمدا هاوئاهەنگی وەرگرت، جێگەی زەوی لە سیستەمی بوون و گرنگتر لە هەموشیان داگیرکردنی ناوەندی جیهانی لەلایەن زەویەوە گۆڕی. لەم سیستەمەدا زەوی هەسارەیەکی بچوک و ناگرنگ بوو کە هیچ جێگەیەکی تایبەتی لە فەزایەکدا نەبوو کە پێدەچوو بێکۆتایی بێت (ئەستێرە بێ ئەژمارەکان ئێستا بەهۆی تەلسکۆپە پێشکەوتوەکانەوە دەبینران). فەزایەک کە بێ کۆتایی و مەزنیەکەی باسکالیان دەترسان.

«فەلسەفەی میکانیکی» تازە کە زانایانی ئەتۆمیزم پەیڕەویان دەکرد، سروشتیان بە شتێکی زیاتر لە گەردیلەکانی مادە نەدەزانی کە یاسا گەردونیەکان بەسەریدا باڵادەستە. دیارە ئەگەری بەکارهێنانی هاوکێشە ماتماتیکیەکان بۆ رونکردنەوەی شێوەی کارکردنی ئەم یاسایانە، بە دەستکەوتێکی مەزن بۆ پێشکەوتنی لێکۆڵینەوەکان و چەمکسازی دەژمێررا. بەڵام ئەم فەلسەفەیە ئێستا ئەوەی کە بەردەوام بە «سروشتی گیاندار» ناودەبرا، بە بێگیان و ناشەخسی (IMPERSONAL) لەقەڵەمدا. سەرەڕای ئەمە رێنێ دیکارت زانا و فەیلەسوفی فەرەنسی بڕوایوابوو کە جگە لە مرۆڤ هەموو بونەوەرە گیاندارەکانی دی، تەنها مەکینە یان مەکینەیەکی ئۆرگانین (AUTOMAIA) کە تەنانەت هوشیاریشیان نیە. هێنانەئارای ئەم ئەگەرەش کە رەنگە خودی مرۆڤیش مەکینەیەکی تر بێت ناچارانە بوو، بەو جیاوازیەوە کە مرۆڤ ئامادەی گرفتاربوونە بە خۆبینی و خۆ هەڵخەڵاتاندن.

لە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەهەمدا «جان دان»ی شاعیری میتافیزیکی رایگەیاند کە «فەلسەفەی تازە هەموان دەخاتە گومانەوە». لەهەمانکاتدا نابێت وابزانین دۆزینەوەکانی «زانستی تازە» هەموو بیریارانی نائومێد کردبێت و ناچار بە گومانی کردبن. بەڵام ئەو گۆڕانە سەرەکیانەی لە تیورە سروشتیەکاندا

رویدابوو، زۆرکەسی هێنایە سەر ئەو بڕوایەی کە دەبێ بە بیروڕا جێگیرەکان لەبارەی مێژوو، سروشت و چارەنوسی مێژوویی مرۆڤدا بچینەوە.

بابەتێکی تر لە نێوەی دوهەمی سەدەی حەڤدەهەمدا هاتەئاراوە، کە بووە هۆی پەشێویەکی زیاتر. هەر لەهەمان سەرەتای بزوتنەوەی ریفۆرمی دینی و بزوتنەوەی دژ بە ریفۆرمی دینی (COUNTER-REFORMATION) چەند وتوێژێکی توند لەنێوان کەلامناسانی پرۆتستانت و کاسۆلیکدا لەسەر تەفسیری ئەنجیل و بونیادە سەرەکیەکانی باوەڕ دەستی پێکردبوو. رەگەزی سەرەکی ئەم وتوێژانە ئەم بیروڕا نەیارانە بوو کە بەوردی چ کەسێک «کەنیسەی هەقیقی» و چ شتێک و لەکوێ نوێنەرایەتی دەکات، و سەرچاوەی دەسەڵات و بایەخی چیە؟ ئایا یەک بەیەکی وشەکانی کتێبی پیرۆز قسەکانی خودان و مانای راستەقینەی هەر وشەیەک هەمان مانای زمانی وشەکەیە؟ و لەم بابەتە شتانە.

ئەمجۆرە وتوێژە توند و هەندێکجار تاڵ و بریندارکەرانە، بەشێوەیەکی ناچارانە بناغەی بایەخی ئەخلاقی خەڵکی کەنیسەی لەبەرچاو بیر ئازاد و رەخنەگرەکاندا، وێرانکرد، و لێکۆڵەرەوە وردبین و راستگۆکانی والێکرد کە بە شێوازێکی نادینی تەماشای مەسەلە بونیادیەکانی مێژوو و چارەنوسی مرۆڤ بکەن. بە خوێندنەوەیەکی وردتری ئنجیل، مەسەلەگەلێکی لەو چەشنە هاتە ئاراوە کە ئایا دەشێت وەک لە ئنجیلدا هاتووە تەنها ٦٠٠٠ ساڵ بەسەر پەیدابوونی جیهاندا تێپەڕی بێت؟ ئایا بەڕاستی یەکەم مرۆڤ لەسەر زەمیندا ئادەم بووە؟ ئایا بەڕاستی مارێک لەباخی بەهەشتدا قسەی لەگەڵ ئادەم و حەوادا کردووە و حەوای هەڵخەڵەتاندووە؟ ئایا خودای بە بەزەیی و دادپەروەر بەڕاستی دەتوانێت هەموو مرۆڤەکان جگە لە نوح و خێزانەکەی، لە تۆفاندا لەناو ببات؟ ئەو هەموو ئاوە بۆ دروستکردنی تۆفانی نوح، دەیتوانی لەکوێوە هاتبێت؟ پاش تۆفانەکە ئەو هەموو ئاوە چی لێهات؟ ئایا تۆفان مۆجیزە بوو؟ یان دەبێت ئەم روداوە وەک زۆرێک لە «مۆجیزەکانی» تری کتێبی پیرۆز، بەیارمەتی یاسا سروشتیەکان کە زانستە مۆدێرنەکان دۆزیویانەتەوە رونبکرێتەوە؟ ئایا لەکاتی داگیرکردنی شاری ئەریحا، بەڕاستی خۆر لەبەر یەشوعی پێغەمبەر، لە جوڵە وەستاو پرسیاری دی؟ بەهێنانە ئارای پرسیاری لەمچەشنە سەدان مەسەلەی مێژوویی، ئەخلاقی، زانستی و کەلامناسی تازەیان هێنایە ئاراوە، مەسەلەگەلێک کە وەڵامێکی لەپێشەوە روونیان لەناو کتێبی پیرۆزدا بۆ نەدەدۆزیەوە. ئەم حاڵەتە چارەسەری مەسەلە باوەڕی و پراکتیکیەکانی بۆ مەسیحیەکان ئەستەمتر دەکرد. لێرە بەدواوە دەسەڵات و بایەخی بێ چەندوچونی مەزهەبی وەحیی (REVEALED RELIGION) کەوتە لەرزین. مرۆڤ دەبوو هەنوکە رێگەیەکی دی و باشتر بۆ دەستگەیشتن بە زانینی راستەقینە هەڵبژێرێت.

«پیر بایلی» پرۆتستانتی فەرەنسی کە بە پێشێلکردنی ئاین بەناوبانگ بوو، لەسەردەمی لوی چواردەهەمیشدا بوو بە پەنابەری هوڵەندا، لە ساڵی ١٦٩٧دا کتێبێکی بڵاوکردەوە بەناونیشانی «دیکشنەری رەخنە و مێژوو» و تیایدا گرنگییەکی بەرجەستەی بەو کێشە و گرفتانەی لەسەرەوە باسمانکرد بەخشی. بایل هەروەها پوچی مناڵانەی نەریتە مەزهەبیەکانی کافرانی بەشێوەیەک هێنایە ئاراوە، کە دەیتوانی بەهێرشێکی ناڕاستەوخۆ بۆ خودی مەسیحیەت بژمێرێت. توێژەرەوان لەمڕووە جیاوازی بیروبۆچونیان هەیە کە ئایا بایل بەدڵ «ئیماندار» بووە کە بڕوای بەوە هەبووە ئەرکی مەسیحی ناچارمان دەکات بڕواهێنان بە تێزەکانی کەنیسە وەک ئامرازێک بۆ باڵادەستی بەسەر گومانی لۆژیکیدا دابنێین، یان ئەوەی گومانکارێک بووە کە ئامانجی پیشاندانی پۆچی بنەماکانی مەسیحیەت بووە؟ بەهەرحاڵ گومانی تیا نیە بایل لە شاردنەوەی ئامانجە راستەقینەکانی خۆیدا، هونەرمەندێکی تایبەت بووە.

لەنیوەی سەدەی حەڤدەهەم بەدواوە، زۆرێک لە بەرجەستەترین بیریارانی ئەوروپا، بەو دەرئەنجامە گەیشتوون کە بۆ تێگەیشتنی مێژوو و چارەنوسی راستەقینەی مرۆڤ، نە دەکرێت پشت بە باوەڕی کوێرانە بە ئینجیل ببەسترێت، نە چیدی دەکرێت ناهوشیارانە بایەخی زانست و فەلسەفەی یۆنان و رۆم (کلتوری دێرین) بە بەس بزانرێت. لێرەوە دەبوو ماهیەتی مرۆڤ کە هێشتا نەناسراو بوو، بکەوێتە ژێر لێکۆڵینەوەوە و پێشنیاری «میتۆدێکی زانستیان» دەکرد کە بیریارانی زانستە سروشتیەکان (مۆدێرنیستەکان) بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە لە ئەستێرەناسی، فیزیا و زیندەوەرزانیدا بەکاریانهێناوە.

گومانی سیستماتیکانە (بەمانا دیکارتیەکەی) واتە تاقیکردنەوە و پشتبەستن بە ئەزمونی راستەوخۆ و پشتەبەستن بە رێکخستن و یاسای سروشت، رەوتێکە کە یاساکانی بوونی مرۆڤ وەک بونەوەرێکی هوشیار و کۆمەڵایەتی ئاشکرا دەکات، بەگشتی بەهەمان ئەو شێوەیەی کە یاسای راکێشان، جوڵەی هەسارەکان لەناو مەنزومەی خۆریدا روندەکاتەوە. ئەمجۆرە شوبهاندنانە بە زانستە سروشتیەکان، رێک هەمان ئەو شتەیە کە هیوم ئەوکاتەی خۆی بە «نیوتنی زانستە مرۆییەکان» ناودەبرد، لە خەیاڵیدا بوو. «بیرورا کۆنەکان» کە بەهۆی مەسیحیەت و کلاسیکیەکانی پێش مەسیحیەت دەربڕا بوو، بوون بە کێشەیەک بۆ زانایانی زانستە کۆمەڵایەتیەکانی رۆشنگەری، لانیکەم لەو رووەوە «مۆدێرنیستەکان» لەو شتەدا لە دێرینەکان پێشکەوتوتر بوون کە زۆرجار بە «شەڕی کتێبەکان» ناودەبرا (باسەکە لەسەر ئەوەبوو ئایا مۆدێرنیستەکان بەسەر یۆنانیەکاندا هیچ ئیمتیازێکیان هەیە یان نا؟).

بەمشێوەیە بڕوای فرانسیس بیکۆن بەوەی بەکارهێنانی میتۆدەکانی زانستە سروشتیەکان، دەبێتە هۆی «پێشکەوتنی پەروەردە»، هیوای پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی لەدڵی بیریارانی رۆشنگەریدا زیندوکردەوە. بەبڕوای ئەوان ئەمجۆرە زانستە تازە بونیادنراوانە- دەبێتە هۆی زیادبونی دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەر سروشتدا و بەمشێوەیە بە زامنی خودی بیکۆن «کاریگەری لەسەر هەموو شتێک دادەنێت». وەک چۆن ڤۆڵتێر لە «نامە فەلسەفیەکان»دا (LETTERS PHILOSOPHIQUES) (١٧٣٣) جەخت لەوە دەکات، دەستکەوتەکانی نیوتن بەڕاستی دەریدەخات زانستە مۆدێرنەکان، رەمزی پێشکەوتنی مرۆڤە. یان وەک ئەلکسەندەر پۆپ لەم بەیتەدا دەڵێت:

کەس نەیزانی ئەم دنیایە بەچ شێوەیەک دەسوڕێت

خودا فەرمانی کرد «دەستبەکاربە نیوتن» دنیا هەمووی روناک بۆوە

کاتێک کەنیسەی کاسۆلیکی رۆم تیورەی کۆپرنیکۆس بە کفرئامێز ناودەبات و گالیلۆش بۆ دادگا پەلکێشدەکات، تەنها ئەوەی سەلماندووە کە هەقیقەت بەردەوام دوژمنانی خۆی هەبووە. بەڵام هەقیقەت خاوەن چەندان هێزی مەزنە کە دواجار سەردەکەوێت.

پۆل هازارد مێژونوسی فەرەنسی سەردەمی نائارامی و یاخیبوونی کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەهەم بە «سەردەمی قەیرانی» بیرکردنەوەی ئەوروپی ناوبرد. بیریارانی سەردەمی رۆشنگەری بڕوایانوابوو ناکرێ لەڕێگەی تێگەیشتنی زانستی مرۆڤەوە لەسەر بناغەی میتۆدێکی سیستماتیک بەسەر ئەم «قەیران»ەدا زاڵ بین. پرۆژەی «مێژووی سروشتی مرۆڤ» لەبری «مێژووی پیرۆز»ی دێرینی عەهدی کۆن، هەوڵێک بوو لەم پێناوەدا. زۆرێک لە فەیلەسوفانی رۆشنگەری هەوڵیانداوە بەشێوەیەکی ئەزمونگەرانە و سیستماتیکانە دیدی مێژوویی و مرۆڤناسیانە کامڵبکەن، کە تیاییدا بەداواداچونی رەوتی پەیدابوونی مرۆڤی ئەوروپی لە قۆناغی «دڕندەیەتیەوە» کە بە سەرچاوەی سەرەتایی مرۆڤ دادەنرا، تا سەردەمی هەنوکە ئامادەکرا. قۆناغی «دڕندایەتی» هەلومەرجێکی «سەرەتایی» و هاوشێوەی خێڵە سەرەتاییەکان

بوو، کە گەڕێدەکان لە سەفەرەکانی خۆیاندا بۆ تاریکترین قوڵایی ئەفەریقا، ئەمەریکا و دواجار ئوستورالیا بەریان کەتوبوون.

هەندێکجار بۆئەوەی توانا و لێهاتویی خەڵکی سەرەتایی بۆ پێشکەوتن لەڕووی زانستیەوە تاقیبکرێتەوە، ئەو خەڵکە سەرەتاییانەی ئەفەریقا و ئەمەریکایان بۆ پاریس یان لەندەن دەهێنا و دەیانخستنە بەر تاقیکردنەوە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگا شارستانیەکان. کاپیتان کوک، «ئۆماوی» لە تاهیتیەوە کە تازە دۆزرابۆوە، لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەوروپا هێنا. تاقیکردنەوەی هاوشێوە لەسەر منداڵانی «دڕندە»ی سەرگەردان، کە لە جەنگە ئەوروپیەکاندا دۆزرابونەوە ئەنجامدرا. باوەڕی فەیلەسوفانی سەردەمی رۆشنگەری بە «پێشکەوتنی» داهاتوو، بە «بەکەماڵ گەیشتنی» ئەم دنیایەی مرۆڤ، بەوشێوەیە کە هردەر، کۆندریسە و فەیلەسوفانی سکۆتلەندی وەک فرگسۆن و میلار دەڵێن، لەسەر ئەو بناغەیە دامەزرابوو کە بەشێکی زۆری مرۆڤایەتی هەنوکە لە «دڕندایەتیەوە» بۆ « شارستانیەت» یان بەوتەی سکۆتلەندیەکان لە «ناکامڵیەوە» (RUDENESS) بۆ «عەقڵانیبوون» (REFINMENT) چوون.

بێگومان هێنانە ئارای گریمانەی لەمچەشنە لەبارەی توانای مرۆڤ بۆ پێشکەوتن، بێ بڕوابوون بە توانای شکڵوەرگرتنی بێئەندازەی تواناکانی مرۆڤ، بێ بڕوابوون بە توانای فێربوون، گۆڕان و چاکسازی لە رەگەزی مرۆڤدا، وێنا نەدەکرا. کەلامیە بونیادگەرا مەسیحیەکان چ کاسۆلیک و چ پرۆتستانتەکان بەشێوەیەکی کلاسیکی مرۆڤیان بە گوناهکارێکی بێ چارەسەر و میراتگری «گوناهی سەرەتایی» پێناسدەکرد. بەبڕوای ئەوان هەموو ئەو شتانەی مرۆڤە بێباوەڕەکان یان ئەو کەسانەی لەلایەن کەنیسەوە نەبەخشرابوون ئەنجامیاندەدا، بەناچار بەد و خراپە بوو. بەهەمان شێوە فەیلەسوفانی بەدبینی یۆنانی دێرینیش، مرۆڤیان بە بونەوەرێک دادەنا کە بەشێوەیەکی ناچاریانە لەناو دەرونی خۆیدا بەردەوام خەریکی جەنگە. ئەوان بڕوایانوابوو لێهاتوویی و توانا مەزنەکانی عەقڵانیەتی مرۆڤ، بە سادەیی لەبەردەم ئارەزوە ئاژاوەگێڕ و شەهوانیەکانیدا دەدۆڕێنێت. لێرەوە رەواقیەکان رەوتی کەلبی، بڕوایان وابوو بەرزترین ئاستێک مرۆڤ بتوانێت دەستی پێبگات، دورکەوتنەوەی بڕاوەیە لە منی نزمتر.

تێڕوانینی فەیلەسوفانی رۆشنگەری بۆ ماهیەتی مرۆڤ، تەواو دژی ئەو دیدەی سەرەوە بوو. رۆشنگەران تیورەی «گوناهی سەرەتایی»خودی مرۆڤیان وەک تیورەیەکی نازانستی بێبناغە رەت دەکردەوە. بەپێی بەڵگاندنەکانی رۆشنگەران ئارەزوەکانی وەک عەشق، شەهوەت، غرور و چاوچنۆکی بەناچار تێکدەر و خراپ نەبوون و ئەگەر لەرێگەیەکی گونجاودا دابنرێت، دەتوانێت یارمەتی پێشکەوتنی مرۆڤ بدات. لە فۆرمۆلە پارادۆکسیەکەی برنارد مەندوێلدا «خراپیە فەردیەکان» (وەک چاوچنۆکی و خۆپەرستی) دەتوانن لەڕێگەی «بەرژەوەندی گشتیدا» بەکاربێن (بۆ نمونە لەرێگەی هاندان بۆ مەسرەفی زیاتر، جوڵە بە ئابوری بدەن). زۆرێک لە بیریارانی رۆشنگەری وەم هلۆتیۆس لە فەڕەنسا، و پێشەنگی «سودخوازان» بنتهام لە ئینگلتەرا، یارمەتی دروستبونی تێڕوانینێکی دەروونناسیانەیان بۆ ماهیەتی مرۆڤ دا. ئەوان لە بەرامبەر دیدی ئەخلاقباوەڕی رابردودا کە مرۆڤی بە بونەوەرێکی عەقڵانی دەزانی کە بەردەوام بەهۆی ئارەزوە دەرونیەکانیەوە هەڕەشەی لێدەکرێت، ئەم تیورە تازەیەیان هێنایە ئارا کە مرۆڤ ئاژەڵێکە لەلایەن سروشتەوە وا بەشێوەیەکی ناسک بەرنامەڕێژی کراوە، کە بەردەوام بەدوای لەزەت و دورکەوتنەوە لە ئازاردایە. لێرەوە بەبڕوای ئەوان دەبێ ئامانجی سەرەکی سیاسەتی رۆشنگەرانەی کۆمەڵایەتی، دەبێت هاندانی هوشیاری بێت بۆ بەرژەوەندیە تایبەتیەکان و بەدیهێنانی «زۆرترین خۆشبەختی شیاو، بۆ زۆرترین تاکەکەسی مومکین».

ڕۆحانیەکان و ئامۆژگاریکارانی دێرین، هاندانی «بنەمای لەزەت وەرگرتنیان» وەک شتێکی گوناە، ئاژەڵیانە و کفرئامێز مەحکومدەکرد. بەپێچەوانەی ئەمانەوە نەوەیەکی تازەی «ئابوریزانانی سیاسی» کە بەرجەستەترین کەسیان ئادام سمیسی سکۆتلەندی بوو، تیورەیەکی دیان پێشکەش دەکرد. ئادام سمیس لە کتێبی «سامانی نەتەوەکان»دا (١٧٧٦) دەیگوت ڕەفتاری خۆویستانەی بەرهەمهێنەران و مەسرەفکەران، ئەگەر پێ بەپێی یاساکانی بازاڕی ئازاد کاربکات، لە بەرژەوەندی گشتی دەبێت —دیارە تاڕادەیەک بە یارمەتی «دەستی نەبینراو»ی مەشیەتی ئیلاهی. بەهەمان شێوە کەسانی وەک بەکاریای ئیتاڵیای کە بەنیازی چاکسازی یاسا مەدەنی و دادگاییەکان بوون، بەڵگەیان دەهێنایەوە کە زانستی یاسا لەحاڵەتێکدا دەتوانێت ڕەگێکی زانستی هەبێت کە بەپێی تیورەی دەروونناسی خۆویستی لۆژیکی، بونیادبنرێت. واتە دەبێ سەختی و ئازاری سزادان بەشێوەیەکی ورد، لەسەر ئەو بناغەیە هەڵسەنگێنرێت کە بتوانێت پارسەنگی لەزەتی دەرئەنجامی رابواردن بداتەوە.

توانای گۆڕان و گرنگتر لە هەموو شتێکیش توانای گونجان لەگەڵ هەلومەرجی تازەدا، پێشمەرجی ناچاریانەی پێشکەوتن و پەرەسەندنی مرۆڤە. لێرە جێگەی سەرسوڕمان نیە کە دەروونناسانی سەردەمی ڕۆشنگەری هەموو سەرنجی خۆیان ئاراستەی پرۆسەی فێربوون (LEARNING PROCESS) کردووە، و هیوایەکی زۆریان بە پەروەردە بەستبوو. زۆرێک لە بیریارانی ئەم سەردەمە لەژێر کاریگەری دوو بەرهەمی سەرەکی لۆکدا «وتارێک لەبارەی تێگەیشتنی مرۆڤەوە» و «هەندێک تێبینی لەبارەی پەروەردەوە» (١٦٩٣)، بڕوایانوابوو دەکرێت مێژووی مرۆڤایەتی بە مێژووی فێربوونی منداڵ بەراوردبکەین. بەپێرەوانی لۆک ئەم حوکمەی ئامۆژگارانی کەنیسەیان ڕەتدەکردەوە کە دەیگوت مرۆڤ بە گوناهکار لەدایکدەبێت، بەهەمان ڕێژەش ئەو تیورەیەی ئەفلاتۆن کە مرۆڤ خاوەن «ئایدیای خۆڕسکە» (لەبارەی ڕاستی و ناڕاستیەوەیە) بەهەڵە دەزانی. بە بڕوای ئەوان مێشکی مرۆڤ لە سەرەتای لەدایکبونەوە زۆرتر لە لەوحەیەکی سادە (TABULA RASA)، تابلۆیەکی بێ ڕەسم یان »بەرگێکی سپی کاغەز» دەچێت. پاش لەدایکبوون مێشک پێدراوە جیاوازەکان لەرێگەی ئۆرگانەکانی هەستەوە (چاو،گوێ و ئەوانی تر) بەردەوام رادەکێشێت، پاشان ئەم زانیاریانە پۆلێن دەکات، لە شکڵی «ئایدیا»دا دروستیان دەکات کە بەها ئەخلاقیەکانو زانینی ئەزمونی مرۆڤ بۆ جیهان پێکدەهێنێت. بەپێی ئەم تێڕوانینە سروشتی مرۆڤ، تواناکانو زانینەکانی، سەرجەم بەرهەمی فێربوونی ئەزمونگەریانەیە لەرێگەی رەوتێکەوە کە پێی دەگوترێت «تەداعی ئایدیاکان» (ASSOCITION OF IDEAS) (دروستکردنی تیورە ئاڵۆزەکان لە یەکە سادەکان). بەمشێوەیە مرۆڤ کوڕی دەوروبەری سروشتیو کۆمەڵایەتی خۆیەتی، بەڵام لەهەمانکاتدا خاوەن ئەو توانایەشە کە هەمان ئەم دەوروبەرە بگۆڕێت.

لەسەر بناغەی ئەم تێڕوانینەی سەرەوە مرۆڤ لەڕێگەی کارو کاردانەوەی دیالەکتیکیەوە لەگەڵ هاورەگەزو دەوروبەریدا بەردەوام گەشەدەکاتو لەهەمان ئاراستەشدا لەگەڵ ئەو پرسانەدا کە خۆی بەردەوام دەیانگۆڕێت، ڕووبەڕو دەبێتەوە. لێرەوە ستایشکەرانی لۆک وەک کۆندیاکو هلۆتیوس ئەو دەرئەنجامگیریان کرد کە مرۆڤ دروستکەری خۆیەتیو تواناکانی بۆ گۆڕینی خۆی، هیچ سنورو ئاستێکی دیاریکراوی لە پێشەوە نییە. لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەدا کۆندریسێ وتارێکی بەناوی «نەخشەی وەسفی پەرەسەندنی مێژووی زیهنی مرۆڤ»وە (١٧٩٤) نوسی، کە تیایدا سەرجەم قۆناغەکانی مێژووی پێشکەوتنی بیرکردنەوەی مرۆڤی لە ڕابردووەوە تا هەنوکەو ئایندە وێنەکردووە. زمانی کۆندریسێ لەم بەرهەمەدا هەرکاتێک لە ئایندە نزیکتر دەبێتەوە، شەوقو هەژانێکی زۆرتر پەیدا دەکات. کۆندریسێ (کە خۆی بووە قوربانی شۆڕشی فەرەنسی) بە سەرسەختیەوە بڕوای بەوە بوو مرۆڤ لەبەر توانای

«کامڵبوونی» (PERFECTABILITY) بەسەر لاوازی، پێداویستی، نەخۆشیو تەنانەت مەرگیشدا سەردەکەوێت. هەم لامارکی زانای سروشتی فەڕەنسیو هەم ئەراسمۆس داروینی دکتۆرو زانای بایەلۆجی ئینگلیزیو باپیرەی چارلز داروین، نەخشەی سەرەتایی تیورەی پەرەسەندنی رەگەزەکانیان وێنە کێشا و تیایدا هەریەکەیان بەشێوەی خۆی توانای بونەوەرەکانیان بۆ فێربوون، گۆڕانو خۆگونجاندن لەگەڵ هەلومەرجە تازەکانو گواستنەوەی خەسڵەتە بەدەستهاتووەکانیان بۆ نەوەکانیان، پێشبینی دەکرد.

شارستانیەتی رۆژئاوا لە سنوری سەدەی بیستویەکدا هێشتا بەها بۆ دیدی نادینی رۆشنگەری کە لەسەر بناغەی رەوتی بێ سنوری مرۆڤ بەرەو گەشەکردنی ئابوری، تازەگەری زانستیو پێشکەوتنی مرۆڤ دامەزراوە، دادەنێت (بە بڕوای هەندێکیش ئەم سەدەیە هەر لەو چوارچێوەیەدا دیلە). زانستە مرۆییەکانی سەردەمی هەنوکە کۆمەڵناسی، ئابوری سیاسی، دەرونناسی، مرۆڤناسی هەر هەموویان لەو تۆوانەوە پەرەیانسەندووە کە لە سەردەمی رۆشنگەریدا چێدران. ئەمرۆکە پیاوانی دەوڵەت هێشتا بۆ پاساوهێنانەوە بۆ باوەڕی خۆیان بە بازاڕو ئەوەی کە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی سودی شەخسی دواجار بەسودی هەموان تەواو دەبێت، دەگەڕێنەوە بۆ تێزەکانی ئادام سمیس.

لێرەوە لەژێر رۆشنایی ئەو شتانەی گوتران، دەبوو دژایەتیەکانو ئاڵۆزیەکانی زانستە مرۆییەکان بەوجۆرەی لەسەدەی هەژدەدا شکڵی وەرگرت، تێبگەین نەک لە ئاڵۆزی میراتەکەی. فەیلەسوفانی رۆشنگەری بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە «ئەفسانە»ی دۆگمی مەزهەبی لەبارەی مرۆڤەوەو جێگەکەی لە سروشتدا کە لەژێر فەرمانڕەوای خوداوەندایە وێرانکردووە و لەبری ئەمە زانینی زانستی راستەقینە کە پشتی بە راستیە بابەتیەکان بەستووە دامەزراندووە. بەمشێوەیە زۆرێک لە مێژوونوسان لەوانە گی، لەبەرئەوەی ئەم فەیلەسوفانە لەبیرکردنەوەی «ئەفسانە سازەوە» (MYTHOPOEIC) تێپەڕین و جوڵەیان لە «ئەفسانەوە بۆ عەقڵ» دەستپێکرد، ستایش دەکات.

بەڵام رەنگە راستر بێت بگوترێت فەیلەسوفانی رۆشنگەری ئەفسانەی زانستیان کە زۆرتر لەگەڵ سەردەمی پیشەسازیو تەکنەلۆژیادا گونجاو بوو، کردە جێگری ئەفسانەی مەزهەب. لەراستیدا نمونەکانی هەردوو ئەم ئەفسانەیە بەشێوەیەکی بەرچاو لێکدەچن. وەک کارل بکر ئەم مەسەلەیەی لە بەرهەمەکەی خۆیدا کە بەهوشیاریەوە ناوینا «شاری ئاسمانی فەیلەسوفانی سەدەی هەژدەهەم» کۆکردۆتەوە، تیوەری دۆخی سروشتی بەشێوەیەک کە لە مێژوونوسی تیوریدا بەهۆی فەیلەسوفانی رۆشنگەرییەوە بەرهەمهاتووە، لێکچونێکی سەرسوڕهێنەری لەگەڵ بەهەشتو کەوتنەخوارەوەی ئادەم لە دینی مەسیحیدا هەیە. بەهەمان شێوە تیورەی رۆشنگەری سەبارەت بە پێشکەوتنی بێ سنوری مرۆڤ، دەکرێت بە ریوایەتێکی زەمینی بڕوابوون بە بەهەشت دابنرێت. بیروڕاکانی پەیوەندیدار بە دڕندەی مەزنەوە «NOBLE SAVAGE» و پێشکەوتنو پەرەسەندن کە بونە جێگرەوەی فۆرمولەکانی مەزهەبی مەسیحی، بەرلەوەی «کۆمەڵێک راستی» قاڵبدراوو نەگۆڕ بن، کۆمەڵێک چەمکی تیوریو رەمزینو پەیوەندیان بە تێڕوانینی لەپێشەوە پێناسکراو (پێشگریمانە) و تەنانەت دەکرێ بگوترێ پەیوەندیان بە مەسەلە دینیەکانەوە هەیە.

هێنانە ئارای ئەوەی کە فەیلەسوفانی رۆشنگەری زانستیان نەخستە بری ئەفسانە، بەڵکو ئەفسانەیەکی تازەیان خستەبری ئەفسانە کۆنەکە، بەمانای «ئابروبردنی» بزوتنەوەی رۆشنگەری نیە، بەڵکو بەو مانایەیە کە نابێت بەهای ناوی (FACE VALUE) بۆ بانگەشەکەی دابنێن، بەڵکو لەگەڵیاندا وەک پڕوپاگەندەیەکی کاریگەر هەڵسوکەوت بکەین، بۆ نمونە پەرەسەندنی ئابوری سیاسی لەبەرچاو بگرین. ئادام سمیس لە بەرهەمەکەی خۆیدا «سامانی نەتەوەکان» (١٧٧٦) رەخنە لە

سیاسەتی دێرینی «میرکانتالیزم»و پشتیوانی دەوڵەتە ئەوروپییەکان دەگرێت، حاڵەتێک کە بە بڕوای سمیس بوو بووە هۆی ئیفلیج بوونی بازرگانی، چونکە دەوڵەتەکان بۆ زیادکردنی دەرامەتەکانی خۆیان رویانکردە بڕیارە گومرگیەکان. ئادام سمیس هەروەها هێرش دەکاتە سەر ئەو باوەڕە دێرینە کە جەنگ بەرێگەی بەدەستهێنانی سامان دەزانێتو سودی سەقامگیر «VESTED INTEREST» کە بەهۆی پاراستنی پاوانکردنەکان بە زیانی بەرژەوەندی گشتی بەدەست دێت، مەحکومدەکات و رایدەگەیەنێت کە ئەگەر بەدروستی لە میکانیزمی بازاڕ بگەین، لەدور مەودادا بەقازانجی بەرژەوەندی گشتی دەبێت. لەژێر رۆشنایی ئەم بانگەشانەدا تێگەیشتن لەو خاڵە ئاسانتر دەبێت بۆچی گی ئابوری ئازادی سمیسی بە «مرۆڤانەتر»و »زانستی تر» لەو سیستەمە ئابوریانە دەزانێت کە سمیسو پەیڕەوانی هێرشیان دەکردە سەر.

بەڵام نابێت ئەو خاڵە گرنگە فەرامۆشبکەین کە ئابوری سیاسی سمیسی (یان کلاسیک) بەشێوەی جۆراوجۆر، لەوانە بە پێشنیاری ئازادکردنی هێزی کار (کە خۆی ناوی دەنا «هێزی کاری ئازاد») بۆ سەرمایەداری لە قۆناغی بەرهەمهێنانی پیشەسازیدا، بەهانەو پاساوی دەهێنایەوە. بەڵام خودی سمیس ئەوەندە راستگۆ بوو کە ئەو راستیە قبوڵبکات کە دابەشکردنی توندی کار کە پێداویستی بەرهەمهێنانی مۆدێرنە (نمونە سەرەکیەکەی بەرهەمهێنانی دەرزی بوو)، کرێکاری کردووە بە بونەوەرێک کە لەرووی زیهنیەوە ئیفلیجو وەک مەکینەیەکی کۆیلەئاسای لێکردووە. بەڵام ئەوەندە «مرۆڤ دۆست» نەبوو کە رێگەچارەیەک بۆ ئەم کێشەیە پێشنیاربکات. تیورەکانی ئابوریزانانی کلاسیک سەبارەت بە سودو زیانو «یاسا ئاسنیەکانی کرێکاران»، ئەمجۆرە دەستێوەردانەی لە میکانیزمەکانی بازاڕدا رەت دەکردەوە (ئەوان بڕوایانوابوو هەرجۆرە دەستێوەردانێک لە میکانیزمی ململانێ، لە بنەڕەتدا دەبێتە هۆی ناکارایی). بەمشێوەیە ئابوریزانانی لایەنگری ئابوری ئازاد، بەرگریان لە بێدادی سەرمایەداری لەژێر ناوی «یاسا سروشتیەکانی» هێزی بازاڕدا دەکرد. یاساگەلێک کە بە وتەی ئەدمۆند بۆرکی سیاسەتمەداری ئینگلیزی پیرۆز بوون، چونکە بە بەشێک لە «یاساکانی خودا» دەژمێرران.

ئەو زانستە کۆمەڵایەتیە تازەیەی بەهۆی فەیلەسوفانی سەردەمی رۆشنگەرییەوە بڵاوبونەوە، بەتوندی رەخنەیان لە تێڕوانینە مەسیحیەکان بۆ حکومەتی خوداو سیستەمی هیریدیانەو میراتگری فیودالی دەگرت. بەڵام (جگە لەهەندێک ئاوارتن وەک رۆسۆ) هیچ رەخنەیەکی وردیان لە کۆمەڵگای بەکارهێن (مەسرەفی) کە موڵکایەتی تایبەتیو بەرژەوەندیە فەردیەکانی پیرۆز دەکرد، پێشکەش نەکرد. سرودی ستایشکردنی رۆشنگەری لە «پێشکەوتن» لە زۆرێک لە بوارەکاندا نایەکسانیو ستەمی رژێمی پیشەسازیو مەسرەفی تازەی فەرامۆش دەکرد (بەو بەهانەیەی مەگەر هەموو شتێک بەرەو باشتر بوون نەدەڕۆی!) . بێ هۆ نیە رۆمانسییەکی وەک ویلیام بلیک بەو سۆزو حەماسەتەوە ئەو هەلومەرجەی مەحکوم دەکرد، کە بەسەر «کارخانە رەشو شەیتانیەکاندا» باڵادەستە و فەیلەسوفانی رۆشنگەری وەک بیکۆنو لۆکو نیوتنو ڤۆڵتێری وەک بلیمەتەکانی ئەهریمەن سیفەت کە پشتیوانی لەم سیستەمە دەکەن، بەشایەنی سەرزەنشتکردن دەزانێت. ماورین مەک نیل بەشێویەکی قابیلی قبوڵکردن ئەو مەسەلەیە دێنێتە پێشێ کە ئەراسمۆس داروینی پزیشکو پسپۆری پەروەردە، زاناو لە هەموو ئەمانەش گرنگتر فەیلەسوفی بەرجەستەی رۆشنگەری لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەدا، پڕسۆزترینو تامەزرۆترین ڕاگەیەنەری بەهاکانی کۆمەڵگای پیشەسازی تازە بووە .

## سەرچاوە:

# بونیادگەری و
# بونیادگەریی پێکهێنەرانە

نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

**بونیادگەری** STRUCTURALISM:

میتۆدی بونیادگەری بۆ یەکەمجار لە بواری زانستی زمانەوانیدا سەریهەڵدا، ئەم ڕەوتـــە یان ئەم میتۆدە پێی وایە زمان بریتییە لە کۆی پێکهاتەی ڕەگەزە جیاواز و پێکەوەبەستراوەکان، بەجۆرێک ناشێت هیچ رەگەزێک بەجیا دیاری بکرێت و پێناس بکرێت، بەڵکو دەشـــێت رەگەزێک لە پەیوەندیدا بە کۆی رەگەزەکانی ترەوە دیاری بکرێت. دەتوانین مانای وشـــەی بونیاد یان بنیـــات و بونیادگەری یان بنەماخوازی لەیەکدی نزیک بکەینەوە، چونکە لە سەرەتادا ئەم وشەیە تەنها لە بواری تەلارسازیدا بەمانای راســـتەوخۆی «دانانی بەردی بناغەی بینایـــەک» بەکاردەهات، بەڵام دواتر بەمانا مەجازییەکەی لە زانســـتی زمانەوانی و شـــێوازگەری و زانستەکانی تریشدا بەکارهێندرا.

زانای زمانەوانیی سویسری فردیناند دی سوسێر (١٨٥٧-١٩١٣) بە دامەزرێنەری بونیادگەریـــی زمانەوانـــی دەژمێردێت، ئەگەرچی ئەو لە لێکۆڵینەوەکانیدا وشـــەی بونیاد و بونیادگەریی بەکارنەهێناوە، بەڵکو وشەی سیستم SYSTEM ی بەهەمان مانای بونیاد بەکارهێناوە. سوســـێر سێ جومگەی گرنگی لەو زانستەدا دەسنیشان کرد کە دواتر بوون بە سێ دیواڵتی بنچینەیی بونیادگەری لە بوارە مەعریفییەکانی تریشدا:

١-زمان/ئاخاوتن.

٢-دال/مەدلول (واتە: دەنگ و مانا).

٣- سانکرۆنی و دیاکرۆنی (واتە تزامنی و تعاقبی).

دی سوسێر ئەم میتۆدە بە یاریی شەترەنج دەچوێنێت، بەو پێیەی هەر رەگەزێک لە رەگەزەکانی گەمەی شەترەنج (بۆ نموونە سەرباز یان فیل یان قەڵا) بەبێ پەیوەندیی لەگەڵ کۆی رەگەزەکانی دی، رۆڵێکی ئەوتۆی نابێت، بەڵام دەشێت رەگەزێکی دیاریکراو (بۆ نموونە وەزیر) لە پەیوەندیدا بە رەگەزەکانی ترەوە، رۆڵێکی دیار و کاریگەر و بەرجەستەتر ببینێت. لاوازبونی رەگەزێک یان چەند رەگەزێک کار لە سەرجەم رەگەزەکانی دیش دەکات. تەنانەت لە فسیۆلۆژیاشدا تیۆری بونیادگەری هەیە کە دەڵێت ئەندامەکانی جەستە ناتوانن بوونێکی سەربەخۆیان هەبێت، بەڵکو لە پەیوەندییەکی وەزیفیی دیاریکراودا دەتوانن وەزیفەی گشتی دیاری بکەن، بۆیە مومکین نییە رەگەزێک/ئەندامێک لە رەگەزەکانی دی جیابکرێتەوە، ئەگینا کار لە وەزیفەی ئەندامەکانی تریش دەکات.

دواتر ئەم ڕەوتە زمانەوانییە کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر بوارە مەعریفیەکانی تریشدا جێهێشت، لەوانە ئەنترۆپۆلۆژیا و سایکۆلۆژیا و سۆسیۆلۆژیا و ئابووری و تەلارسازی و فەلسەفە و مێژوو و هونەر و ئەدەب. گرنگترین نوێنەرانی ئەم میتۆدە لە زانستی زمانەوانیدا بریتین لە: دی سوسێر و ساپیر و چۆمسکی و رۆمان یاکۆبسن(کە بە ڕابەری زانستی نوێی زمانەوانیی بونیادگەری دەژمێردرێت) و ئیخنباوم و بلۆمفیلد و ترۆبتسکۆی و هلمسلیڤ، لە ئەنترۆپۆلۆژیادا کلۆد لیڤی ستراوس کە لەدوای سوسێر بە باوکی بونیادگەری دەژمێردرێت، جاک لاکان لە سایکۆلۆژیادا، رۆلان بارت و جۆلیا کریستیڤا و جیرار جینێت و ڤلادیمێر پرۆپ و جان کۆهین و ریڤاتێر و گریماس و تۆدۆرۆڤ و گۆڵدمان لە ئەدەب و رەخنەی ئەدەبیدا، میشیل فۆکۆ و پۆل ریکۆر و دێریدا و جیل دۆلۆز لە بواری فەلسەفەو مەعریفەدا، لوی ئالتۆسێر لە مارکسیزمدا، فیرنان برۆدێل لە زانستی مێژوودا، کە هەریەکەیان بەشێوەیەک سوودیان لەو میتۆدە وەرگرتووە.

بونیادگەری لە رەخنەی ئەدەبیدا بایەخی سەرەکی بە تێکست دەدات، ئەم میتۆدە وایدەبینێت تێکستی ئەدەبی جیهانێکی سەربەخۆیە و لە چەندین توخمی جیاواز و پێکەوەبەستراو پێک دێت و لە نووسەرەکەی جیادەبێتەوە. چونکە تەنها ئەو توخمانەن کە لە پەیوەندییەکی تایبەتیدا دەق پێک دەهێنن. رەخنەگری فەرەنسی رۆلان بارت (١٩١٥-١٩٨٠) بە ڕابەری تیۆری بونیادگەری لە رەخنەی ئەدەبیدا دادەنرێت، بەتایبەتی لە کتێبی «نووسین لە پلەی سفردا» کە لە ساڵی ١٩٥٣دا چاپی کردووە، هەروەها لەو لێکۆڵینەوەیەیدا کە لە ساڵی ١٩٦٣دا بەناونیشانی (س/ز) لەبارەی چیرۆکی «سارازین»ی بەلزاکی نووسیوە.

بونیادگەری وایدەبینێت ئەدەب بریتییە لە بونیادێک لەناو بونیادێکی گەورەتر و سەرجەمگیرتر کە زمانە، لێرەدا زمان و ئەدەب پێکەوە لکاون و کۆمەڵێ کۆد و رێسا و نەریتی دیاریکراو تەحەکومیان پێدەکات.

دەتوانین شیکردنەوەی بونیادگەری لە ئەدەبدا، لەم خاڵە سەرەکییانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

١- بونیادگەری پتر گرنگی بە جەوهەری ناوەکیی تێکستی ئەدەبی دەدات، بێئەوەی پابەندی بکات بە واقیعی کۆمەڵایەتی و راستییە فیکرییەکان و بارودۆخی سایکۆ-سۆسیۆلۆژیی نووسەر.

٢- بونیادی قوڵی تێکست و تۆڕی ئاڵۆزی پەیوەندیی توخمەکانی تێکست، دەبن بە بناغەی سەرەکیی کاری ئەدەبی، تەنها پەیوەندییە ناوەکییەکان ئەدەبیەتی ئەدەب بەرجەستە دەکات.

٣- بونیادگەراکان دان بە ڕەهەندی خودی و مێژوویی و کۆمەڵایەتیی ئەدەبدا نانێن، چونکە ئەوان

وایدەبینن ئەدەب بریتییە لە قەوارەیەکی زمانەوانی یاخود بریتییە لە جەستەیەکی زمانەوانیی سەربەخۆ، یان بریتییە لە سیسـتمێک لە هێما و دەلالات کە هیچ پەیوەستێکی بە دەرەوەی تێکست نییە، بەڵکو پابەندە بە ڕستە لە هەر سێ ئاستی دەنگی و پێکهاتەیی و دەلالیدا.

ئەمڕۆ هەندێ لە ڕەخنەگران دەڵێن بونیادگەری لە قۆناغێکدا برەوی هەبووە و ئێسـتا بەسەرچووە، تەنانەت کاتی خۆی هەندێ لە ڕابەرانیشی لێی پاشگەز بوونەوە، بۆ نموونە بارت و دێریدا و فۆکۆ ڕەخنەی لێدەگرن، یان نکوڵی دەکەن سـەر بەو ڕەوتە بن، تەنانەت تۆدۆرۆڤ لە دواکتێبیدا بەناوی (ئەدەب لە مەترسـیدایە) ڕەخنە لە بونیادگەری و ڕەوتە فۆرمالیسـتییەکان دەگرێـت و بایەخی کۆمەڵایەتییانەی ئەدەب دەهێنێتە ئاراوە.

گرنگترین ڕەخنەیەک کە ئاراسـتەی بونیادگەری دەکرێت، ئەوەیە کە ئەم ڕەوتە مێژوو پشـتگوێ دەخـات و گرنگی بە مانـا نادات و بەجۆرێک مامەڵە لەگەڵ تێکسـتدا دەکات وەک ئەوەی قەوارەیەکی زمانەوانیی سەربەخۆ بێت و لە ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی دابڕابێت، بەڵام لەڕاستیدا ئەم قسەیە بەڕەهایی راسـت نییە، چونکە ئەم میتۆدە لە پۆست سترەکچورالیزمدا بایەخێکی دیکە پەیدا دەکات، بەتایبەتی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بەدوای بونیادە قووڵ و شاراوەکانی کۆمەڵگەی بەشەریدا دەگەڕێت.

ئەگەر بونیادگەری وەک مۆدێل و وەک ئایدیۆلۆژیا بەسەرچووبێت، ئەوا وەک میتۆدێکی توێژینەوەی زانسـتی بوونی هەیە، چونکە هەر بزاوتێکی فیکری کە لەنێو دەچێت، بەتەواوی لەنێو ناچێت، بەڵکو لایەنە باشەکانی دەمێنێت و لەنێو بزاوتی گشتیی مێژووی فیکردا دەتوێتەوە.

ئەم میتۆدە لە سـەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا لەناو ڕەخنەی ئەدەبی عەرەبیدا بڵاوبووەوە، لە ئەدەبی کوردیشدا لە کۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکاندا برەوی پەیدا کرد و هاتە نێو پرۆسەی ڕەخنەییـەوە، بەڵام تەمەنی ئەو برەوپێدانـە کورت بوو، ئەمڕۆ ڕەنگدانەوەیەکی ئەوتۆی بونیادگەری لە ڕەخنەی کوردیدا نابینین بەدەگمەن نەبێت.

## ***بونیادگەریی پێکهێنەرانە*** GENETIC STRUCTURALISM:

بونیادگەریی پێکهێنەرانە (البنیویة التکوینیة) بەشێکی گرنگە لە بونیادگەریی گشتی، ئەم ڕەوتە لە ئەنجامی کۆششـی هەندێ لە روناکبیر و ڕەخنەگرە مارکسیسـتەکان دروسـت بوو، کە هەوڵیاندا گونجانێک برەخسـێنن لە نێوان تێزە فۆرمالیستەکانی بونیادگەری لەسەرێک و نێوان بنەماکانی بیری مارکسیزم لە ڕاڤەکردنی ماتریاڵییانەی فیکر و کولتوردا لەسەرێکی تر.

چەند بیرمەندێک بەشـداریان لە دارشـتنی ئەم ڕەوتەدا کردووە، دیارترینیان بیرمەندو ڕەخنەگری مارکسیسـتی مەجـەری (جۆرج لـۆکاچ ١٨٨٥-١٩٧١)ە. بەڵام یەکێک لەو نووسـەر و ڕەخنەگرانەی کە دواتر ڕۆڵێکی گەورەتریان لەو دارشـتنەدا هەبووە، ڕەخنەگری فەرەنسیی بەڕەچەڵەک ڕۆمانی (لوسیان گۆڵدمان ١٩١٣-١٩٧٠)ە.

تێزەکانی لوسـیان گۆڵدمان بە ڕوونی لە تێز و بۆچوونەکانی جۆرج لۆکاچەوە سەرچاوەیان گرتووە، لۆکاچ بەجۆرێک پەرەی بە تیۆری ڕەخنەیی مارکسیزم داوە کە ڕێگەی بۆ تەوژمێکی وەکو بونیادگەریی پێکهێنەرانـە کردەوە تا دەربکەوێت و پرۆسـەی کارە ڕەخنەییەکانی خـۆی، بەپێی بنەماکانی بیری مارکسـیزم، ئەنجام بدات، بەڵام گۆڵدمان سـوودی لە شـیکردنەوەی دەرونیش وەرگرت، بەتایبەتی لە لێکۆڵینەوە سـایکۆلۆژییەکانی زانای دەروونیی سویسـری (جان پیاجـێ ١٨٩٦-١٩٨٠)، گۆڵدمان دان

بەوەدا دەنێت کە زاراوەی بونیادگەریی پێکهێنەرانەی لە جان پیاجێ خواستووە.

لەڕاستیدا بونیادگەری پێکهێنەرانە، کە بەشێوەیەکی سەرەکی گۆڵدمان نوێنەرایەتیی دەکات، بریتییە لە کارلێک و ئاوێزانبوونی ژمارەیەک ئایدیاو تیۆرو فەلسەفە، مارکسیزم لەم ئاوێزانبوونەدا پێکهاتەیەکی سەرەکییە، لەتەک بۆچوونە فەلسەفییەکانی کانت و هیگڵ و تێزەکانی پیاجێ و جۆرج لۆکاچ.

گۆڵدمان لە هەموو ئەمانەدا ویستـــی ئەلتەرناتیڤێکی زانســـتی بۆ بونیادگەریی کلۆد لیڤی ستراوس (١٩٠٨- تا ئەم ســـاتەوەختەش لە ژیاندا ماوە) و فەلســـەفەی لوی ئالتۆسێر (١٩١٨-١٩٩٠) بدۆزێتەوە بۆ لێکۆڵینـــەوەی کۆمەڵگە و گۆڕانکارییەکانی کولتوری مرۆڤایەتی. ناکۆکیی گۆڵدمان لەگەڵ بونیادگەریی ســـتراوس و ئالتۆســـێردا، بریتییە لەوەی کە ئەو دوو بیریارە رۆڵی مرۆڤیان لە دروســـتکردنی مێژوودا فەرامۆش کردووە، بەتایبەتی لە ئەنترۆپۆلۆژیای ستراوسدا فەرامۆشکردنی فاکتەری مێژوو-وەک گۆڵدمان دەڵـــێ- هاوپەیمان بوو لەگەڵ کاپیتالیزم و قەیرانەکانیدا، چونکە رەتکردنەوەی مێژوو لە لێکۆڵینەوەی بونیاددا لە سۆســـیۆلۆژیای ئالتۆسێر و ئەنترۆپۆلۆژیای ستراوسدا، دەبێتە پاڵپشتێکی تیۆریی گەورە بۆ سیستمی نوێی کاپیتالیستی.

گۆڵدمان بەم شێوەیەی خوارەوە بونیادگەریی پێکهێنەرانە روون دەکاتەوە و دەڵێ: «ئەگەر بونیاد لە واقیعدا کاردانەوەکانی خەڵکی بۆ ئەو گیروگرفتە جیاوازانە دیاری بکات کە لە ئەنجامی پەیوەندیی نێوان خۆیان و ژینگە کۆمەڵایەتییەکەیاندا دروست دەبن، ئەوا ئەم بونیادانە، بەشێوەیەکی هەمیشەیی، رۆڵێکی چالاک دەبینن، بەڵام لەناو بونیادێکی گەورەتردا کە بریتییە لە بونیادی کۆمەڵایەتی. کاتێکیش بارودۆخ گۆڕانی بەســـەردا دێت، ئەوســـا چیتر ئەو بونیادانە ئەو رۆڵە چالاکە نابینن و بگرە ئەقڵانییەتی خۆیان لەدەست دەدەن، ئیدی چەند بونیادێکی نوێ و جیاواز شوێنی بونیادە بەسەرچووەکان دەگرنەوە».

گۆڵدمان وایدەبینێت ئەو پەیوەندییەی لەنێوان بونیادەکان و رۆڵەکاندا هەیە، بریتییە لەو هێزانەی مێژوو دەجوڵێنن. لێرەدا بونیادەکان ستاتیک و جێگیر نین، بەڵکو دینامیک و پڕ لە جووڵە و بزاوتن، بێگومـــان ئەم بیرۆکەیە لە بونیادگەریی ئەنترۆپۆلۆژیی ســـتراوس و بونیادگەریـــی زمانەوانیی رۆمان یاکۆپسنیشدا هەیە.

گۆڵدمـــان دەڵێـــت خەڵکی ئەو بونیادانە دروســـت دەکەن کە مانایەک بە مێژوو دەبەخشـــێت، جا لەبـــەر ئەوەی خەڵکی بوونەوەری کۆمەڵایەتین، ئەوا مەحکومن بە جۆرێک لە بیرکردنەوە کە روانینێکی تایبەتییان بۆ دنیا هەیە و ئەو روانینەش پابەندە بەو چینە کۆمەڵایەتییەی ئینتیمای بۆ دەکەن، کەواتە «روانین بۆ دنیا» بریتییە لە کۆی ئاڵۆزی ئەو بیروباوەڕ و هەســـت و خواســـتانەی ئەندامانی گروپێک یان چینێک پێکەوە دەبەستێتەوە، ئەو گروپە یان ئەو چینە هەمیشە لە ناکۆکیدا دەبێت لەگەڵ گروپە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەدا.

لـــە کاری ئەدەبیدا، بە تێڕوانینی رەخنەی بونیادگەریی پێکهێنەرانە، «روانین بۆ دنیا» بەشـــێک نییـــە لە داهێنانی خودی نووســـەر، بەڵکو بەشـــێکە لـــەو پێکهاتە مەعریفییەی گرێـــدراوە بە چینە کۆمەڵایەتییەکەیـــەوە، ئەم روانینە بۆ دنیا لە چەند پەیوەندییەکی دینامیکیی نێوان رەگەزەکانی کاری ئەدەبیدا، ئەو بونیادەیە کە لە نائاگایی نووســـەردا نیشـــتەجێ دەبێت، کەواتە ئەو بونیادە بریتییە لە روانینێـــک بۆ دنیا کە لە تێکســـتێکی ئەدەبیدا رەنگرێژ کراوە. لێـــرەدا گۆڵدمان بەڕوونی هەوڵ دەدات تێزەکانی مارکسیزم بهێنێتە نێو بونیادگەرییەوەو پێی وایە مارکسیزم بەشێوەیەکی قوڵتر و زانستی تر لە بونیادەکانی کۆمەڵگا، واتە لە سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگە، دەکۆڵێتەوە.

گۆڵدمان لە رەخنەی ئەدەبیدا، دوو نموونەی پراکتیکیی لەسەر هەردوو نووسەری فەرەنسی: باسکال

و راسین، پێشکەش کردووە، بەچەشنێک لێکۆڵینەوەی لەسەر کردوون کە کارەکانی بەستوونەتەوە بە هەلومەرجی ئەو چەرخەی کارەکانیان تیادا نووسـیوە، پاشـان لەمیانی گەڕان بەدوای بونیادەکانی ئەو دوو کارە ئەدەبییەدا، لەو کاریگەرییە کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژییانە ورد بۆتەوە کە بەسـیفەتی ڕوانین بۆ دنیا، واتە بونیاد، دەردەکەون.

ئەگەر بونیادگەری پتر بەدوای ڕێسـا و سیستمە ناوەکییەکانی تێکستی ئەدەبیدا بگەڕێت و، وەک قەوارەیەکی سـەربەخۆ مامەڵە لەگەڵ تێکسـتدا بکات و، لە کاریگەرییـە دەرەکی و کۆمەڵایەتییەکەی بترازێنێـت و، لە زمانی تێکسـتدا بەدوای بونیاددا بگەڕێت. ئـەوا بونیادگەری پێکهێنەرانە «ڕوانین» دەکات بە بونیاد و، تێکست دەهێنێتەوە بۆ نێو کۆنتێکستە کۆمەڵایەتییەکەی و، ئەدەب دەبەستێتەوە بە کۆمەڵگە و چینە کۆمەڵایەتییەکان. واتە تێکستی ئەدەبی بریتییە لە ڕوانین بۆ دنیا کە ئەو ڕوانینە دەلالەتێکی کۆمەڵایەتیی هەیە، لێرەدا تێکسـت، سـەرباری ئەو پەیوەندییە پتەوەی لەگەڵ کۆمەڵگەدا هەیەتی، بەڵام سـەربەخۆییەکی ڕێژەییشـی هەیە. بەکورتی تێکسـتی ئەدەبی-وەک گۆڵدمان دەڵێ-بریتییـە لە بونیادێکی بچووک کە لـە هەناوی بونیادێکی گەورەتر لەدایـک دەبێت، ئەویش بونیادی کۆمەڵایەتییە. لێرەوە میتۆدێکی نوێ سـەریهەڵدا بەناوی «سۆسیۆلۆژیای ئەدەب» کە گۆڵدمان بایەخ و برەوێکی زۆری پێداوە.

دەشـێت لە ڕەخنەی ئەدەبی عەرەبیدا، ئەم ڕەوتە لە ڕێبـازە ڕەخنەییە خۆرئاواییەکانی دیکە، پتر بـرەوی هەبووبێت، لەوانەیە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ هەژموونی تەوژمی چەپەکان و پارتە مارکسیسـتە عەرەبییەکان کە لە شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا کاریگەرییان لەسەر ئەدەب و بەگشتی کولتـوردا هەبـوو. ئەم ڕەوتە وەک میتۆدێکی ڕەخنەیی، لە لێکۆڵینـەوە ڕەخنەییەکانی محمد بەرادە و محمد بەنیس و یمنى العید پراکتیزە کراوە.

لە ڕەخنەی ئەدەبی کوردیشـدا، مەریوان وریا قانیـع، میتۆدی بونیادگەری پێکهێنەرانە لە چەندین لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی پراکتیکیدا بەکارهێناوە بۆ خوێندنەوەی تێکسـتی مەحوی و گۆران و شـێرزاد حەسەن و محەمەد عومەر عوسمان.


## سەرچاوە:

١- د.میجان الرویلی و د.سعد البازعی، دلیل الناقد الادبی، المرکز الثقافي العربی، الدار ألبیضاء المغرب، ط٥، ٢٠٠٧.

٢- د.شکری عزیز ماضی، فی نظریة الادب، المؤسسة العربیة للدراسات والنشر، بیروت-لبنان، ٢٠٠٥.

٣- اوزالدو دیکرو-جان ماری سشـایفر، القاموس الموسوعي الجدید لعلوم اللسان، ترجمة: د.منذر عیاشی، المرکز الثقافي العربي، الدار البیضاء- المغرب، ص٢، ٢٠٠٧.

٤- د.محمد آلتونجی، المعجم المفصل فی الادب، دار الکتب العلمیة، بیروت-لبنان، ط٢، ١٩٩٩.

# من کێم؟

فردريك نيچه
لە عەرەبییەوە: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل

(1)

لەبەرئـــەوەی لەداهاتوویێکـــی نزیکدا مرۆڤایەتی دەخەمە بـــەردەم ئەرکێکی زۆر گەورە کە پێشـــتر بوونی نەبووە، بۆیە پێم وایە پێویستە پێتان بڵێم کە من کێم. ئەگەرچی لە واقیعدا خەڵک خۆی دەبێت بزانێت من کێم و زانیاریان هەبێت لەبارەی منەوە، چونکە من هەرگیز ڕێگام بەخۆم نەداوە نادیارو شاراوەو ون بم.

لەگەڵ ئەوەشدا، نەبوونی هاوسەنگی لەنێوان گەورەیی و مەزنی ئەو ئەرکەی من شـــانم داوەتە بەری، لەگەڵ هیچ و پووچی خەڵکانی هاوچەرخ و سەردەمی خۆمدا، لەوەدا بەرجەستە بووە کە ئێستا من گوێم لێناگیرێت، بگرە ناشبینرێم.

من ئێســـتا لەسەر پاشماوەی ئەو شـــتە دەژیم کە خۆم بۆخۆمم دروستکردووەو پێکهێناوە، بگرە دەشـــێت بیرۆکەی ئەوەی کە من هێشـــتا زیندووم و دەژیم، هەر تەنیا بیرۆکەیەکی پێشینەییانە بێت و لەوە زیاتر نەبێت.

بۆ من، ڕەنگە هەر ئەوەندە بەس بێت لەگەڵ یەکێک لەو کەسە فێربووانەدا بدوێم کە هاوینان بۆ کات بەســـەربردن دێنە ئەنگادیـــای باڵا، تاوەکو ئیدراکی ئەوە بکەم کە زیندوو نیم.

لـــەو جۆرە بارانەدا، پێدەچێت ئەرکی سەرشـــانم بێت کارێک بکەم کە لەواقیعدا زۆرتر لـــە کبریائم، خوو و ڕەفتارەکانم دەوروژێنێـــت. ئەویش ئەوەیە بڵێم: گوێم لێبگرن! من فلانی کوڕی فلانم، من لەگەڵ کەسێکی تر تێکەڵ مەکەن!

(2)

بۆ نموونە، من هەرگیز تۆقێنەرو ترسێنەر نیم، من داهۆڵ نیم، هەروەها غۆلێکی ئەخلاقیش نیم، بەڵکو من تەواو پێچەوانەو دژکارم لەگەڵ ئەو جۆرە مرۆڤەی کە تا ئێستاش خەڵک وەکو نموونەی چاکەکاری پیرۆزیان دەکەن و ڕێزیان دەگرن.

با لەنێوان خۆم و ئێوەدا بڵێم، ئا بەوردی ئەوە یەکێکە لەو شتانەی کە لەنێو کەسایەتی خۆمدا شانازی پێوە دەکەم، چونکە من قوتابی دیۆنیزیۆسم و ئەگەر قەشەرجاربم، پێم باشترە لەوەی کەسێکی پیرۆزو قەدیس بم. کەواتە با خەڵک ئەو دەقە بخوێننەوەو! ڕەنگە منیش لە کارو فرمانەکەی خۆمدا سەرکەوتوو بووبم، خۆ ڕەنگە ئەو کارە هیچ مەبەستێکیشی نەبووبێت، تەنیا گوزارشتێکی دڵخۆشکەرانەو خۆشەویستانە نەبێت لەو ناکۆکی و دژکارییە.

دوا شت کە بەخەیاڵمدا هاتبێت و بەڵێن بدەم بیهێنمە دی، مەسەلەی چاکسازی و چاککردنەوەو ڕاستەرێکردنی مرۆڤایەتییە، چونکە هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە. بەڵام با ئەوەشتان پێبڵێم، من نایەم بتی نوێ دروستبکەم و بونیادبنێم، با خەڵکانی کۆنیش بزانن ڕەپی سەر دوو پێی لەێلیال دروستکراو چ کارەساتێک بەدوای خۆیدا دێنێت.

شکاندنی بتەکان ــ کە جوانترین وشەیە لەلای خۆم بۆ گوزارشتکردن لەو ئایدیایانە ــ کارو پیشەی منە، چونکە هەر کە درۆی جیهانی ئایدیا داهێنرا، ئەوە واقیع لە بەهاو ماناو حەقیقەتەکەی خۆی داماڵرا، جیهانی ڕاستەقینەو جیهانی بەرجەستەبوو و دیار. یا بەمانایەکی ڕوونتر، جیهانی داهێنراوو جیهانی واقیعی.

درۆی ئایدیاکان تا ئێستاش نەفرەتێکە باڵی بەسەر واقیعدا کێشاوەو لەمیانەیدا مرۆڤایەتی خۆی شێوێنراوو ساختەبووە، تەنانەت لەنێو غەریزە هەرە قووڵەکانیشیدا، ساختەییەک گەیشتۆتەی ڕادەی پیرۆزکردنی بەهای ئاوەژووکراوو پێچەوانەی دژکارو ناکۆک بەوەی کە دەتوانێت گرێنتی گەشەکردنی ئاییندەو مافی پیرۆزکردنی ئاییندەمان پێبدات.

(3)

هەرکەسێک بزانێت چۆن لەو هەوایە هەڵمژێت کە پڕە لەنێو کتێبەکانمدا، ئیدراک بەوە دەکات ئەوە هەوای شوێنە بەرزەکانە، هەوایەکی زۆر تیژە، مرۆڤیش دەبێت ڕاهاتبێت لەسەر ئەو جۆرە کەش و هەوایە، ئەگینا مەترسییەکی زۆری تووش دێت، مەترسی ئەوەی سەرمای بێت. بەستەڵەک نزیکە، تەنیاییش تۆقێنەرە، بەڵام شتەکان چەندە هێمن دیارن کاتێک لەژێر ڕۆشناییدا ڕادەکشێن! مرۆڤیش بە چ ئازادییەک هەناسە دەدات! چەند شتیش هەیە مرۆڤ لەژێر خۆیەوە هەستیان پێدەکات!

فەلسەفە وەکو ئەوەی من بەردەوام تێیدا ژیاوم و تێیگەیشتووم، بریتییە لە ژیانێکی خۆبەخش و هەڵبژێردراو لەنێو بەستەڵەک و سەر شاخە بەرزەکان، گەڕانە بەدوای هەموو شتە نامۆو ئیشکالییەتەکانی نێو بوون ــ DASEIN، هەموو ئەو شتانەی تا ئێستا پەراوێزو دوورخراوە بوون لەلایەن ئەخلاقەوە.

ئەزموونێکی زۆرو دوورو درێژم هەیە لە گەڕان و ڕۆچوون بەنێو پنتە قەدەغەکراوەکاندا، ئەوە فێری

کردووم تەماشـــای هۆکاری شاراوەی پشـــت کردە ئەخلاقییەکان بکەم، تەماشای هۆکاری شاراوەی پشت ئایدیاکان بکەم و بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی باوو ئارەزوو پێکراوو قبوڵکراوە لێیان بڕوانم. بەو شێوەیە من مێژووی شاراوەی فەلسەفەکارو سایکۆلۆژیای فەلسەفەکارە گەورەکانم بۆ دەرکەوت.

عەقڵ دەتوانێت تا چ ڕادەیەک و چەندە بەرگەی حەقیقەت بگرێت؟ چەندو تا چ ڕادەیەک عەقڵ ئازایەو دەتوانێت ڕۆبچێتە پێشـــەوە؟ ئەوە پێوەرەکانی حەقیقەتە کە من زیاترو زیاتر پشتیان پێدەبەستم بۆ هەڵســـەنگاندن. بەهەڵەداچوون ـ بڕواهێنان بە ئایدیاکان ـ کوێری نییە، بەهەڵەداچوون ترسنۆکییە، هەموو کردنەوەیەکی تازەو نوێش، هەموو هەنگاوێک بۆ پێشـــەوە لە بواری مەعریفەدا، لە ئازایەتییەوە سەرچاوە دەگرێت، لە توندی بەرانبەر بەخود، لە پاکی و بێگەردی بەرانبەر بەخود.

من ئایدیاکان پووچەڵ ناکەمەوە، بەڵکو هەر ئەوەندە دەکەم، بەدەســـکێش دەیانگرم کاتێک کاریان لەســـەر دەکەم. چاو دەبڕم و دەڕوانمە هەموو شـــتێکی قەدەغەکراو، ئەو ناونیشـــانەیە کە ڕۆژێک دێت سەرکەوتن بۆ فەلسەفەکەی من مسۆگەر دەکات، چونکە تاوەکو ئەمڕۆش، تەنیا حەقیقەت بەشێوەیەکی جەوهەرییانە قەدەغەکراوە.

(4)

لەنێو هەموو کارو کتێب و نووســـینەکانمدا، زەردەشـــتەکەم پێگەیەکـــی تایبەتی هەیە، لەمیانەیدا مرۆڤایەتی گەورەترین دیاری وەرگرت کە تا ئێستا دیاری وای پێنەگەیشتبوو. ئەو کتێبە، بەو دەنگەی کە هەزاران ســـاڵ دەبڕێت، هـــەر تەنیا مەزنترین کتێب نییە، بەڵکو کتێبێکـــی باڵایە ـ پێدەچێت کە سەرجەم واقیعی مرۆڤایەتی لەژێریداو بەمەسافەیەکی خەیالی ڕاکشابێت ـ ئەوە کتێبێکی هەرە قووڵە، کتێبێکە لە قووڵایی نهێنی گەنجینەکانی حەقیقەتەوە هەڵدەقووڵێت، بیرێکە وشـــک نابێت، هەرکاتێک دۆلکەیەک شۆڕبکرێتە خوارەوە، بەپڕی لە زێڕو خێرو بەرەکەت هەڵدەکێشرێتە سەرەوە.

ئەوەی ئێستا قسە دەکات خۆ پێغەمبەر نییە، یەکێکە لەو بوونەوەرە شێواوانەی پڕە لە نەخۆشی و ویستی دەسەڵات، ئەوانەی خەڵک ناویان دەنێن دامەزرێنەرو ڕێبەری ئایینەکان. پێویستە لەسەر مرۆڤ پێش هەموو شـــتێک گوێ لەو دەنگە بگرێت کە لەو دەمە دێتە دەرەوە، دەنگێکی هێمن و سەکینەت و ئارام بەخش، تاوەکو لە نیازپاکی خۆیەوە بەهەڵە لە مانای حیکمەتەکانی تێنەگات. « ئەوە وشە هەرە هێمنەکانن کە ڕەشەبا لەگەڵ خۆیاندا دێنن، ئەو وشانەش کە لەسەر پێی کۆتر دەڕۆن، ئەو وشانەن کە دونیا بەڕێوە دەبەن و ڕابەرایەتی دەکەن».

« بـــەری هەنجیر لە درەختەکانـــدا دەکەوێتە خوارەوە، هەنجیرێکی زۆر خۆش و شـــیرینە، لەگەڵ بەربوونەوەیدا پەلکە سوورەکەی شەق دەبێت.

من هەوای باکوورم بۆ ئەو هەنجیرانە.

بـــەو شـــێوە، وەکو بەری هەنجیر، ئـــەی هاوڕێیان ئەو ڕێنماییانەش بۆ ئێـــوە دێتەخوارەوە: کەواتە شـــیلاوە خۆشـــەکەی بنۆشـــن و هەنجیرەکە بخۆن! پاییز لێمان نزیکەو بێگەردی ئاســـمان و ئێوارەش دەورەیان داوین».

ئەوەی لێرەدا دەدوێت کەسێکی توندڕەو نییە، نە نقوورچە لەکەس دەگرێت و نە داوای بڕواهێنانیش دەکات.

دڵۆپ دڵۆپ، وشه به وشه، له مەودای بێکۆتایی ڕۆشنایی و بیری هەره قووڵی بەختەوەرییەوە وشەکانی ئـــەو وتاربێژییە هەڵدەقوڵێت، هێمنییەکی ناســک ڕیتمی ئەو وتارەیە. تەنیا کەســـە هەڵبژێردراوەکان دەتوانن ئەو شـــتانە دەسگیر بکەن، ئەوەش دەسکەوتێکی هەرە گەورەیە کە مرۆڤ لێرەدا گوێگر بێت. بەهەرحاڵ، هیچ شـــتێکمان لەبەردەستدا نییە تەنیا گوێگرتن نەبێت لە زەردەشت، باشە ئەی زەردەشت خۆی سەروەرو گەورەی سەرنجڕاکێشان نییە؟

بەڵام باشـــە ئەو خۆی چـــی دەڵێت کاتێک بۆ یەکەمجار دەچێتەوە نێـــو تەنیاییەکەی خۆی؟ تەواو پێچەوانەی هەموو حەکیمێک و قەدیســـێک و ڕزگارکەرێک، یا هەر کەســـێکی هیچ و پووچ لە ڕەوشێکی ئاوادا دەدوێت و قســـە دەکات. ئەو نەوەکو هەر تەنیا بەشـــێوەیەکی جیاواز قســـە دەکات، بەڵکو ئەو خۆیشی تەواو جیاوازە.

« ئێستاش ئەی پێڕەوکارو هاوڕێیانی من، بەتەنیا بڕۆن! ئێوەش ئەی ئەو کەسانەی ئێستا لەمەودوا بەتەنیا دەڕۆن! من ئەوەم ویست بۆتان.

بڕۆن و وازم لێبێنن و ئاگاداری خۆتان بن لە زەردەشـــت! لەوەش زیاتر، شـــەرم لەوە بکەن کە دوای کەوتبوون، خۆ دەشێت فێڵی لێتان کردبێت و ئێوەی فریودابێت.

پێویســـت نییە مرۆڤی زانا بەتەنیا دوژمنەکانی خۆی خۆشـــبووێت، بەڵکو دەبێت بتوانێت ڕقی لە هاوڕێکانی خۆیشی ببێتەوە.

ئەوە پاداشـــتێکی زۆر خراپە بۆ مامۆســـتا کە مرۆڤ بەردەوام قوتابی ئەو بێت، بۆ ناتانەوێت کۆتی من بشکێنن؟

ئێـــوە ڕێزی مـــن دەگرن و بەرزو پیرۆزم ڕادەگـــرن، بەڵام چی ڕوودادەت ئەگـــەر ڕۆژێک ئەو بەرزو پیرۆزییەی من داڕما؟ ئاگاتان لەخۆتان بێت بتێک نەتانکوژێت!

ئێوە دەڵێن کە بڕواتان بە زەردەشـــت هەیە؟ بەڵام گرنگی زەردەشت خۆی چییە؟ ئەوە گوتمان ئێوە بڕواتان بەمن هێنا، بەڵام گرنگی ئەو هەموو خەڵکە بڕواهێنەرە چییە؟

ئێوە هێشـــتا بەدوای خۆتاندا نەگەڕاون: بەو شێوەیە منتان دۆزیوەتەوە. هەموو خەڵکە بڕوادارەکان وا دەکەن. بۆیە بڕواهێنان شتێک نییە جێگای گرنگی و بایەخ بێت.

ئێســـتاش داواتان لێدەکەم من ون بکەن و خۆتان بدۆزنەوە، من جارێکی تر ناگەڕێمەوە لاتان، تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە ئێوە هەمووتان منتان لەبیرکردووەو ڕەتتان کردوومەتەوە».

## سەرچاوە:

فردريش نيتشـــه، هذا هو الأنســـان ــ ECCE HOMO، ترجمة: علي مصباح، منشـــورات الجمل، الطبعة الثانية، ٢٠٠٦.

# بونیادگەریی و سیمانتیکا
# لە نزیککاریی ریتمی شیعردا

د. شاهۆ سەعید

تیورســـازانی جوانناسی و رەخنەی ئەدەبی، لە ســـەردەمی ئەرستۆوە تائێستا، باســـیان لە چەمکی بونیاد کردووەو لە گۆشـــەنیگای جیاوازەوە جەختیان لەســـەر بایەخی بونیاد کردووە لە پرۆسەی شیکردنەوەی کاری ئەدەبیدا[١].

لە زمانە ئەوروپییەکاندا وشەی بونیاد یان (سترەکتور) لە رەگە لاتینیەکەیەوە وەرگیراوە (STUERE)، کە بەمانای شـــێوازی دامەزراندنی شوێنی نیشتەجێبوون دێت. پاشان ئەم وشەیە بەکارهێنانی فراوانتری بەخۆوەبینی و بۆ شێوازی بەکارهێنانی پێکهاتەکانی بونیاد بەکارهات لە گۆشـــەنیگای هونەری تەلارســـازی و جوانسازیی شـــێوەکاریی لەو هونەرەدا. لە فەرهەنگی زمانـــە ئەوروپیەکاندا هاتووە کە هونەری تەلارسازی لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەیەمەوە ئەم وشەیەی بەکارهێناوە[٢].

وشـــەی بونیاد کە ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەکاریدێنین، لە وشەی (بنیە)یان (بنـــاء)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە، کە لە دەقە عەرەبییە کۆنەکاندا بەمانای پەیکەری ئاخاوتن هاتووە. قودامەی کوڕی جەعفەر لەبارەی یەکەمیانەوە وتوویەتی: «بونیادی شـــیعر بریتیە لە تەسجیع و سەرواســـازی، تا زیاتر شیعر پەنایان بۆ بەرێ زیێتر دەچێتە خانەی شـــیعرەوەو زیاتر لە ڕێچکەی پەخشان دەترازێ»[٣].ئیبن تەباتەبا دووەمیانی بۆ هەیکەلی چامەی شیعریی بەکارهێناوە، پێیوابووە وتەو ماناو سەرواو کێش پێکەوە دەچنە خانەی بونیادەوە، هەروەها بونیادی شیعری بەستۆتەوە بەکاری نیگارکێش و گەوهەرســـازەوە[٤]. لە کەلەپوری رەخنەیی فارسیشدا شەمسی قەیسی رازی وشـــەی بونیادی بەکارهێناوەو وتویەتی: «بونیادی ئاخاوتنی پەخشانئامێز لە

رستەگەلێکی تێهەڵکێش و پێکەوەلکاو پێکدێ، بەڵام بونیادی ئاخاوتنی شیعرئامێز لە رستەگەلێکی لێکترازاو، هاوکێش و هاوکۆتایی پێکدێ، بەپێی چەند پێوەرێکی رێکوپێک، ئەو ڕستانە پێیاندەوترێ بەیت و ئەو کۆتاییانەش پێیاندەوترێ سەروا»[٥].

بەڵام لە رەخنەی مۆدێرندا زاراوەی بونیاد بەکارهاتووە وەک رەوتێک لە پەیوەندیی ناوەکی بەپێی پرنسیپی ئەولەویەتی گشت بەسەر بەشدا لێی تێدەگەین، کە یاسای تایبەت بەخۆی هەیە وەک رەوتێک کە یەکێتی ناوەکی و پێکەوەگونجانی زاتیی تێدایە، بەجۆرێک هەر گۆڕانێک لە پەیوەندیەکاندا دەبێتەهۆی بەرپابوونی گۆڕان لە سەرلەبەری رەوتەکەدا[٦].

زاراوەی بونیاد بەو شێوەیەی ئێمە مەبەستمانە، زاراوەیەکی مۆدێرنە، هەرچەندە ئەرستۆ لەژێر ناونیشانی یەکێتی ئۆرگانی چامەی شیعریدا ئاماژەیەکی پێداوە[٧]. یەکێتی ئۆرگانی لای ئەو بریتی بووە لە یەکێتی کاردانەوەی هەست لەئاست بابەتی دەقدا، کە لە رێکخستن و پلەبەندیی وێنەکان و بیرۆکەکانی بابەتی شیعریدا رەنگدەداتەوە، ئەو رێکخستن و پلەبەندییەش بە کۆتاییەکی گونجاو دەگا، تا بەشە جیاوازەکانی دەق لە وێنەی بونیادێکی زیندوودا بەرجەستەبن، کە هەر بەشێک فەرمانی تایبەتی خۆی هەیەو لەگەڵ فەرمانی بەشەکانی تردا زنجیرەیەکی یەکبەدوایەک لە هەست و هزر پێکدێنن[٨]. هەر لەمبارەیەوە رەخنەگرە کۆنەکان جەختیان لەسەر هەردوو توخمی بەیەکدواهاتنی ریتمئامێزو پێکەوەگونجانی وتەو مانا کردۆتەوە، وەک دوو توخمی پێکهێنەری دەقی شیعریی[٩].

بەڵام بابەتی وتەو مانا، یان فۆرم و ناوەرۆک، کە لە رەخنەی کۆن و تەنانەت تازەشدا، رووبەرێکی بەرفراوانی داگیرکردووە... ناکرێ بڵێین مانای (بونیاد و دەلالەت) دەگەیەنێ بەو جۆرەی رەخنەی مۆدێرن مەبەستیەتی؛ چونکە چەمکەکانی وتەو مانا یان فۆرم و ناوەرۆک، کە میراتی رەخنەیی وەک دوو قەوارەی سەربەخۆ تەماشای کردوون، لەڕاستیدا لە دۆخێکی لێکئاوێزانی پێکەوەگرێدراودان، کە لێکجیاکردنەوەیان مەحاڵە؛ خوێنەر یان گوێگری دەقی شیعریش ناتوانێ لەکاتی وەرگرتنی کاری هونەری یان ئەدەبیدا هەستبکا ئەوەی وەریدەگرێ ناوەرۆکە بەتەنها یان فۆرمە بەتەنها[١٠]. ناتوانین دەربارەی چەمکی بونیاد، بەمانا زاراوەییە تازەکەی، قسەبکەین بەبێ باسکردنی ئاستە سیمانتیکی یان دەلالیەکەی، کە دواتر قسەی لەسەر دەکەین.

لێرەوە، چەمکی بونیاد وێناکردنێکی ئەقڵییە و زیاتر لە پەتیکردن و تەجریدەوە نزیکە نەک دەستنیشانکردن، بونیاد ئەو شتەیە کە وێنای دەکەین لەکۆی پەیوەندیی نێوان شتەکان، نەک خودی شتەکان. بۆیە دەکرێ بڵێین ئەم وێناکردنە پەیوەندییەکی نائاگاییانەیە، خۆی لەخۆیدا دەرناکەوێ، بەڵکو شوێنەوارو بەرەنجامەکانی بەرجەستەی دەکەن[١١].

بونیادی دەقی شیعریی ئەندازەیەکی زۆر چڕیی و تێکرژانی تێدایە، لەیەک کاتدا چەندین جەمسەر پێکەوەدەبەستێ[١٢]، لە هەموو ئاست و بونیادەکانیشیدا -وەک جاکۆپسن دەڵێ- پشتئەستوورن بە پرنسیپێکی گشتی کە پرنسیپی هاوشێوەیی، هاوتەریبی و هاودژییە[١٣]. دەکرێ بڵێین ئاست و بونیادەکانی پێکهاتەی گشتی دەقی شیعریی، بەگوێرەی ئەو پرنسیپانەی باسمانکردن، بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێندەکرێن:

-بونیادی دەنگسازی (ئاستی فۆنۆلۆجی): کە لەرێگایەوە دەکرێ لە دیاردەکانی وەک هاودەنگی، ریتمی بیستراو، دووبارەبونەوەی فۆنیمێک یان پیتێکی دیاریکراو لە بەیت یان دێڕ یان دەقی شیعریی بەگشتی... وردبینەوە.

-بنیاتی وشەسازی (ئاستی مۆرفۆلۆجی): کە لەرێگایەوە دەکرێ لە دیاردەی بونیادی وشەو ئاستی

بەشداریکردنی لە ئەفراندنی ڕەوتەکانی هاوشێوەیی و هاودژی لە دەقدا بکۆڵینەوە.

-بونیادی رستەسازی (ئاستی سینتاکس): کە هاریکاریمان دەکا بۆ سەرنجدان و وردبوونەوە لە پێگەی وشەکان لە سیاقی گشتی ئەو رستانەی بنەڕەتی و ئەو رستانەی لە گۆڕاندان، هەروەها بۆ دەستنیشانکردنی فۆرمەکانی گەمەو لادان لە ڕەوتی بنەڕەتیی زمان.

-بنیادی پێکهاتەیی: لە ڕێگایەوە سەرنجی پەیوەندییە سیاقیەکانی نێوان فرێزو رستەکان و پێکەوەلکانە بنەڕەتی و لاوەکییان دەدەین.

-بونیادی ڕەوانبێژی (ئاستی بەلاغی): کە پەیوەندیدارە بەسەرنجدان لە دیاردە ئیستاتیکی و نمایشگەریەکانی وەک چواندن، میتافۆر، هاوتەریبی، هاودژی و ئیدیۆم و...هتد[١٤]

-بونیادی فەرهەنگیی (ئاستی موعجەمی): ئەمیش پەیوەندیدارە بە سەرنجدان لەو گۆڕانکاریانەی بەسەر پێکهاتەی فۆنیمەکان و ریتمدا دێن، چونکە واتای وشەکان بە جیاوازی وتەکانیان گۆڕانیان بەسەردێ. هەرچەندە ئەو وشانە لە بنەڕەتدا بەشێوەیەکی ڕەمەکی دروستبوون، بەڵام دواتر بەرگێکی سیستماتیکیان پۆشیوەو خەڵکی لەسەری ڕێککەوتوون، هەربۆیە هەرگۆڕانێک لە وتەدا گۆڕانێک لە واتادا بەدوای خۆدا دێنێ[١٥].

هەرچەندە ئەو ئاست و بونیادە جیاوازانەی سەرەوە، کە تزفیتان تۆدۆرۆف ناویان دەنێ (ڕۆڵە زمانەوانیەکان)، لەیەکدی جیاناکرێنەوە چونکە هیچ کامیان بەهای سەربەخۆیان لەناو خۆیاندا نیە، بەڵکو تەنها ئامرازی پێکەوەلکاندنن[١٦]... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێ چاو لە بایەخی ئەو ئاستانە بپۆشین، کە هەریەکەیان هەڵگری بارگەی سیمانتیکی خۆیانن و لە پەیوەندیی دیالیکتیدان لەگەڵ ئاستەکانی تردا. لێکۆڵینەوەش دەربارەی شیعر پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە لە بەشە جیاوازە پێکهێنەرەکانی دەق و بەقسەهێنانی ئاستە دەلالیەکانیان، لەپێناو بەدەستهێنانی ئاستی دەلالی گشتی.

هەرچی بونیادی ریتمیشە لە شیعردا، کە ئاستێکە لە ئاستەکانی بونیادی دەقی شیعریی بەگشتی، یەکێکە لە بایەخدارترین و دیارترین توخمە دەلالیەکان، چونکە تەنها بەرجەستەکەری ئاستی دەنگسازی (فۆنۆلۆجی) نیە، بەڵکو بەرجەستەکەری ئاستە مۆرفۆلۆجی و پێکهاتەیی و بەلاغیەکانیشە... هەموو ئاستەکانیش پێکەوە ڕەوتگەلێکی هاوشێوەیی و هاودژی یەکتەواوکەر پێکدێنن، کە ئەوانیش لای خۆیانەوە بونیادی ناوەکی بیستراو پێکدێنن. ئاستێکی تری بەرجەستەبوونی بونیادی ریتمی شیعریی، بریتیە لەو ڕەوتانەی زادەی وێناکردن و بیرۆکەو هەڵوێستە زەینیەکانن، کە ئەوانیش لای خۆیانەوە پەیوەندیی چونیەکی و هاودژی بەرهەمدێنن لە بازنەی پرۆسەکانی وێناکردنی زمانەوانیدا، واتە ئەم ڕەوتە بواری هەستەکان جگە لە هەستی بیستن بەرهەمدێنێ، ئەو کاتەی بیستن دەبێتە ئامرازێک بۆ گواستنەوەی ئاماژەی هەستەکانی تر، وەک وێناکردن و بینینی زەینی[١٧]... کە سەرەنجام ریتمی زەینی دروستدەکەن و فەزای شیعر پێکدێنن.

بونیادی ریتم لە دەقی شیعریدا، ئەو بونیادەیە کە ئەزمونی شیعریی لەخۆدەگرێ، یان بەلایەنی کەمەوە بەشی هەرەزۆری لەخۆدەگرێ؛ بەڵام چەمکێکی لە جۆری (بونیادی ریتم) هەڵگری کێشەو ئاڵۆزییەکی زۆرە، چونکە خودی (ریتم) چەمکێکی سانا نیەو ناتوانین لە جوغزێکی دیاریکراودا لەسەری بدوێین یان دەستنیشانی بکەین. بۆ نمونە بونیادی ریتم لە شیعری کۆندا بونیادێکی پتەو و جێگیرە لەسەر ئاستی فۆرمسازی دەرەکی، بەپێچەوانەی شیعری ئازادەوە کە شێوەیەک لە جیوەیی و ناجێگیری لە فۆرمە دەرەکیەکەیدا هەیە. بەڵام لەراستیدا ئەم جیاوازییە تەنها پەیوەندیی بە چۆنایەتییەوە هەیە لە بەگەڕخستنی ریتمدا، نەک ڕەتکردنەوەی. چونکە تەنانەت خودی ئەو فۆرمە ریتمییەی کە پەخشانە

شیعرییش پەنای بۆ دەبا، بەمەبەستی روخاندن و یاخیبوون لە یاساکانی کێشناسی، فۆرمێکە ملکەچی یاســا ئاڵتەرناتیڤەکانی ریتمی نەریتییە، تاوەکو بەتەواوی نەچێتە دۆخی (دژەفۆرم یان دژەئۆرگانی)، ئەو فرێزەی کە خاتو سۆزان بێرنار بەکاریهێنا[١٨].

لــە ڕووی فۆرمســازیی دەرەکییــەوە، چەنــد بونیادێکی ریتمئامێزی شــیعر هەن، کــە ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەســەر سێ بونیادی سەرەکیدا دابەشــی دەکەین؛ ئەوانیش: بونیادی ریتمی ستوونی، بونیــادی ریتمی ئازاد و بونیادی ریتمی کراوە. یەکەمیان پێکهاتەیەکی جێگیری هەیە، بەڵام دوانەکەی تر تێکەڵی یەکتر دەبن و ســوود لە توخمەکانی بونیادی یەکەمیش وەردەگرن. هەربۆیە بەمەبەســتی تێکەڵاونەکردنی ئەم ســێ جۆرە بونیادە لەڕووی پێکهاتەو تێگەیشــتنی زاراوەییەوە، بەو جۆرەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا هاتووە، ئەم پێناسە بەرایییانە بۆ هەرسێ بونیادەکە پێشکەش دەکەی:

یەکەم/ بونیادی ریتمی ســتوونی: بونیادێکی نەریتیی کۆنە؛ لەسەر بنەمای یەکێتی کێش، یەکێتی بەحر، یەکێتی ســەرواو یەکێتی رەوی (پیت یان بڕگەی بەر لە دواپیتی ســەروا) دامەزراوە بەگوێرەی پێوەرەکانــی عەروز و ســەروا. هەندی جار پشتئەســتورە بە هاوتایی ژمارەی بڕگــەکان لەنێوان دێڕو بەیتەکاندا لەو شــیعرانەدا کە کێشیان بڕگەییە. بەهەمان شــێوە مەسنەوی، چوارینە، پێنجخشتەکی، موسەممەت و پێکهاتە شــیعرییە تەقلیدیەکانی تریش، کە پێوەری جێگیری ئیقاعیی جڵەویان دەکا، دەچنە خانەی هەمان بونیادەوە.

لە شــیعری کۆندا پێکەوەگونجانی ریتم پرۆســەیەک بوو لە بچووکترین (یەکە)وە دەستیپێدەکرد، کە جووڵەو وەســتان بوو، پاشــان ئەو بچووکترین (یەکە)یــە وردە..وردە دەچووە یەکەی ریتمئامێزی گەورەترەوە تاوەکو کێش بەتەواوی لە بەیتدا بەرجەســتەدەبوو، هەربۆیە گرنگترین مەرجی شــیعریی لای رەخنەگــرە کۆنــەکان بریتیبوو لە پێکەوەگونجانی نێوان تەفعیلــەکان[١٩]. لێرەوە تەفعیلە بەتەنها یەکــەی بنەڕەتیی بونیادی ریتــم نیە، بەڵکو پەیوەندیی نێوان تەفعیلەکان بازنەی گەورەی ئەو بونیادە دەســازێنێ، واتە بایەخی تەفعیلە لەناو خۆیدا نیە، بەڵکو لەناو بەیتدایە کە زەمینەی ئەو پەیوەندیە ئامادەدەکا[٢٠].

دووەم/بونیادی ریتمی ئازاد: واتە ئەو بونیادەی کە ملکەچی پێوەرێکی ئیقاعیی جێگیرو پێشوەخت نیە، بەڵکو خاوەنی پێوەرێکی رێژەییە کە بەجیاوازیی دەقەکان گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەم جۆرە ریتمە ئامادەیــی زۆری لەو دەقە شــیعرییە ئازادانەدا هەیە کە فرەســەروان و پەیوەندیی نێوان تەفعیلەکان تیایاندا چونیەک نیە، یان لەهەندێ دێڕەکانیدا چونیەکی لە ژمارەی بڕگەکاندا هەیە، بەڵام لە هەموویاندا ئــەو چونیەکییە نیە. شــاعیرێک کە ئەم جۆرە بونیادە پێڕەودەکا ئــازادە لەوەی چ یەکەیەکی ریتم بۆ بەشــە جیاوازەکانــی دەقەکەی هەڵدەبژێرێ، بەڵام ئــازاد نیە لەوەی بونیادی دەرەکــی ریتم بەتەواوی هەڵبوەشــێنێتەوە، یان یەکێتی تەفعیلە لەو دەقە شــیعرییە ئازادانەدا هەڵبوەشــێنێتەوە کە لەسەر بنەمــای ئەو یەکێتییە دامەزراون. لەم جۆرە بونیادەدا ریتم بەســەر یەکەگەلێکی بچوک و گەورەدا یان دێڕگەلێکی کورت و درێژدا دابەشــدەبێ، بەڵام ســەرواکان بەپێی ســیاقی پێکهاتەیی دەق هەندێ جار چونیەک و هەندێ جاریش جیاوازن.

سێهەم/بونیادی ریتمی کراوە: واتە ئەو بونیادە شیعرییەی کە ملنادا بۆ هیچ جۆرە پێوەرو یاسایەکی جێگیرو پێشوەخت، بەڵکو قابلی تازەبوونەوەو گۆڕانی بەردەوامە، خەسڵەتی ریتمئامێزی لەم بونیادەدا زادەی پێکەوەگونجانی نێوان بەشە دەرەکیەکانی ریتم و پێوەرە فۆرمیەکانی دەق نیە، بەڵکو هەڵقوڵاوی هارمۆنییەکی ناوەکیی بزۆکە کە یاساکانی پاشوەختن نەک پێشوەخت، واتە بەگوێرەی پێداویستیەکانی

ســـیاق و لە چرکەساتی ئەفراندنی شیعردا لەدایکدەبن، ئەم جۆرە بونیادە کە پەخشانە شیعری لەسەر دادەمەزرێ، لە هیچ فۆرمێکی دیاریکراودا کە پێشتر بڕیاری لەسەر درابێ ناسرەوێ[٢١].

جیاوازیی نێوان ئەم بونیادەو بونیادی ریتمی ستوونی لەوەدا بەرجەستەدەبێ کە وەک ئەو ملکەچی یاساگەلێکی ئیقاعیی پێشوەخت نیە، بەڵام جیاوازیی لەگەڵ بونیادی ریتمی ئازاددا لەوەدایە کە ریتمی ئازاد ســـەرەڕای ناوەکەی پابەندە بە جۆرە پێوەرێکەوە کە لە چرکەســـاتی ئەفراندنی یەکە بەراییەکانی دەقی شیعریدا ئەویش لەدایکدەبێ.

دەکرێ دەستنیشـــانکردنی نەخشەی بونیادی ریتم لەسەر ئاســـتە ناوەکی و زەینیەکانی، لەڕێگەی ئاشـــکراکردنی پێکهاتە بچووکەکانی بونیادی گشـــتی ریتمەوە، لەکاتی توێکردنی دەقدا ئەنجامبدرێ. واتە بونیادی ناوەکی (بیســـتراو و زەینی)، بونیادێکی ســـادە نیەو بڕێکی زۆر ئاڵۆزی و بەیەکداچوون لەخۆدەگـــرێ، بەجۆرێک ناتوانین لە دەرفەتێکی واداو بەشـــێوەیەکی تیوریی پەتی، چوارچێوەیەکی بۆ دیاری بکەین؛ بەڵکو تەنها لەڕێگەی وردبوونەوەی پراکتیکیەوە لە نمونە شـــیعریەکان دەتوانین پەنجە بخەینە سەر ئەو چوارچێوانە.

دواجار، ســـەرەڕای هەمەجۆریی دیدوبۆچونەکان سەبارەت بە ریتم، سەرەڕای ململانێی سەختی نێوان پشـــتیوانانی پێوەرگەریی لە ڕیتم و ئەوانەی داوای تێکشـــکاندنی هەرجۆرە پێوەرێکی پێشـــوەخت بۆ ریتم دەکەن... بونیادی ریتم بەپێی گریمانەی ئەم لێکۆڵینەوەیە، لە هەموو دەقێکی شـــیعریی زیندوودا راســـتییەکی بەرجەستەیە، راستیەک کە هەست بە ئامادەبوونی دەکەین، کاتێک شیعر لە پرۆسەیەکی وردو سۆراخکاردا دەخوێنینەوە.

## نزیککاریی سیمانتیکی بۆ بونیادی ریتم:

سەرەتا دەبێ جیاوازی لەنێوان واتا (یاخود دەلالەت)و مانادا بکەین، مانا زیاتر پەیوەندی بە ئاستە فەرهەنگییەکەی وشەوە هەیە، کە هەر وشەیەو مانایەک یان چەند مانایەکی موعجەمیی هەیە؛ بەڵام واتا پەیوەندی بەمانای گشتییەوە هەیە لە کۆنتێکست (سیاق)ی گشتیدا دەردەکەوێ. هەربۆیە بەمەبەستی تێکەڵاونەکردنی چەمکی واتاو چەمکی مانا، ئێمە زیاتر وشەی دەلالەت بەکاردێنین.

زاراوەی دەلالەت بەو تێگەیشتنەی ئێمە مەبەستمانە، بەپلەی یەکەم لە سیمانتیکا، زانستی دەلالەت (واتاناســـی)وە وەرگیراوە. ســـیمانتیکا SEMANTICS لقێکە لە زاســـتە زمانەوانیەکان، لە دەلالەتی جیاوازی وشەکان دەکۆڵێتەوە، چونکە زمان لەیەک کاتدا دەلالەتی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و مۆرفۆلۆجی و موزیکی و رێزمانی و ...هتد-ی هەیە. دواتێگەیشتن چنگناخرێ تا ئەوکاتەی گوێگر یان وەرگر لەسەر هەموو دەلالەتەکان دەوەســـتێ و پێکەوە گرێیاندەداو دەلالەتی گشتییان لێهەڵدەهێنجێ[٢٢]. سیمانتیکا لە پێناسەیەکی تردا لە پەیوەندی نێوان دوو رەگەزی زمانەوانی دەکۆڵێتەوە کە بریتین لە:

١-ئامـــاژە (دال SIGNIFICANT): بریتیە لەهەر توخمێک لـــە توخمەکانی ئاماژەی زمانەوانی کە قابلی تێگەیشـــتنەو واتایەکی دیاریکراو دەبەخشێ، هەم لە زەینی نێرەری ئەو ئاماژەیەو هەم لە زەینی وەرگرەکەیدا[٢٣].

٢-واتا (مدلول REFERENT): بریتیە لەو واتایەی کە لەبەرامبەر ئاماژەدا دروستدەبێ[٢٤]. ئەڵبەتە پەیوەندیـــی نێوان ئەم دوو رەگەزە بەجۆرێک یەکتەواوکەرو پێکەوەلکاوە کە وەک پەیوەندیی نێوان دوو دیوی یەک کاغەزە، واتە ناتوانین باس لە بوونی سەربەخۆی یەکێکیان بەبێ ئەوی تریان بکەین.

هەوەها سیمانتیکا لە ئاستی مێژوویی وشەکان و فرەمانەکانیان و پەیوەندیی دەلالیی نێوان وشەکان -وەک کۆمەڵە دەنگێک-و ئاستی واتا میتافۆریەکان دەکۆڵێتەوە[٢٥]. هەرچەندە چەمکەکانی ئەم زانستە

پێشـــتر لە ڕەوانبێژی و رەخنەدا بەکارهاتووە، بەڵام سیمانتیکا لە چەند نەسکێکی زانستی و تیوریداو وەک بەشـــێک لە ئاماژەناســـی گشـــتی، کە لە زمان و ئاستەکانی تری ژیانیشـــدا هەیەو وەک بەشێکی دانەبڕاو لە لقەکانی تری زانستە مرۆییەکان، لەم بابەتانەی کۆڵیوەتەوە.

کۆنتریـــن دەقی رەخنەیی دەربارەی دەلالەت، کـــە نزیکایەتیەکی لەگەڵ چەمکە مۆدێرنەکەیدا هەیە، دەگەڕێتـــەوە بۆ ئەرســـتۆ کە لـــە کتێبێکیدا دەربارەی فرێزو رســـتە باس لە پەیوەندیـــی نێوان وتەو نیشانەکانی زەینی مرۆڤ لەلایەک و شتەکانی جیهانی دەرەکی لەلایەکی ترەوە دەکا، بەدەق لەمبارەیەوە نوســـیویەتی: «ئـــەو دەنگانەی مرۆڤ دەیاندرکێنێ هێمای چەند دۆخێکی دەروونین، ئەو وشانەیشـــی دەیاننوسێ هێمای ئەو وتانەن کە دەیاندرکێنێ؛ هەروەک چۆن شێوازی نوسین لای مرۆڤ یەک جۆر نیە، بەهەمان شێوە شێوازی وتەکانیان یەک جۆر نیە. بەڵام ئەو دۆخە دەروونیانەی گوزارشتیان لێدەکرێ لای هەموان هاوشێوەیە، هەروەها ئەو شتانەی ئەو دۆخانە بەرجەستەیان دەکەن هاوشێوەن»[٢٦].

رەخنەگرە کۆنەکان و زانایانی بواری بەلاغە گرنگیان داوە بە بابەتی وتەو مانا، یان فۆرم و ناوەرۆک، کـــە هەنـــدێ توێژەر بە هاوتای ئاماژەو واتا (دال و مەدلول) لەقەڵەمیانداوە؛ بەڵام ترازاندنی وتە لە مانا لە میراتی رەخنەیی و بەلاغیدا، ململانێیەکی سەختی لەنێوان پشتیوانانی فۆرم و پشتیوانانی ناوەرۆکدا نایەوەو کەلێنێکی گرفتئامێزی ئەوتۆی لەنێوان ئەو دوو رەگەزەدا دروســـتکرد، کە تەنها ســـیمانتیکا پڕیکردەوە.

ســـیمانتیکا وەک لقێک لە لقەکانی زمانناســـی نـــوێ هاتەئاراوە، بـــەڵام پراکتیزەکردنەکانی بازنەی زمانناســـی تێپەڕاندو چووە بواری زۆربەی زانســـتە مرۆییەکان، یەکێک لەو بوارانەش رەخنەی ئەدەبی بوو. فردێنان دۆسێســـێر وەک پێشەنگی زمانناسی مۆدێرن و وەک ئەو بیریارەی پێشبینی لەدایکبوونی ســـیمیۆلۆجیای کرد، کە دەبێتە ئەو زانســـتەی لە ئایندەدا یارمەتی لێکۆڵەرەوانـــی کایە جیاوازەکانی مرۆڤناســـی دەدا، تێزگەلێکـــی ئەوتۆی پێشکەشـــکردووین کە هاریکاری باشـــی لێکۆڵەرەوانی بواری رەخنەی ئەدەبی دەکەن بەمەبەستی گەڕان بەشوێن واتا شاراوەکانی دەقدا. دۆسێسێر پێیوایە سیستمی زمانەوانـــی بریتیە لـــە کۆمەڵێک جیاوازی فۆنەتیکی کە هاوتەریبی کۆمەڵێـــک جیاوازیی فیکرین، ئەو هاوتەریبییەی نێوان ئەو هێما بیســـتراوو کاردانەوە فیکریانە سیستمیک دەخاتەوە لە بەهای جیاجیا، ئەو سیســـتمەش نوێنەرایەتی هاوبەندیی چالاکی نێوان توخمـــە فۆنەتیکیەکان و توخمە دەروونیەکان دەکا لەهـــەر هێمایەکدا[٢٧]. ئەگەر بەجیا تەماشـــای هەریەک لە ئامـــاژەو واتا بکەین دەکرێ جیاوازییە فۆنەتیکیەکانی دەقی ئەدەبی دەستنیشـــان بکەین و پاشـــان پەنجە بخەینە سەر جیاوازییە فیکری و دەلالیەکان، چونکە گرنگترین تایبەتمەندیی دەزگای زمان، کە کەرەستەی خاوی هەر کارێکی ئەدەبییە، بریتیە لە هاوســـەنگیراگرتنی نێوان ئەو دوو توخمە[٢٨]. کەواتە ئاشـــکراکردنی هەرئاســـتێکیان هاوتای ئاشـــکراکردنی ئاســـتەکەی دیکەیەتی. لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژەیەکی خێرا بەدوو خەسڵەت، یان دوو پرنسیپی سەرەکی دەلالەت بدەین:

یەکەم/ سروشتی رەمەکی دەلالەت: بەو مانایەی پەیوەندیی نێوان ئاماژەو واتا پەیوەندییەکی رەمەکی و ناجێگیـــرە، چونکـــە هەرچەندە توخمی دووەمی پەیوەندیەکە کە (واتا)یـــە، لە بنەڕەتدا پەیوەندیی بەهەردوو لایەنی (پەیامدەرو پەیاموەرگر)ەوە هەیە، بەڵام لەکاتی پرۆســـەی ناردنی پەیامی زمانەوانیدا تەنها لەلایەن (خوێنەر یان بیســـەر)ەوە دەکرێتەوە. سیســـتمی دەنگە بیســـتراوو وێنە زەینیەکانیش هیـــچ دەقێـــک پێکناهێنێ و هیچ فەرمانێکی زمان بەجێناهێنێ، گەر ســـیتمێکی هاوتەریب لە دەلالەت لەئارادانەبـــێ، ئەو سیســـتمەی کە لەلایەن خوێنەر یان گوێگرەوە قابلی خوێندنەوە یان تێگەیشـــتن و

وێناکردنە. ئەڵبەتە پرۆسەی خوێندنەوەو ئاشکراکردنی ئاستە سیمانتیکیەکانی دەقیش لە خوێنەرێکەوە بۆ خوێنەرێک و لە گوێگرێکەوە بۆ گوێگرێکی تر دەگۆڕێ.

دووەم/ سروشتی ئاسۆیی ئاماژە: بەو پێیەی ئاماژە کە بە بیستراوی یان خوێنراوەیی دەگاتە وەرگر؛ لەماوەیەکـــی زەمەنیدا دێتەبوون و ئەو ماوە زەمەنییەش بەتاکە دوورایيەک دەپێورێ، کە لە شـــێوەی هێڵدایە، بۆنمونە لە (ڕ)ەوە بۆ (ب)[29]. واتە ســـەرەڕای سروشتی ڕەمەکیی زمان، سروشتی هێڵئامێزی ئاماژە، بزاوتی ناوەکیی دەقی شیعر لە شێوەی بونیادێکی کامڵدا ڕێکدەخا؛ چونکە ئاماژەکان بەگوێرەی هێڵە تەریبەکان خۆیان ڕێکدەخەن.

بەڵام لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەبدرێ کە مەبەست لە وێنەی بیستراو ریتمی بیستراو نیە لە شیعر یان لە بەشـــەکانی تری ئاخاوتندا، بەڵکو مەبەســـت لێی هەموو ئەو پەرچە هەستانەیە کە خوێنەر یان گوێگر لە قۆناغی یەکەمی وەرگرتنی دەقدا لای دروســـتدەبێ، کـــە لە قۆناغێکی تردا دەبێتە وێنەیەکی زەینی یان بیرۆکەیەکی دیاریکراو.

ئەڵبەتە دەکرێ ڕەخنەی ئەدەبی لە ســـیمانتیکا موتوربە بکرێ و مێتۆدێکی ڕەخنەیی لێبکەوێتەوە بۆ ئاشـــکراکردن و خوێندنەوەی ســـترەکتوری دەق و پێکهاتە بەشـــەکیەکانی و هێنانەقســـەی ئاستە ئیستاتیکیەکانی، چونکە سروشتی هەردوو کایەکە، ڕەخنەی ئەدەبی و ئیستاتیکا، پەیوەندییان بەزمان و ئاشـــکراکردنی دەلالەتەکانیـــەوە هەیە. لێرەوە پێڕەوکردنی میتۆدێکی لەمجۆرە، کارێکی پێویســـت و شـــیاوە بۆ هێنانەقسەی ئاستی ســـیمانتیکی ریتم لە دەقی شیعریداو دەرخستنی ئەو حەقیقەتەی کە بونیادی ریتم بەتاڵ نیە لە بارگەی دەلالی، بەڵکو لە هەناویدا هەڵگری ئەو ئاماژانەیە کە لەگەڵ ئاستە دەلالیەکانی دیکەی دەقی شیعریدا دەچنە پەیوەندییەکی دیالیکتیکییەوە.

وەک ئاماژەمان پێدا، بونیادی ریتم کە لە پێکەوەگونجانی نیشـــانە فۆنەتیکی و نیشـــانە بینراوەکان (زەینیەکان)، لەسەر هەردوو ئاستی دەرەکی و ناوەکی پێکدێ، پێگەیەکی گرنگی لە نوێنەرایەتیکردنی توخمی یەکەمی هاوکێشەی دەلالەت کە (ئاماژە)یە هەیە، پاشان کاردانەوەی لەسەر توخمی دووەم (واتا) بەجێدێڵـــێ، چونکە هەروەک چۆن هەموو پەیوەندییەکی زمانەوانی دەلالەتی خۆی هەیە، ریتمیش وەک سیســـتمێک لە نیشـــانەکان کە لەیەک کاتدا ریکوپێک و لێکئاڵۆزاویشە، هەڵگری بارگەی سیمانتیکی خۆیەتی.

قســـەکردن لەســـەر واتای ریتم قسەکردنێکی کۆنە، بەجۆریک فەیلەســـوفە یۆنانیەکان و پاشتریش ئەندێشەمەندو ڕەخنەگرەکانی جیهانی ئیسلامی لەسەری وەستاون، بۆنمونە ئەرستۆ پێیوایە «جوانی و ناشـــرینی وشەکان زادەی زەنگ و ماناکانیانن»[30]، بەهەمان شێوە فەیلەسوفە موسڵمانەکان پێیانوابوو کێش توخمێکی دەرەکی و سەربەخۆو جیاواز نیە لەمانا[31]. بەڵام جیاوازییەکە لەوێدایە کە فەیلەسوف و ڕەخنەگرە کۆنەکان لەبری ئەوەی باس لە دەلالەتی ریتم بکەن باســـیان لە ماناکەی کردووە. ئەڵبەتە جیاوازییەکی ئاشـــکراش لەنێوان هەردوو چەمکی مانا و دەلالەتدا هەیە، چونکە سروشـــتی پەیوەندیی نێـــوان وتەو واتا ڕەمەکی نییە، بەڵکو هەر وتەیەک مانایەک یان چەند مانایەکی فەرهەنگی دیاریکراوی هەیە، بەڵام سروشـــتی پەیوەندیی نێوان وتەو واتا (دەلالەت) کراوەیە... چونکە لەکاتێکدا هەر وتەیەک هەڵگری مانایەک یان چەند مانایەکی فەرهەنگیی دیاریکراوە، لە سیاقی گشتی دەقدا هەڵگری دەلالەتێکە کە مەرج نیە لەگەڵ مانا موعجەمیەکەیدا جووتبێت، ئەو حاڵەتەی کە (دۆسێسێر) دەیچوێنێ بە گەمەی شـــەترەنج، واتە هەروەک چۆن بەهای هەر پارچەیەک لە پارچە بکەرەکانی شـــەترەنج (فیل، ئەســـپ، قەڵاو...هتد) بەندە بە شـــوێنەکەیەوە لەسەر ڕووبەری گشـــتیی گەمەکە، بەهەمان شێوە دەلالەتی هەر

وشەیەک لە وشەکانی زمان بەندە بە پێگەکەیەوە لە سیاقی گشتیدا[٣٢].

لە ســـترەکتوری ریتمی شـــیعردا پلیکانەیەک لە توخم و بەهاو یاسای رێکوپێک هەیە، کە پێکەوە ئەو ســـترەکتورە دەکەنە فاکتەرێکی باڵادەست لە دەقی شـــیعریدا، کە توخمەکانی دیکە لەگەڵ خۆیدا دەگونجێنێ و کاریگەریەکی زۆر لەسەر ئاستە فۆنەتیکی و مۆرفۆلۆجی و واتاییەکانی دیکە بەجێدێڵێ. چونکە بەوپێیەی ریتم جێگۆڕکێی زەمەنیی رێکوپێکی نێوان دیاردە لێکدراوەکانە، خەسڵەتی جیاکەرەوەی وتەی شیعری و پرنسیپی رێکخەری زمانەکەشیەتی[٣٣].

ئاستی سیمانتیکی ریتم وەک فاکتەرێکی سەرەکیی زمانی شیعر لەوەدا بەرجەستەدەبێ کە ونبوونی ریتم دەبێتەهۆی ونبوونی گرنگترین خەســـڵەتی شیعر. لەکاتی وەرگێڕانی هەردەقێکی شیعریشدا ئەوە دەردەکەوێ کە چۆن شیعر هەموو ئەو بارگە دەلالی و ئیستاتیکیانە لەدەستدەدا کە وابەستەی ریتمن. چونکە کاتێک خوێنەر دەقێکی شـــیعریی وەرگێڕدراو دەخوێنێتەوە، هەســـتدەکا ئەوەی دەیخوێنێتەوە بونیادێکی شیعریی نیە، بەڵکو وتەگەلێکی دابڕاوە لە ریتم[٣٤]. ئەم هەستە لای خوێنەر دروستدەبێ، جا ئیدی دەقە شیعرییە وەرگێڕدراوەکە ستوونی بێت یان ئازاد یان پەخشانەشیعر بێت، چونکە هەریەکێک لەم نمونە شـــیعریانە خاوەنی بونیادی ریتمئامێزی خۆیەتی کە بە تەرجەمەکردنی شیعر لەبەیندەچێ. رەنگە تەرجەمە پارێزگاری لە ئاستێکی ناوەرۆکی مانا بکا، هەروەها رەنگە رووبەرێک لە بونیادی ریتمی زەینی بپارێزێ، بەڵام ناچارە دەســـتبەرداری فۆرمە ئیقاعیەکانی دیکەی ببێ، بەتایبەتی لەسەر ئاستی بیســـتراو... رەنگە هەرزوو شێوەخوازە رووسەکان (فۆرمالیستەکان) پەییان بەم حەقیقەتە بردبێ، کاتێ پێیانوابوو وشـــەکان بە ماناو پێکهاتەو فۆرمی ناوەکی و دەرەکیانەوە، بەهاو قورســـایی خۆیان هەیە لە شیعردا[٣٥].

لێرەوە، دەتوانین بڵێین هێنانەقســـەی دەلالەتی بونیادی ریتم لە رێگای ســـەرنجدان لە پەیوەندیی دیالیکتیکی نێوان ئاماژەوتەو ئاماژەواتاوە بەرجەســـتەدەبێ، یان پەیوەندیی نێوان (وێنەی فۆنەتیکی)و (بیرۆکە)، کە یەکەمیان بونیادی ریتمی شـــیعر لەخۆدەگرێ و دووەمیشـــیان رەنگدانەوەی واتایی ئەو بونیادەیە.

هەروەها پێویســـتە ئاماژە بەوەبدەین کە مەبەست لە وێنەی فۆنەتیکی ئاستی فیزیایی ئەو وێنەیە نیە، بەڵکو مەبەست لێی وێنەی سایکۆلۆژی دەنگە، یان ئەو پەرچەهەستەیە کە لای وەرگر دروستدەبێ. واتە وێنەی فۆنەتیکی وێنەیەکی هەستئامێزەو پەیوەستە بە هەستەکانەوە[٣٦]. وێنەیەکە تەنها بونیادی بیســـتراوی ریتمی شـــیعر لەخۆناگرێ، بەڵکو تـــەواوی پەیوەندیەکانی پێکەوەگونجـــان و هاوتەریبی لەخۆدەگرێ لەسەر هەموو ئاستە بیسستراوو بینراوو زەینیەکان، چونکە چەمکی ریتم تەنها لە بازنەی ریتمی بیستراودا قەتیس نابێ، بەڵکو لەوە فراوانترەو لەیەک کاتدا ئاستەکانی ریتمی دەرەکی و ناوەکی، بیستراوو زەینیش لەخۆدەگرێ.

هەموو ئاســـتە پێکهێنەرەکانی ریتمی شیعر هەڵگری بارگەی دەلالی خۆیانن؛ هەروەک چۆن بەحرو تەفعیلەو ســـەرواو کێشـــە عەروزییە نەریتیەکان و دیاردەکانی وەک زیحـــاف و عیللەو ...هتد، وزەی سیمانتیکیی خۆیان هەیە؛ ریتمە ناوەکییە بیستراوەکان و وێنە زەینیە پێکەوەگونجاوو هاوتەریبەکانیش وزەو بارگەی سیمانتیکی خۆیان هەیە.

ماوەتەوە بڵێین راڤەکردنی دەلالەتی دەقی شـــیعر بەندە بە خوێنەرەکانیەوە کە شـــفرە زمانەوانی و سیمانتیکی و رۆشنبیریەکانی خۆیان بەکاردەهێنن[٣٧]. پرۆسەی خوێندنەوەی هەر دەقێکیش پێویستی بە زیرەکییەکی هێرمنیۆتیکی هەیە. هەربۆیە بەرلەوەی کۆتایی بەم باســـەمان بێنین بەباشـــی دەزانین

ئەم خاڵانە تۆماربکەین:

-بەقسەهێنانی ئاستی دەلالی بونیادی ریتم لە شیعردا، پێویستی بە خستنەگەڕی ئامرازەکانی واتاناسی (سیمانتیکا)و پراکتیزەکردنی لە بواری رەخنەی ئەدەبیدا هەیە، چونکە مەیدانێکی باشی لێکۆڵینەوەی پێکهاتە مۆفۆلۆجی و فۆنەتیکیەکانی دەقەو پێکەوەگونجان لەنێوان مانای وشەکان بەجیاو مانای گشتی سیاق دەگونجێنێ.

-خوێندنەوەی رەخنەیی بەراوردکار بۆ دەقە جیاوازەکان لە ئەدەبە نەتەوەییە جیاوازەکاندا، پێویستی بە زیاتر لە رێچکەیەکی شیکاریی دیاریکراو هەیە، وەکو (فرناند برۆنتێر)یش وتوویەتی «چوارچێوەی ئەدەبی بەراوردکار هێندە بەرفراوانە، وەک ئەوەی کایەیەکی بێکۆتابێت»[38]، هەربۆیە پێویستە میتۆدی مێژوویی بەراوردکار بەچەندین میتۆدی شیکاریی دیکە موتوربە بکرێ.

-بەوپێیەی دەقی شیعریی زیاتر لە راڤەکردنێک لەخۆدەگرێ، ئەوە ناکرێ لە بازنەی خویندنەوەی تاکرەهەندا بەندبکرێ... بەڵکو خوێندنەوەی نوێی دەقی شیعریی زیاتر لە رێچکەی راڤەگەری (هێرمینیۆتیکا)وە نزیکە، ئەو رێچکەیەی خزمایەتی لەگەڵ سیمانتیکادا هەیەو سودیان لە رەگەزەکانی یەکدی وەرگرتووە[39].

-رێچکە رەخنەییە تازەکان سوودێکی زۆریان لە کەلەپووری رەخنەیی و بەلاغی وەرگرتووە، پەیوەندییەکی زۆریش لەنێوان چەمکەکانی رەخنەی مۆدێرن و زاراوە بەلاغی و عەروزیەکاندا هەیە، بۆ نمونە وەک پەیوەندیی نێوان ریتمی ناوەکی و جیناس، ریتمی زەینی و ئیستعارە، هاودژیی سیمانتیکی و تیباق، پەشێویی ریتم و زیحاف و... هتد.

دواجار دەکرێ بڵێین گەڕان بەدوای ئاستی سیمانتیکی لە شیعردا، گەڕانێکی کراوەیەو پشتئەستوورە بەهەموو ئەو میتۆدو تێزە رەخنەییە مۆدێرن و کۆنانەی کە دەکرێ بەجۆرێک لە جۆرەکان و لە شوێنێک لە شوێنەکاندا سوودیان لێوەربگیدرێ.

## پەراوێزەکان:

(1) م. هـ. ابرامز، ((المدارس النقدية الحديثة فى معجم المصطلحات الأدبية))، ت: د.عبدالله معتصم الدباغ، مجلة الثقافة الأجنبية، العدد(٣) ١٩٨٧، بغداد، ص٤٣.

(2) د.صلاح فضل، نظرية البنائية فى النقد الأدبى. (ط٣، بغداد: دار الشؤون الثقافية العامة، ١٩٨٧)،ص١٧٥.

(3) د.احمد مطلوب، معجم النقد العربي القديم، ج١، ص٢٨٠.

(4) المصدر نفسه، ص٢٨٠.

(5) دكتر سيروس شميسا، در معرفت شعر كزيدة المعجم فى معايير أشعار العجم شمس قيس رازى. (جـ١، تهران: انتشارات سخن، ١٣٧٤)، ص٩٤.

(6) أديث كيرزويل، عصر البنيوية من ليفى شتراوس الى فوكو.ت: جابر عصفور. (بغداد: دار افاق عربية للصحافة والنشر، ١٩٨٥)، ص٢٨٩.

(7) د.محمد غنيمى هلال، النقد الأدبى الحديث، ص٣٧٣.

(8) المرجع السابق، ص٣٧٣.

(9) د.احمد مطلوب، معجم النقد العربي القديم، ص٢٨٠.

(10) د.كمال عيد، جماليات الفنون. (بغداد: دار جاحظ للنشر، ١٩٨٠)، ص٤٥.

(11) أديث كير زويل، عصر البنيوية، ص٢٨٩.

(12) LYNN ALTENBERND & LESLIE L.LEWIS، A HAND BOOK FOR THE STUDY OF POETRY، MACMILLAN PUBLISHING CO.، INC-NEWYORK ، COLLIER MACMILLAN PUBLISHERS-LONDON، 1966،P.9.

(13) فاضل ثامر، مدارات نقدية في اشكالية النقد والحداثة والأبداع. (بغداد:دار الشؤون الثقافية العامة،١٩٨٧)،ص٢٣٧.

(14) المصدر نفسه، ص٢٤٢-٢٤٣.

(15) ميكل دوفرن، ((الشعري))، مجلة الفكر العربي المعاصر، ت: نعيم علوية، العدد١٠، شباط-١٩٨١، ص٤٥.

(16) تزفيتان تودوروف، نقد النقد. ت: ســامى ســويدان، مراجعة: د.ليليان ســويدان. (ط٢، بغداد: دار الشؤون الثقافية العامة، ١٩٨٦)، ص٢٤.

(17) كمال ابوديب، جدلية الخفاء والتجلي دراســات بنيوية فى الشــعر. (ط١، بيروت: دار العلم للملايين، ١٩٧٩)، ص٦٤-٦٥.

(18) سوزان بيرنار، قصيدة النثر من بودلير الى أيامنا، ص٢٠.

(19) د.الفت كمال الروبي، نظرية الشــعر عند الفلاســفة المســلمين من الكندي حتى ابن رشد. (ط١، بيروت: دار التنوير للطباعة والنشر،١٩٨٢)، ص٢٥٤.

(20) المصدر نفسه، ص٢٥٣.

(21) ادونيس، زمن الشعر. (ط٣، بيروت: دار العودة، ١٩٧٨)، ص١٤.

(22) معجم المصطلحات اللغوية و الأدبية (المانى- انكليزى-عربى)، د.عليه عزت. الرياض: دار المريخ،١٩٨٤.

(23) المصدر السابق، ص٣٠.

(24) المصدر السابق، ص١١٨.

(25) اديث كيرزويل، عصر البنيوية..، ص٢٨٦-٢٨٧.

(26) مدخل الى الســيميو طيقا، مقالات مترجمة و دراســات. بإشــراف: ســيزا قاســم ونصر حامد أبوزيد. ٢ج. (ط٢ دار البيضاء- القاهرة: شركة دار الياس العصرية، ١٩٨٦)، ص٤٩.

(27) د.صلاح فضل، نظرية البنائية فى النقد الأدبي ص ٣٧.

(28) المصدر نفسه، ص٣٧.

(29) فردينان دى سوســير، علم اللغة العام. ت: د.يوئيل يوســف عزيز، مراجعة: د.مالک يوسف المطلبى. (بغداد:دار آفاق عربية ١٩٨٥)، ص٨٧-٨٩.

(30) محمد غنيمى هلال، النقد الأدبى الحديث. ص٢٤٢.

(31) د.الفت كمال الروبي، نظرية الشعر عند الفلاسفة المسلمين من الكندى حتى ابن رشد، ص٢٦٠.

(32) د.صلاح فضل، نظرية البنائية، ص٣١-٣٢.

(33) المصدر السابق، ص٧١.

(34) د.ريكان ابراهيم، ((سيكولوجية الشعر المترجم))، الثقافة الأجنبية، العدد١، السنة التاسعة ١٩٨٩، ص١٥٥.

(35) د.صلاح فضل، مرجع سبق ذكره، ص٧٨.

(36) فرديناند دى سوسير، مرجع سبق ذكره، ص٨٥.

(37) روبرت شولز، السمياء والتأويل. ت:سعيد الغانمى. (ط١، بيروت: المؤسسة العامة للدراسات والنشر١٩٩٤)،ص٤١.

(38) كلوديو جوين، ((جماليات التأثير الأدبى دراســات فى الأدب المقارن))، الثقافة الأجنبية، العدد (٢) الســنة العاشرة ١٩٩٠، ص١٢.

(39) فاضل ثامر، ((من سلطة النص الى سلطة القراءة))، مجلة الفكر العربى المعاصر، العدد(٤٨-٤٩)، ک٢-شباط/١٩٨٨، ص٩٢.

# دیاردەی شێتی

میشێل فۆکۆ
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

(1)

شێتی دیاردەیەکی شارستانیە و وەک هەر دیاردەیەکی شارستانیش، دەگۆڕێت و گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەوەی ڕاستی بێت دوای ئەوەی ئەو شتانەم خوێندەوە کە ئەمریکاییەکان دەربارەی مامەڵەکردنی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان لەگەڵ شێتیدا نوسیبویان، پرسیم: ئاخۆ دەبێت کۆمەڵگەکانی ئێمە بە چ شێوەیەک مامەڵە لەگەڵ ئەم دیاردەیەدا بکەن؟

(2)

هەندێ شارستانیەت هەن شێتیان قبوڵ بووەو پێشوازیان لێکردووە، لێ هەندێکی تر وەدەریان ناون و دوریان خستونەتەوە، هەندێکی دیکەش چارەسەریان کردوون، بەڵام ئەوەی بە دیاریکراوی دەمەوێت جەختی لەسەر بکەم، ئەوەیە کە چارەسەرکردن تاکە پەرچەکردارێک نییە لە بەرامبەر ئەو دیاردەیەدا. پێمولیە لە ناو شێتاندا خەڵکانێک هەن سەیر و جێ سەرنجن، وەک چۆن ئەمە لە ناو خەڵکانی ئاسایشدا هەیە. هیچ ژیارێک نییە بەبێ شێتی... ئەوەی خولیای من بوو، ئەوە بوو لە پەیوەندی کلتور بە شێتییەوە بکۆڵمەوەو بزانم کلتور چۆن چۆنی مامەڵەی لەگەڵ ئەم دیاردەیەدا کردووە. یان بە واتایەکی دیکە بڵێم، مەبەستی من ئەوە بووە بزانم پەرچەکرداری کلتوری کلاسیکی لەبەرامبەر دێوانەیدا چۆن بووە. بە بڕوای

من هەڵوێستی سەردەمی کلاسیک لە شێتی، پێچەوانەی سەردەمی ئەقلانییەت بووە، ئەو ئەقلانیەتەی لە سەدەی حەڤدەو هەژدەدا باڵادەست بوو.

(٣)

من لەو بڕوایەدام سەدەی حەڤدە خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگە، چونکە بەر لەوەو (لانی کەم تا سەردەمی بارۆک)[١]، شێت بە ئازادی دەژیاو لە بەرچاوی هەمواندا بوو. لەو سەردەمانەدا خەڵک جەژن و بۆنەیان بۆ شێتی ساز دەکرد.. هاوکات شانۆیەک بۆ شێتی هەبوو، لە ئەدەب و نوسینیشدا شێتی شوێن و پێگەی خۆی هەبوو. نیگارکێش و هونەرمەندانیش وێنەی شێتیان دەکێشا و ئایکۆنیان بۆ دروست دەکردن، لەوانە بەرهەم و کارەکانی «جیرۆم بوش»[٢] و «بریگڵ»[3].

بابەتی شێتی بەسەر ماوەی نێوان کۆتاییەکانی سەدەی شازدەو سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەهەمدا زاڵ بوو، وەک چۆن خولیای مردن لە کۆتاییەکانی سەدەی چواردەو سەرەتاکانی سەدەی پازدەدا بەسەر ئەدەب و ڕۆشنبیریدا زاڵ بوو. لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا گرنگ بوو، بە شێوەیەکی فەرمیش دانی پێدانرابوو. تەنانەت شێتەکان لەو قۆناغەدا دەیاننوسی و نوسینەکانیشیان بۆ بڵاو دەکرایەوە. نمونەیەکی ئەوانە "بلوێی دەربیر"ە کە بەرهەمەکانی بەشێوەیەکی بەرفراوان بڵاوبووەوە. نوسینەکانی ئەم دێوانەیە زۆر تایبەت بوون، ئەگەر چی تەمومژاوی و تێگەیشتنیان قورس بوو. سەربار‌ی ئاڵۆزی ئەو نوسینانە، بەڵام بەرهەمگەلێکی پڕ چێژ بوون بۆ خوێنەرانی. بەرهەمی ئەو نوسینانە شیعر و چیرۆک و ڕۆمانیان تێدا بوو، پاشان (دۆنکیشۆت)ی «سێرڤانتس» هات.. ئایا ئەم ڕۆمانەش درێژکراوەی ئەو شێتییە نەبوو لە ئەدەبدا، یان درێژە پێدەری ئەدەبی دێوانەیی نەبوو؟

(4)

پێموایە هەموو بنەماڵەکان و لە هەموو سەردەمەکاندا، کاتێک یەکێک لە ئەندامەکانیان شێت بوون، توشی جۆرێک لە دڵەڕاوکێ و نائارامی هاتوون. هەموو گەڕەک و گوند و شارێک، شێت و دێوانەی خۆیانیان هەبووەو ئاگاداریان بوون و چارەسەریان پێداون. من لەو بڕوایەدام وێنەی شێت ئەو کاتە گۆڕانی بەسەردا هات کە خێزان بە فۆرمە بۆرژوازیەکەی[4]، پێگەیەکی گرنگی لە کۆمەڵگەدا بۆ خۆی گرت. لە سەدەی حەڤدەهەمدا و سەروەختێک ژیانی ئابوری گۆڕدرا، ئیتر شێت لەو سەردەمەدا وەک کەسێکی تەمبەڵ و مشەخۆر سەیر دەکرا، کەسێک کە چاوی لە دەستی خەڵکانێکی ترەو خۆی هیچ بەشداریەک لە گەشەپێدانی بواری ئابوریدا ناکات. بەمجۆرە شێت دەبێت بە بارێک بەسەر شانی ئەوانی دیەوە. بە بۆچونی من دیدگای کۆمەڵگە بەرامبەر شێتی لەو ڕۆژگارەدا، بە هۆی بارودۆخی ئابوورییەوە گۆڕدرا.

(5)

لەم سەردەمەی ئێستاماندا، بواری پزیشکی دیاردەی شێتی لە کلتور سەندۆتەوەو بەمجۆرەش شێتی بۆتە نەخۆشیەکی ئەقڵی. هەرچەندە ئەمە لە هەموو سەردەمێکدا بەو جۆرە نەبووە، بۆ نموونە

وەکی بینیمان شێت لە سەدەی حەفدەو هەژدەدا کەسێکی نەخۆش نەبوو، بەڵکو بوونەوەرێکی (نا — کۆمەڵایەتی) بوو. لەو سەردەمانەدا شێتەکان لەگەڵ کەسانی (نا — کۆمەڵایەتی) دیکەدا دیل دەکران. هەموویان لە یەک شوێندا کۆدەکرانەوەو پێیان دەوت حەشارگە. ئەمە لە نەخۆشخانە گشتیەکانی فەرەنسادا ڕویداو ئەو نا — کۆمەڵایەتیانە لە کارگە زەبەلاحەکاندا خرانە بەر ئیش. لە ڕاستیشدا ئەمانە ڕۆڵێکی ڕاستەقینەیان لە ژیانی ئابووریدا بینی، بەڵام دواتر ئەم ڕەوشەش گۆڕانی بەسەردا هات، ئەڵبەتە ئەویش لەبەر هۆکارگەلێکی ئابوری. شێتەکان لەو شوێنانەدا لەگەڵ کەسانی هەژار و دەرۆزەکەر و تەمبەڵ و وێڵگەرد و هۆمۆسێکسواڵ و سۆزانیەکان و ... هتد، کۆکرابوونەوە. بەڵام کاتێک کۆمەڵگە هەستی کرد بەوەی کۆکردنەوەی هەموو ئەوانە لەیەک شوێندا کەڵکی نییە، لەبەرئەوەی کۆمەڵگە پێویستی بە دەستی کار بوو، هەر بۆیە هەمویانیان دەرکرد، هەموویان بێجگە لە شێتەکان کە بە تەنها لەناو دام و دەزگا کلۆمدراوەکاندا مانەوە.

(6)

پێموایە لە ساتەوەختی شێت بوونی «نیچە»(5) و «ڕیمۆن ڕۆسل»(6) و «ڤان کوخ»(7) و «ئانتوان ئارتۆ»(8)وە، شتێکی گرنگ ڕوودەدات. واتە تێڕوانینمان بۆ شێتی وەک تێڕوانینی سەدەی پانزەو شانزەی لێدێتەوە، واتە شێتی دەبێتەوە بە دیاردەیەکی ژیاری زۆر گرنگ. وەک چۆن دێوانەیی لە کۆتایی سەدەی شانزەو سەرەتایی سەدەی حەڤدەدا هەڵگری هەندێ لە هەقیقەت بوو، لە سەردەمی ئێستاشماندا ئەم بیرۆکەیە گەڕاوەتەوە. بەجۆرێک خەریکە هەقیقەت لە زاری ئەوانەوە دەبیستین کە لەسەر لێواری شێتی دەژین، یان لە کەسانێکەوە پێمان دەگات کە ئەزمونی قوڵی ژیانی خۆیان لە دێوانەیدا بینیوەتەوە، وەک: «ئانتوان ئارتۆ» و «ڕیمۆن ڕۆسێل».

## پەراوێزەکان:

1-چاخی بارۆک: بەو قۆناغەی ئەدەبی فەرەنسی دەڵێن کە لە سەردەمانی حوکمڕانی "هنری چوارەم" (١٥٨٩-١٦١٠) و "لویسی هەشتەم"دا (١٦١٠-١٦٤٣) لە ئارەدا بوو، ئەم سەردەمە بە سەردەمی ئازادی گەورە ناسراوە، لەبەرئەوەی خەڵکی چۆنیان پێ خۆش بووەو چۆن ئارەزویان کردووە، نوسیویانە.

2-جیرۆم بۆش: نیگارکێشێکی هۆڵەندییە، لە نێوان ساڵانی (١٤٥٠-١٥١٦)دا ژیاوە، وێنەی چەندین کارەکتەری خەیاڵی و ڕەمزی کێشاوە.

3-پیتەر برۆگێل (١٥٢٥-١٥٦٩): نیگارکێشێکی بەلژیکاییەو بە میراتگرێکی "جیرۆم بۆش"دادەنرێت.

4-بنەماڵەی بۆرژوازی: مەبەستی "فۆکۆ" لە خێزان و بنەماڵە بە شێوازە بۆرژوازیەکەیەتی، لەسەدەی حەڤدەهەمدا بۆرژوازیەت کاریگەری زیاتری دەبێت، لە بری خانەدانەکان کە پێشتر ئەوان باڵادەست بوون.

5-فردریک نیچە (١٨٤٤-١٩٠٠): فەیلەسوفێکی ئەڵمانییە، ساڵی ١٨٨٩ داخڵ بە نەخۆشخانەی نەخۆشیە دەرونیەکان دەکرێت و پاشان لێی دێتە دەرەوە، تا ڕۆژی لە دنیا دەرچونی لە ساڵی ١٩٠٠دا لە ژێر چاودێری دایکیدا دەبێت.

6-ڕیمۆن ڕۆسێل (١٨٧٧-١٩٣٣): نوسەرێکی فەرەنسییەو شیعر و شانۆگەری نوسیوە، نەخۆشی دەرونی هەبووە، سوریالیستەکان بە یەکێک لە خۆیانیان زانیووە. بە دەرمانی باربۆتیریک خۆی ژەهرخوارد کرد و خۆی کوشت.

7-ڤنست ڤان کوخ (١٨٥٣-١٨٩٠): نیگارکێشێکی بەناوبانگی هۆڵەندییە، لە شاری (ئارل) لە باشوری فەرەنسا نیشتەجێ بوو، دوای نەخۆشکەوتنی لە ساڵی ١٨٨٨ خرایە شێتخانە. لە ساڵی ١٨٩٠ دا چەند فیشەکێکی بەخۆیەوە ناو خۆی کوشت.

8-ئەنتوان ئارتۆ (١٨٩٦-١٩٤٨): نوسەرێکی فەرەنساییە، لە بەرهەمە شیعریەکانیدا هەوڵیداوە دەستی بە سەرچاوە قوڵەکانی فیکر بگات. لە مندالّیەوە نەخۆشی دەرونی هەبووە. پەیوەندی بە سوریالیەکانەوە کردووە و پاشان خۆی بۆ شانۆ تەرخانکردووە. لە کتێبەکەیدا (نامەکان) زۆر باس لەوە دەکات کە چۆن چۆنی داخڵ بە نەخۆشخانە دەرونیەکان بووەو باسی ئازارەکانی و پەیوەندی بە پزیشکەکانەوە دەکات، بە تایبەت لە (نامەکان لە ڕۆدیزەوە) (شارێکە دەکەوێتە باشوری خۆرئاوای فەرەنسا). "ئارتۆ" یەکێک بووە لەوانەی بونی نەخۆشیەکی بەناوی شێتیەوە ڕەتدەکردەوە. هاوکات ئەکتەرێکی ناسراویش بووە.

## سەرچاوە:

ئەم کورتە نوسینەی "فۆکۆ" دەربارەی دێوانەیی، لە بنەڕەتدا بەرهەمی گفتوگۆیەکی ڕادیۆییە کە بەرواری ٣١/٥/ ١٩٦١ "نیکۆڵ برایس" لەگەڵیدا سازیکردووە.

# ئەبوبەکر ئەلڕازی

**لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال**

ماوەیەکـــی کـــورت دوای مەرگی کیندی دەرکەوت، کە پێویســـتە (هەروەها) لە کولتووری ئیسلامیشدا فەلسەفە و تیۆلۆژی لە یەکتری جیا بکرێنەوە. جا با کیندی رێزی لە کاری تیۆلۆژەکان گرتبێ» جا با تیۆلۆژەکانی ســـەردەمی کیندی دەنگیان بە راسیۆنالێتیی خۆیاندا نابێ و تەنانەت گرنگیان بە دیالێکتیکی ئەڕیستۆتێلیس (تۆپیک) و هەندێک تێڕوانینی (کۆنســـەپتی) تایبەتمەندی فەلسەفەی سروشتی ئەنتیکـــە دابێ — بەڵام چەند دە ســـاڵێکی کەم دوای ئەمە روانگەی هەڵوێســـتنو ێنەکان گۆڕرا: لەو میانە ریالیســـتییەوە، کە لە نێوان هەردوو زانســـتەکەدا هەبوو، میانەگرییەکـــی ئاگامەند هاتە گۆڕێ ئینجا هێندەی نەخایاند شـــێوەی بەرەگەرایی وەرگرت.

هۆکانی ئەم گۆڕانە هەمەلایەنن و ناشـــێ بە چەند دێڕێک پوخت بکرێنەوە. بەڵام ســـەرباری ئەمەیش دەتوانین بڵێین، ئەم گرژبوونەوەیەی پەیوەندییەکان، کە ئێمە دەتوانین لە وەرچەرخانی سەدەی نۆیەم بۆ سەدەی دەیەمدا چاودێریی بکەین، لەلایەن نوێنەرانـــی هەردوو بەرەکەوە دەردەچوو. کاتێـــک تیۆلۆژەکان ماوەیەکی درێژخایەن ئامادەبـــوون بە جیاوازتریـــن پاڵهێزە هۆشـــەکییەکان (بێگومان بـــە میراتەکەی ئەنتیکەشـــەوە) کار بکەن، ئەوا ئێستا بە پێچەوانەوە دەنگیان دەنا بە پێوەرێتیی ترادیسیۆنی ئیسلامیدا. لەم هەڵوێستەدا ئەلئەشعەری (٩٣٥ مردووە) و ئەلماتوریدی (٩٤٤ مردووە) بەشداربوون و بەشـــداریکردنەکەیان بوو بە پاڵهێزێکی ئاڕاستەدەر رووەو ئاییندە» بێگومان ئەمان پشـــتیان نەکـــردە بەکارهێنانی بەڵگەهێنانەوەی

ئاقڵانە، بەڵام ئەمان دەیان گوت، کە دەبێ هەموو دۆگمێگ لە قورئانەوە یان لە ترادیسیۆنی پەیامبەرەوە (واتا لە سوننەوە) بناغە برێژرێ (ئەلئەشعەری) یان مسۆگەر بکرێ (ئەلموتاریدی). بەمەش ئەوان ئەو چێوەیەی تێڕوانینیان گۆڕی، کە لە نێویدا مەزەنەگەراییە تیۆلۆژییەکان دەبزوان، هەروەها مشوری ئەوەیشیان خوارد، کە تیۆلۆژییەکی «سوننییانە»ی پابەند بە ترادیسیۆنەوە فەزل وەربگرێ. بەڵام فەیلەسوفەکان بە پێچەوانەوە ئامانجی تەواو جیاوازیان هەبوو. حاڵەتێکی سوودمەند بۆ ئەوان لەوەدا بوو، کە تەنانەت پاش مەرگی کیندی هێشتا هەر بەردەوام تێکستی دیکە لە گریکی و سریانییەوە بۆ عەرەبی وەردەگێڕران. ئەمەش بناغەی لێهزرینەکانی ئەوانی چاکتر کرد، بەڵام هەروەها بوو بەهۆی بەرزکردنەوەی رادەی داواکارییەکانیشیان، کە لەم لێهزرینانەوە وەک دەرەنجام دەبرانەوە. فەیلەسوفەکان چیدی بەند نەبوون بەو گریمانەیەوە، کە گوایە فەلسەفە گەرەکە (لە مەغزای کیندیدا) ئەرگومێنت و مۆدێلەکانی روونکردنەوە بخاتە خزمەتی دۆگمی ئیسلامییەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئێستا دەیانگوت، کە فەلسەفە دەبێ خۆی لە سەرجەم پێشمەرجە ئایینییەکان ئازاد بکات و شوێن بیردۆز و مێتۆدەکانی خودی خۆی بکەوێ، هەر بەم شوێنکەوتنەش تەقەلا بۆ زانینی سەربەخۆی (رەهای — و) راستی بدات.

داواکارییەکەی ئەبوبەکر ئەلرازی (٨٦٥- ٩٢٥ یان ٩٣٢) بەم چەشنە بوو. ئێمە لەتەک ڕازیدا بە یەکەم هزرڤانی ناوچەی کولتووری ئیسلامی دەگەین، کە تەواو داوای ئۆتۆنۆمیی فەلسەفەی دەکرد. رازی لە بنەڕەتدا پزیشک بوو و لەم سیفەتەیشیدا پێزانینی گەورەی پێبڕا. سەرکەوتنە (نەجاحە) مەیدانییەکانی لە بواری پزیشکیدا ستایش کران. نووسینەکانی سەبارەت بە بابەتە پزیشکییەکان پێوەری نوێیان دانا. ئەم نووسینانەی رازی نەک تەنها زانینی ترادیسیۆنیی گریکەکان (و هەروەها هیندیش)یان لە فۆرمێکی نموونەییدا پوخت کردەوە، بەڵکو هاوکات بە شارەزاییی فرە پەرەیان پێدا و لەبەر ئەم هۆیەش بەدرێژاییی چەند سەدەیەک وەک بناغەی پێگەیاندنی پزیشکان بەکاردەهێنران. بەڵام مەسەلەکە پەیوەست بە نووسینەکانی دیکەی رازییەوە لە بواری پرسیارە فەلسەفییەکاندا جیاواز بوو. ئەم نووسینە فەلسەفییانە نە لەلایەن هاوچەرخەکانییەوە وەرگیران و نە لە سەردەمانی پاش ڕازی خۆیدا پێزانران (ئیعترافیان پێکرا)، بە پێچەوانەوە، لەبری ئەمە لە گشت لایەکەوە رەفز کران، بەڵێ تەنانەت پەرچەکرداری تووڕە ئاڕاستەیان کرا، کە ئیتر لە سەرەنجامدا رازی وەک زەندیقێک ناوبانگی پەیدا کرد.

سەرجەم بەرهەمەکەی رازی، بەهۆی ئەم جۆرە بڕیاردانەوە بەسەر نووسینە فەلسەفییەکانیدا، بە ناباشی گەیەنراوە. گەر شتێکی ئەم بەرهەمە مابێتەوە، ئەوا تەنها تێکستی کورت و فراگمێنتن، کە ڕەسەنێتیان هەمیشە جەخت نییە. بۆیە ئێمە لە ڕادەیەکی زۆردا پابەندین بە دەربڕینی نووسەرانی سەردەمانی درەنگترەوە. ئەمەش لە حاڵەتی رازیدا بەتایبەتی نالەبارە، چونکە سەرجەم نووسەرانی پاش خۆی دەیانویست دژبێژیی تێڕوانینەکانی بکەن و لێرەشەوە ئەو تێڕوانینانەی ئەویان تیژتر لەوەی لە راستیدا چۆن بوون نیشان داوە. بێگومان سەرباری ئەمە دەشێ سیما بناغەییەکانی هزری ڕازی (بە رەچاوی ئەو ئاگادارکردنەوە نابراوانەی سەرەوە) هەڵبەسترێنەوە. ئەمە لایەنی کەم سێ کایە بابەت دەگرێتەوە، کە پێدەچێ رازی بەتایبەتی گرنگیی پێیان دابێ: مێتافیزیک (کە پرسیارەکانی زانیندنومای پرنسیپەکان و کۆسمۆلۆژی پێکەوە دەبەستێ) تیۆریی زانین (کە لەنێو کۆنتێکستەکەیدا هاوکات تێڕوانینەکانی ئەو لەبارەی پەیامبەرێتی خۆیان دەبیننەوە) لە کۆتاییدا تێڕوانینەکانی سەبارەت بە ئێتیک، کە لە لایەن خوێنەرانییەوە ئاسانتر وەرگیران و لەبەر ئەم هۆیەش لەنێو تێکستە ماوەکانی

ئەودا بە باشترین شێوە دەستنیشان (دۆکومێنتیر) کراون.
هزرینە نائاسایییەکەی رازی بەتایبەتی لە لێهزرینە مێتافیزیکییەکانیدا دەردەکەوێ. رازی لەو باوەڕەدایە، کە ئەو بتوانێ بوونی خولقێنراو نەک بۆ یەک تاکە پرنسیپ، بەڵکو بۆ پێنج پرنسیپ بگەڕێنێتەوە: لەپاڵ خوادا (کە وەک زەینی کامیل راڤەی دەکات)، کات و فەزا، دەروونی گەردوونی و ئەستوویەکی بێبونیادی لە ئەتۆم پێکهاتوو هیچ سەرەتایەکیان نییە (واتا دروست نەکراون — و). رازی دەبێژێ، ئەم پێنج پرنسیپە لە سەرچاوەدا لە یەکتری جیا بوون و هیچ پەیوەندییەکیان بە یەکترییەوە نەبوو. بەڵام پاشان رووداوێک هاتە گۆڕێ، کە پرۆسەیەکی پڕئەنجام و هەتا ئەمڕۆ بەردەوامی لێکەوتەوە، ئەم رووداوەش ئەوە بوو، کە دەروون هەوڵی دا ئەستوو بفۆرمێنێ و لەتەکیدا یەک بگرێ. بەڵام ئەم هەوڵەی دەروون بەهۆی بەرهەڵستیی ئەستووەوە نشوستیی هێنا، هەر بۆیە خوا لە بەزەییەوە بە ئەو هەوڵە نشوستیهێناوانەی دەروون‌دا دەستی نایە نێو پرۆسەکەوە، ئەویش بەوە، کە جیهانەکەمانی خولقاند و بەمەیش دەرفەتی بۆ دەروون رەخساند بچێتە نێو ئەستووە فۆرمێنراوەکانەوە. پاشان خوا بە (گەردیلەکانی) دەروون، کە لەو کاتە بەدوواوە خۆیان لەنێو جیهانی ئەستووییدا دەبیننەوە، بەشداریکردنی لە زەینی خۆیدا بەخشی. ئێمە بە یاریدەی ئەم بەشداریکردنە لە زەینی خوادا دەتوانین رەچەڵەکی خۆمان و تایبەتمەندکراوییەکەمان بناسین، چونکە زەین نیشانمان دەدات، کە دەروونەکانمان بە هیچ شێوەیەک بە لەشەکان ناگونجێن، بەڵکو دەبێ سەرلەنوێ بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەی خۆیان. رێگەی رووەو ئەو سەرچاوەیە بەسەر زانین و کرداری دروستدا تێدەپەڕێ. هەموو یەکێک لە ئێمە دەتوانێ ئەم رێگەیە بگرێتە بەر، چونکە سەرجەم مرۆڤان هێندە زەینیان هەیە، کە ئیتر بەرێییەوە بتوانن دەروونیان رزگار بکەن. هەر ئەوەندەی ئەم فرمانە بەدیهێنرا، ئیتر جیهانی خولقێنراو لەناو دەچێ و دۆخی سەرەتایی سەرلەنوێ دادەمەزرێنرێتەوە. پاشان بەدووی ئەمەدا دەروونی گەردوونی چاک کراوەتەوە: وەک دۆخە سەرچاوەییەکەی خۆی لێهاتۆتەوە، بەڵام ئێستا هێندە نەبێ، کە دەروون بە برِی ئەو زانینە دەوڵەمەندتر بووە، کە ئەو تایبەتمەند نییە بۆ یەکگرتن لەتەک ئەستوودا.
ئەم ئەفسانەیە، کە رازی لێی دەدوێ، زۆر جار راڤە کراوە، لێرەشدا مرۆڤ راست بۆی چووە، کاتێک ئاماژەی بۆ پەیوەندییەکەی ئەو بە فەلسەفە کۆنەکانەوە داوە: بە پلاتۆنیزمەوە، ئەمەش لە کۆنسەپتی (مفهوم) دەمیورگ و دەربڕینەکانی رازیدا لەبارەی رێگەکەی دەروون روون دەبێتەوە؛ ئینجا ئەنتی ئەریستۆتێلیزم، کە دیاریکەری دەربڕینەکانی رازییە لەبارەی فیزیک (واتا لەبارەی کاتی رەها، فەزای رەها پێکەوە لەتەک بۆشاییدا، ئەتۆمیزم)؛ لە کۆتاییدا نزیکی رازی لە مەزنە کۆسمۆلۆژییەکان، کە مرۆ لە ئایینە جیاوازەکانی ئەنتیکەی دەمەو کۆتاییەوە، لە پێش هەمووشیانەوە مانیشیئیزم، دەیانناسێ. بەڵام ئەم ئەفسانەیە، سەرباری نزیکییەکەی لە ترادیسیۆنە هزرییە کۆنەکان، هێشتا هەر لە خزمەتی فەلسەفەیەکی نوێدایە. بێگومان رازی ئەو کۆنسەپتە ناوبراوانە دەپەرچێنێ، بەڵام ئەو لە پلەی یەکەمدا بەکاریان دەهێنێ، تاکو لە خەریکبوونییەوە لەگەڵیاندا گۆڕان بە تێڕوانینەکانی خۆی بدات. ئەم تێڕوانینانەشی لە رەوتی دارِشتنەکانیدا دەردەکەون. رازی لەم تێڕوانینانەیدا گریمانەی سێ تەوەرە بۆ رووداانی جیهان دەکات: خوایەک، کە لە زانینی سەروەر و میهرەبانییەوە کردار دەنوێنێ؛ یەکگرتنەوەی مەرجە فیزیکییە پێشکاتی (پرێئەکسیستێنت) و لە خوا سەربەخۆکان (ئەزەلییەتی کات و فەزا و ئەستوو)؛ ئینجا لە کۆتاییدا دەروونی چوست، کە تەقەلا بۆ کامیلێتی دەدات و مێژووە بگۆڕەکەی هاوکات مێژووی جیهان و مرۆڤ پێکدەهێنێ.
بەڵام لێرەدا گەرەکە رەچاوی ئەوە بکەین، کە پرۆسەی کامیلبوونی دەروون لەلایەن زەینەوە

رابەرایەتی دەکرێ. ئەمە دەمانبات بۆ کێشەکەی (تێمەکەی) دیکە: واتا تیۆریی زانین، کە ئەمیش لەنێو لێهزرینەکانی رازیدا شـوێنێکی گرنگ وەردەگرێ، بەڵام رازی لێرەشـدا وەک هزرڤانێکی ناترادیسـیۆنی دەردەکەوێ، چونکە رازی جیاواز لە فەیلەسـوفەکانی پێش خۆی (کیندی) و پاش خۆی (فارابی، ئیبن سینا، ئیبن روشد) لە خەریکبوونیدا بەم کێشەیەوە لە دەربڕینەکانی ئەڕیستۆتێلیسەوە لەبارەی زەینی چالاک و زەینی ناچالاکەوە سـەرچاوە ناگرێ، بە پێچەوانـەوە، رازی دەیەوێ بەتایبەتی پنتێکی دیکە دیاری بکات. ئەم پنتە خۆی لەو بڕوا ناوبراوەدا دەبینێتەوە، کە هەموو مرۆڤێک تەنها بە یاریدەی زەین، کە خوا پێی بەخشیوە، دەتوانێ زانین بباتەوە و خۆی بە گونجاوی فرمانەکانی لە جیهاندا ئەنجام بدات. ئەم بنەمایە لە یەکەم لێوردبوونەوەدا وەک گەشـبین دەردەکەوێ، بەڵام لە بنەڕەتدا ئاوها نییە، چونکە رازی زۆر چاک رەچاوی شیمانەی نوشستیهێنان دەکات، بەڵێ ئەو تەنانەت بۆ ئەو نشوستییە پێشبینیی سـزایەکیش دەکات، چونکە، لـە روانگەی ئەو، کێ ژیانی خۆی بۆ زانین (و ئەو کردارە دروسـتە، کە لەو زانینەوە وەک سـەرەنجام دەکەوێتەوە) بەگەڕ نەخات، ئەوا دەبێ حساب بۆ ئەوە بکات، کە جارێکی دی وەک زیندەوەرێکی پلە نزمتر لەدایکبێتەوە. بەڵام لەم حاڵەتەشـدا هێشـتا هەر تەنها هیوایەک بۆ کۆتاییەکی باش دەمێنێتەوە، چونکە ئەو کەسە لەم دۆخە نوێیەشدا تەنها هەلێکی بۆ هەڵدەکەوێ تاکو هەڵەکانی راست بکاتەوە و لە پرۆسەی هەڵچوونی دەروونیدا بەشداری بکات. ئێستا بەمە ساغ دەبێتەوە، کە سـەرجەم مرۆڤان لە هەر کاتێکدا بێ هێزە زەینییەکەیان (ئینتەلەکتوێلییەکەیان) بەگەڕ دەخەن و دەروونیان ئازاد دەکەن.

بێگومان دەشـێ ئەم بڕوایەش بە هەندێک پێشبینیی ئەنتیکەوە ببەسترێتەوە. ئەم بڕوایەی رازی، بەهێزتر لە لێهزرینە کۆسمۆلۆژییەکانی پێشین، دەمانبات بۆ پلاتۆنیزم. بێگومان ئەمە جێی سەرسووڕمان نییە. ئاخر رازی پزیشک بوو، ئەو بەچوستی نووسینە دوور پەلهاویشتووەکانی گالنی دیراسە کرد (لەم نووسینانە هەتا کۆتایی سەدەی نۆیەم پتر لە سەد دانە بۆ عەرەبی وەرگێڕرابوون). بەڵام گالن تەنها بۆ ئەوە نەناسرا بوو، کە ئەو دەروازەیەکی فراوانی فەلسەفیی هێنایە نێو پەروەردەی پزیشکییەوە، بەڵکو ئەو هاوکات لایەنگرێکی پلاتۆنیزم بوو و تەنانەت لێکۆڵینەوەیەکی (لەپاڵ هەندێکی دیکەدا) نووسـی، کە تێیدا بە وەستایەتییەکی فێرکارییانە پێوەری خوێندنەوەکانی پلاتۆنییەکانی پوخت کردەوە.

بەڵام رازی لێرەشـدا هەمان هەڵوێسـتە بنەماییەکـەی خۆی وەردەگرێتەوە: ئـەو نەک تەنها بەبێ دەسـتکاری ئەو موڵکە فێرکارییەی وەرنەگرت، بەڵکو هەروەها خسـتییە نێو کۆنتێکستێکی (سیاق) نوێـوە. مۆرکی ئەم پەیوەندییە نوێیەی کێشـەکە لەوەدا بوو، کە ئێسـتا زانینـی ئەقڵانە زانینێکی هاڤرکێکەری بۆ پەیدا بوو، ئەمەش ئەو زانینە بوو کە رووی دەکردە سروشی خوایەتی. رازی، پابەند بە ئێپیێستیمۆلۆژییەکەیەوە، بەتوندی داواکارییەکانی ئەو زانینە دەگەڕێنێتەوە، چونکە ئەو لەو بڕوایەدایە، کە خوای میهرەبان و بەداد توانستی زانینی بە سەرجەم مرۆڤان بەخشیوە، لەبەر ئەم هۆیە، لە روانگەی رازی، مەحاڵە کەسانی تاک زانینێکی دیکەی تایبەتمەندی سروشییان لە لایەن خواوە بۆ بێت (...).

ئەو مرۆڤە وەک لەخشـتەبەرێک پەیڕەوی سروشـێک دەکات، کە ئەو لە بنەڕەتدا بە هیچ شێوەیەک وەک سـروش بۆی نەهاتووە، ئینجا ئەو کەسـە لە پشتی خۆیەوە کۆمەڵێکی بە حساب ئیمتیاز پێدراو کۆدەکاتەوە و ئەم کۆمەڵەیەش هیچ کارێکی باشـتری لێ ناوەشێتەوە جگە لەوەی لە دژی کومەڵەکانی دیکە، کە ئەوانیش بە هەمان شێوە وای دادەنێن خاوەنی راستیی سروشییانە بن، جەنگ بگێڕێ.

ئـەم جۆرە دەربڕینانـەی رازی وایان کرد کە لە چـاوی زۆر لە هاوچەرخەکانیـدا وەک زەندیقێکی خوانەناس دەربکەوێ. ئەمە بێگومان لەنێو کۆمەڵگەیەکدا ئاشـکرایە، کـە تەنها لە یەک پەیامبەرەوە

ئاراستە وەردەگرێ. بەڵام ئەم جۆرە تۆمەتانە بە هیچ شێوەیەک مەبەستەکەیان نەدەپێکا. ئاخر مەبەستی رازی ئـــەوە نەبـــوو، کە ڤێهەیەی یان واتای خوا بخاتە ژێر پرســـیارەوە. بەگوێرەی ئەوەی کە ئێمە هەتا ئێستا بینیمان، رازی دەیویست خوا وەک گەرەنتییەکی تاک و راستەوخۆ بۆ رزگاریی (ئینقاز) سەرجەم مرۆڤـــان دیاری بکات. ئەم رەهەندە چ مێتافیزیک و چ تیۆریی زانینەکەی ئەوی تەنی بوو، ئەمەشـــمان جارێکی دی بۆ دەردەکەوێتەوە، گەر روو بکەینە تێڕوانینە ئێتیکییەکانی ئەو.

روانگەکانی رازی لە کایەی ئێتیکدا کەمتر هەژێنەر و شێوێنەر بوون. رەنگە لەمەدا بێ هۆی مانەوەی ئەو دوو لێکۆڵینەوەیە، کە رازی لەســـەر ئەم تێمە (کێشـــەیە) نووســـیەنی: («پزیشـــکیی هۆشەکی» و «شـــێوە ژیانی (ســـیرەی) فەلســـەفی». رازی لە یەکەم لێکۆڵینەوەیاندا شـــیمانەی پەروەردەکردنی دەروون بۆ رەوشـــت روون دەکاتەوە. لەم پەروەردەیەدا چ بەرهەڵستیکردنی سۆزەکان رۆڵێک دەگێڕن و چ ئەو متمانەیەش بەوە، کە ئەوە زەینی مرۆڤە پێوەری راســـت بۆ ســـەرجەم کردار و چێژەکان دادەنێ. لێکۆڵینەوەکەی دووەم، کە پێدەچێ رازی ماوەیەکی کورت پێش مەرگی خۆی نووســـیبێتی، زۆر مۆرکی کەســـیانە لە خۆ دەگرێ. رازی لەم نووســـینەیدا لـــە دژی رەخنەگران بەرگری لـــە خۆی دەکات. ئەو رەخنەگرانە دەبێ لۆمەی رازییان کردبێ، کە ئەو گوایە ژیانی بەڕەوشـــتی (بەتایبەتی ژیانی ئاسکێزیی (زاهید)) بۆ مرۆڤانی دیکە راگەیاندووە، بەڵام ئەو خۆی لە ژیانیدا بەگەڕی نەخستووە.

وەڵامەکـــەی رازی بۆ ئەم لۆمانە (ئەمەش لە ناونیشـــانی لێکۆڵینەوەکـــەدا دەردەکەوێ) بریتییە لە «شـــێوە ژیانی فەلســـەفی». رازی لێرەدا بەدەوری فیگوری سۆکراتدا دەسووڕێتەوە، کە وەک نموونەی مرۆڤی زانەر و بەڕەوشـــت پێشـــبینیی دەکات. لە روانگەی رازی سۆکراتیش ناچار بوو سەرەتا خۆی بۆ ئەم چۆنێتییانەی زانین و رەوشـــت پێبگەیەنێ. ئاخر ســـۆکرات لە گەنجێتیدا زۆر یەکلایەنییانە بیری لـــە ژیانێکی ئاســـکێزی (زاهید) و دوورەپەرێز کردبۆوە) (ئەمە لەتـــەک راڤەی کینییانەی فیگورەکەی ســـۆکراتدا دەگونجێ)، بەڵام ســـۆکرات درەنگتر ئەم هەڵوێســـتەی خۆی گۆڕی، چونکە ئەو ئێستا وەک پیاوێکی کامڵ فێر بوو بوو خۆی لەتەک ئەو داواکارییانەدا بگونجێنێ، کە پێویستە مرۆڤێک بۆ خۆی بەرزیان بکاتەوە (ئەمەیان لەتەک راڤەی پلاتۆنییانەی سۆکرات و پرۆگرامە فەلسەفییەکەی رازی خۆیدا دەگونجـــێ). داواکارییەکان بریتین لەمانە: گەڕان بەدووی زانیندا «کرداری بەداد» هەبوونی بەزەیی بۆ کەسانی دیکە «سەنگاندنی پڕمەغزای (ئەمدنیایی و ئەودنیایی) چێژەکان» «متمانەکردن بە خوایەکی میهرەبـــان» هەروەهـــا ئەو بڕوایە، کە ئێمە دەروونمان بەڕێی زانین و رەوشـــتەوە ئازاد دەکەین و دوای مەرگمان بەرەو رووی ژیانێکی بەختیار دەڕۆین.

### سەرچاوە:

ULRICH RUDOLPH، ISLAMISCHE PHILOSOPHIE، MÜNCHEN 2004

# گوتار لە نوسینەکانی فۆکۆدا

حەمید عەزدانلو
لەفارسییەوە: ڕێبین هەردی

فۆکـــۆ یەکەم کەس نیە کە بواری کارکردنی گوتار لە پەیوەندیدا بە بابەتیبونی کۆمەڵگاوە تاوتوێدەکات. لەراســـتیدا فۆکۆ لە پەیڤەیەک دەچێتە سەرەوە کە یەکەم پلەکانـــی لەلایەن مارتیـــن هایدگەر و ئەمیل بنفیســـتەوە داڕێـــژراوە. بەڵام فۆکۆ هەنگاوی لە هەمویان زیاتر ناوە و مانایەکی تازەی بەم چەمکە بەخشـــیووە. ڕەنگە بەجورئەتەوە بتوانین ئەوە بڵێین کە بەکارهێنانی ئەم چەمکە لای فۆکۆ زیاترە لەو کەســـانەی کە پێش خۆی لەبارەیەوە نوســـیویانە. هەر لەبەر ئەمەش شیکردنەوەی ئەم چەمکە لە نوسینەکانی فۆکۆدا پێویستی بە کتێبێکی ترە کە هەڵیدەگرین بۆ کاتێکی دی. لێرەدا تەنها بە شـــیکردنەوەیەکی چڕی ئەم چەمکە لە نوســـینەکانی فۆکۆداو بەکارهێنانەکانی، واز دەهێنین.

گوتار لای فۆکۆ «بریتیە لە جیاوازی نێوان ئەوەی دەکرێت لە قۆناغێکی دیاریکراودا (بەپێی ڕێســـا ڕێزمانیو لۆژیکیەکان) بەشێوەیەکی دروســـت بگوترێت، و ئەوەی بەڕاستی دەگوترێت»[1]. بەم پێناسەیە فۆکۆ سەرنجی ئێمە بۆ تواناکانی سیستەمی زمان رادەکێشێت، سیستەمێک کە ناکرێت هەموو تواناکانی بەکاربهێنرێت. لەڕاستیدا زۆرێک لە تواناکانی سیســـتەمی زمان لەبەر دەســـتوپێگربوونی ڕێساکانی ڕێزمانو کاری تاکتیکیان، فەرامۆشـــدەکرێت. بەپێی ئەم تێگەیشـــتنە، نوسەر یان وتاربێژ لەکاتی نوسین یان قسەکردندا، لەناو کۆت و بەندەکانی سیستەمی زمانو تواناکانی پەیوەندی کە لەناو زماندا شـــاراوەیە و لەناو جەرگەی خودی سیستەمەکەدایە، دێت و دەچێت.

گوتار هەمان ئەو شـــتەیە کـــە لەنێوان ئەم دوو بوارەدا، واتە کۆتوبەندەکانی زمان و توانســـتەکانی پەیوەنـــدی کە لە سیســـتەمی زمانـــدا شـــاراوەن، روو دەدات. بە دەربڕینێکـــی دی و وەک فۆکۆ خۆی دەڵێـــت «مەیدانی کارکردنی گوتار، لە ســـاتەوەختێکی دیاریکراودا، هەمان یاســـای ئەم جیاوازیەیە و پێشـــاندەری کۆمەڵێک کرداری تایبەتە کە نە ســـەر بە رێکخســـتنێکە کە لەناو بونیادی زماندا هەیە، نە ســـەر بە تێڕوانینی وێنەییە بۆی»[٢]، بەڵکو شـــتێکە کە هەردوکیان دەگرێتەوە. فۆکۆ ســـەرنجمان بۆ ســـاتەوەختێک رادەکێشێت کە تیایدا گوتار لەدایک دەبێت، ساتەوەختێک کە تیایدا هەڵگری گوتار لەرێگەی سیســـتەمی زمانەوە، بوون پەیدا دەکات..بونێک کە پەیوەستە بە هەلومەرجی دیاریکراوەوە... بەدەربڕینێکـــی دی گوتار لە زەمەنی هەنوکەدا و لە پەیوەندیدا بە هەلومەرجی دیاریکراوی بەرهەمهێنی گوتارەوە بەرهەمدێت. جا چ بەرهەمهێنی گوتار لە ریوایەتی خۆیدا کاری رابردوو بەکاربێنێت، یان کاری بەردەوام یان کاری تەواو یان هەر کارێکی تر. ئەوە بەرهەمهێنی گوتارە کە لەرێگەی سیســـتەمی زمانو ئەو هەلومەرجە دیاریکراوەی لەناویدا دەژی، بوونی خۆی ئاشکرا دەکات.

لەلای فۆکۆ «گەشـــەکردنی مەیدانی گوتار لە بوارێکدا روودەدات کە تیایدا ئاخاوتنو نوسین دەتوانن بینەهۆی گۆڕینی کردای روبەڕوبونەوەو جیاوازبونیان. ئەم مەیدانە بەشێوەی کۆمەڵێک رێسای پراکتیکی دەردەکەوێـــت کە نە تەنی دەرەکیو دیاردە تەســـلیمی زیرەکی فکر لە دەرونـــدا دەکاتو نە دەرکەوتنی روکەشـــیانەیان، زیهن دەکاتە قوربانی سەختی شـــتەکان»[٣]. ئەمە بەمانای ئەوەیە کە نە زیهنیەتی ئێمە لە سەداســـەد تەســـلیمی هەلومەرجە دیاریکراوەکانەو نە هەلومەرجە دیاریکراوەکان لە سەدا سەد دیاریکـــەری زیهنیەتی ئێمەیە. ئـــەم دوانە لەرێگەی بونیادی زمانەوە دروســـتکەرو داهێنەری یەکدین. لەڕاســـتیدا فۆکۆ بەهەمان رێگەدا دەڕوات کە پێشـــتر هایدگەر پیایدا رۆیشـــتبوو. زمان بۆ هەردوو ئەم بیریارە هەم دەرگای چونە ناوەوەی زیهنیەتە بۆ ئۆبژەکتیڤ، و هەم دەرگای شکڵوەرگرتنی ئۆبژەکتیڤە لە زیهنیەتدا.

فۆکۆ بە ســـودوەرگرتن لە چەمکی ئەپســـتیم، بونێتی فکر بەپێی گوتار وەسفدەکات[٤]. فۆکۆ لەژێر کاریگەری بیریارانی وەک هایدگەرو بنفیسنتدا گوتار وەک رێگایەک بۆ بەمادیکردنی زمان هەڵدەبژێرێت کـــە لەرێگەیەوە تاکەکان لـــە پەیوەندیدا یەیەکـــدیو دنیایەکدا دادەنێت کە لەناویـــدا جێگیرن. فۆکۆ بەڕاشـــکاوی ئـــەو نمونەیەی فکر رەد دەکاتـــەوە وەک دیاردەیەکی زیهنی، یـــان وەک بوارێکی بەرزتر و تراســـندنتالی بەهاکان یان وەک وێنەیەکی ئەزەلیو نەمر دەیبینێت. زورجار رەتکردنەوەی ئەم نمونەیە لەلایـــەن فۆکۆوە وەک جۆرێـــک نەیارێتی فۆکۆ لەگەڵ هیومانیزمدا تەفســـیردەکرێت. بەڵام گرنگی ئەم رەتکردنەوەیـــە دەگەڕێتـــەوە بۆ جەختکردن لە رێگەیەک کە کاری رەخنەگرانە بێ شـــاردنەوەی، ئاڵۆزو دوبارە ئاراستە بکاتەوە.

فۆکۆ بە پشتبەســـتن لە گوتاربوونی فیکر، ســـەرنجی ئێمە بۆ ئەو خاڵە ڕادەکێشێت کە بیرکردنەوە هەمیشـــە بەشـــێکە لە هەلومەرجی مێژوویی کە پێناسکەری کۆمەڵگا بووەو هەیە. فۆکۆ پەیوەندیەکی ئەنتۆلۆجیانە لەنێوان بیرکردنەوەو ئازادیدا دروستدەکات. فۆکۆ بە دروستکردنی ئەم پەیوەندیە، ماوەی نێـــوان بیرکردنەوە و واقع کە پارێزەری بیرکردنەوەیە لـــە بەرامبەر واقعدا لەناودەبات. ئەم ماوەیە لەلای بیریارێکی وەک مارکس دەرکەوتی بۆشـــاییەک بوو کە پەیوەندی نێوان پرۆلیتاریاو دەسەڵاتی دەوڵەتی پێناس دەکرد. بەڵام لای فۆکۆ کاتێک قبوڵیکەین بیرکردنەوە خۆی لە گوتاردا بەرجەستەدەکات —دیارە بەئاشکرا و نەک لە تەسەوردا– ئیدی هەوڵدان بۆ ناسینی بۆشایی ئەو رێکخستنانە بێ سودە، کە وزە بە ململانێ لەســـەر دەسەڵات بەهێزدەکات. لەبری ئەمە دەبێت لەگەڵ گوتاردا وەک مەیدانێکی ناهاوئاهەنگ

و ناپەیوەست مامەڵە بکرێت کە تیایدا مرۆڤەکان لە هەڵوێستی جیاوازو ناکۆکدا راوەستاون. ئەمە بەو مانایە نیە کە مرۆڤەکان لەبەردەم هەلومەرجی وەبەرهێنانی (ئیستسماری) کاردا نین، ئەمە تەنها بەو مانایەیە کە هەلومەرجێکی وا ناتوانێت بەشێوەیەکی سەقامگیر، ئامادەکاری بواری سیاسی بە دەزگایەکی لۆژیکی پێویست بکات. لە ئەنجامدا بیرکردنەوەو بیرکردنەوەی رەخنەگرانە کە خۆی لە گوتاردا دەردەخات، هەمیشە لە حاڵەتی پڕ بەرهەمبووندایە . چونکە هەلومەرجی ناتەبای مرۆڤەکان دروستکەری قەیرانو ئەو ناکۆکیانەیە کە کۆنترۆڵ ناکرێن لەناو دەرونو لەنێوانیاندا. لەراستیدا فۆکۆ بە گوتار دانانی بیرکردنەوە، ئەرکی رونکردنەوەی وردەکاریەکانی رەخنەگرتن لە عەقڵ دەهێنێتە ئاراوە، بەتایبەتی ئەو کاتەی عەقڵ دەچێتە ناو ئاڵۆزیەکانی دەسەڵاتی رێکخەرەوە کە جێگەی کەسە ئەکادیمیەکان وەک پسپۆڕ، کارشناس، راوێژکاران و مامۆستایان دەستنیشانی دەکەن. دیارە ئەمە یەکێکە لەو خاڵانەی کە بۆتە هۆی وتوێژ لەنێوان فۆکۆو هابرماسدا کە جوڵەی هەڵگێڕانەوەی بیرکردنەوەی رەخنەگرانە لەبەرامبەر هەلومەرجو توانا دیاریکراوەکانیدا، وەک بێتواناکردنی نەهلیستیانەی ناکۆکی نەفس تەماشادەکات[٥].

لەگەڵ ئەمەشدا لەرێگەیەکی تایبەتەوەو بەهۆی پرۆسەیەک بۆ وێنەکێشانی هەلومەرجەکانی توانای خودی عەقڵ، جوڵەی فۆکۆ خۆی لەو »فەلسەفە دۆگماییەی» کە کانت رەتی کردبۆوە، رزگاردەکات- نەک وەک توانایەکی فکری، بەڵکو وەک هۆکاری گوتاری چالاکی کۆمەڵایەتی- مێژوویی کە دروستکەری کەسانێکە کە خۆی بە دانا دادەنێت. دیارە ئامانجی فۆکۆ ئەوە نیە کە چاکسسازی لە میردا بکات، بەڵکو وەک خۆی دەڵێت «بەنیازە شەجەرەنامەی میر رونبکاتەوە و پاشان سەری ببڕێت»[٦].

یەکێک لە خەسڵەتەکانی بیری فۆکۆ ئەوەیە گوتارەکان لە پەیوەندیدا بە کارکردنیانەوە هەڵدەسەنگێنێت. گوتارەکان تەنها نوسینەکان، کتێبەکان، تێکستەکانو وتاربێژیەکان نین، بەڵکو نمونەکان و بەکارهێنانەکانیشیانن. بەدەربڕینێکی تر فۆکۆ رێگەیەک دەخاتە پێشمان کە لەرێگەیەوە دەتوانین هەم لە دەرەوە بۆ ناوەوە، و هەم لە ناوەوە بۆ دەرەوەی تێکستەکان بجوڵێن. فۆکۆ ئەوەی کە لە زەمەنە جیاوازەکاندا شکڵ بە گوتارەکان دەدات، ناودەنێت ئەپستیمەکان. ئەم ئەپسیتمانە کۆمەڵێک رێسای ناهوشیارانەن کە لەرێگەیانەوە وشەکانو شتەکانو کردارەکان تێکدەئاڵێن. ئەم رێسایانە کۆمەڵێک تۆڕن، کە بەکارهێنانی گوتارەکان مومکین دەکەن. لەراستیدا فۆکۆ لەو فۆرمالیستانە نیە کە تەنها بەدوای هێنانەئارای دوالیزمە روبەروەکانی یەکدی بن کە شکڵ بە لۆژیکی تێکستەکان دەدەن. فۆکۆ گوتار و بەکارهێنانەکانیان بەیەکەوە هەڵدەسەنگێنێت.

یەکێکی دی لە خەسڵەتەکانی بیرکردنەوەی فۆکۆ ئەوەیە گوتار لە پەیوەندیدا بەدەسەڵاتەوە پێناسەدەکات. گوتاری لای فۆکۆ دەربڕینی ئایدیالیستانەی خەیاڵەکان نیە، بەڵکو لە چوارچێوەیەکی تەواو ماتریالستیانەدا، بەشێکە لە بونیادی دەسەڵات لەناو کۆمەڵگادا. گرنگی گوتارەکان لەوەدایە کە ئاشکراکەری گەمەی دەسەڵاتە لە جێگە دیاریکراوەکاندا. گوتارەکان دەربڕی ئایدۆلۆژی پێگەی چینایەتی نیە، بەڵکو کردارگەلێکی دەسەڵاتاوین کە شکڵ بە ژیانی خەڵک دەدەن. لێرەوە بۆ تێگەیشتنی مێژووی گوتارەکان، دەبێ لێکۆڵینەوە لە خودی گوتارەکان بکرێت، تا لەرێگەیەوە بتوانرێت ئەو شێوازە جیاوازانەی پێیان دراوە ئاشکرا بکرێت.

لای فۆکۆ شوێنەکانی پەروەردە بە بەرهەمهێنەرانی گوتاری تایبەتی مێژوویی (مۆدیرن) دادەنرێن، واتە ئەو شوێنانەی کە تیایدا دروستیو نادروستی، قەبوڵکردن یان نەکردنی هەندێک لە مافەکانی قسەکردنی مۆدێرن بەرهەمدێت. شوێنەکانی پەروەردە نەک هەر بابەتی گوتارن، بەڵکو بەشێوەیەکی چڕ لە بڵاوبونەوەی گوتاردا، واتە لە «دیاریکردنی چارەنوسی کۆمەڵایەتی» گوتارەکاندا بەشدارن. ئەم

دەزگایانە (واتە شــوێنەکانی پەروەردە) کۆنترۆڵی دەستگەیشتنی تاکەکان بە شێوە جیاوازەکانی گوتار دەکەن. «بەڵام ئێمە بە باشی دەزانین کە لە پرۆسەی دابەشکردنو ئەوەی ڕێگەی پێدەدرێت و یا ڕێگەی لێدەگیرێــت، ئەم دەزگایانە پەیڕەوی ئاراســتەیەکن کە بەهۆی جیاوازیــەکان، ناکۆکیەکان، و ململانێ کۆمەڵایەتیەکان خراوەتە ســەر ڕێیان. هەر سیستەمێکی پەروەردەیی ئامرازێکی سیاسیە بۆ مانەوە یان چاکســازی گونجانی گوتارەکان لەگەڵ زانین و دەســەڵاتێکدا کە لەگەڵ خۆیاندا دەیهێنن»[٧]. لە سەرو هەموو ئەمانەشــەوە دەبێ ئاماژە بۆ ئەو خاڵەش بکرێت کە لە پەروەردەکردن، دابەشکردنو گونجاندنی گوتارەکاندا لە ڕێگەی «تاقیکردنەوە»وە، ئەم «تەکنیکە ناسکەی» کە تیایدا دەکرێت بواری هەمەکی زانینو شــێوازێکی هەمەکی دەســەڵات بدۆزرێتەوە، ناوبژیوانی دەکرێت. لێرەوە دەکرێ ئەو دەرئەنجامە وەربگیرێ کە «تاقیکردنەوە» چەمکێکی ســەرەکیە بۆ تێگەیشتن لە پەیوەندیە دەرونیەکانی زانینو دەسەڵات.

مێژوو لای فۆکۆ مێژووی شــێوە جیاوازەکانە کە بەهۆیانەوە لە کلتوری ڕۆژئاوادا، مرۆڤەکان دەبنە سۆبژێکت یان بابەتی لێکۆڵینەوە[٨]. ئەمە هەمان بەشتبوونی مرۆڤە، بەهۆی پرۆسەکانی شیکردنەوەو جیاکردنــەوە. ئەم پرۆســەیە کە فۆکۆ ناوی دەنێــت «کردارەکانی جیاکردنەوە»، بــە ڕوونی ناوەندی قورسایی پرۆســەکانی پێکهاتەی پەروەردەن لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا. ئەم جیاکردنەوانەو بەشتبونانە یان لە خودی مرۆڤدا دەرونی دەکرێت کە ســۆبژێکتی لێکۆڵینەوەیە، یان لەناو سۆبژێکتو ئەوانی دیدا. بەکارهێنانــی ئەزمون، تاقیکردنەوە، دەرکەوتەو ڕوداوەکانی فێــرکاری، بەکارهێنانی مەرجەکانی چونە ناوەوەی خوێندن لە لقە جیاوازەکاندا، و ڕێکخســتنی جیاوازی زیرەکی، هوشــیاری، تواناکانو شوناسی قوتابخانەیــی لــە قۆناغەکانی خوێندندا، تەنها کۆمەڵێک نمونەن بۆ ئەم (کــرداری جیاکردنەوانە). لەم ڕێگەیانەوە و بە بەکارهێنانی ئەم تەکنیکانەو شــێوە جیاوازەکانی پێکهاتەکان، داهێنانی بەرنامەکانو تەکنیکەکانی پەروەردەی جیاوازو شــێوە جیاوازەکانی پەیوەندی مامۆســتاو خوێندکار، شوناسەکان و تاکایەتیەکان شکڵ وەردەگرن، فێر دەبنو دەگوێزرێنەوە. لەڕێگەی دروستکردنی گروپە پێشکەوتوەکانو چارەسەر بەخشەکانەوەو، جیاکردنەوەی ئەو کەسانەی کە لەڕووی فێرکاریەوە ناسروشتینو درەنگ فێر دەبن، واتە ئەو کەســانەی پێویســتیان بە «پەروەردەو فێرکاری تایبەت» هەیە، تواناکان دەستنیشان دەکرێنو دەچنە ژێر کۆنترۆڵی ڕێسا و یاساوە. لە دەرئەنجامدا سیستەمەکانی پەروەردە کە بەرهەمهێنی گوتارن، هەم دەکەونە ژێر کاریگەری بونیادی دەســەڵاتی سیاســی کۆمەڵگاوەو، هەم بەشــێوەیەک لە شــێوەکان دەبن بە بەرهەمهێن و دوبارە بەرهەمهێنانەوەی ئەم بونیادە. بەدەربڕینێکی دیو وەک فۆکۆ خۆی دەڵێت، زانینو دەسەڵات لەناو گوتاردا دەبن بە یەک شت.

فۆکۆ بەدوای گوتاری ڕاستەقینەدا دەگەڕێت. ڕاستی بۆ فۆکۆ ئەو ڕاستیە نیە کە فەیلەسوفان بەدوایدا دەگەڕێــن. ئــەوەی فۆکۆ بەدوایدا دەگەڕێت جیاوازە لەوەی کە بۆ نمونــە کانتو هیگڵ بەدوایەوە بوون. فۆکۆ بەدوای ئەو تێکســتانەوە نیە کە تیایدا باشترین لێکۆڵینەوەکان یان سەقامگیرترین لۆژیکەکانی هێناوەتــا ئاراوە. فۆکۆ لەبــەر ئەو هۆیە لە گوتــارەکان ناکۆڵێتەوە کە شــیکردنەوەیەکیان بۆ بکات. گوتارەکان لای فۆکۆ ناوکی دەسەڵاتن. نابێت گوتارەکان لە ڕوانگەی دیدەکانی نوسەر یان خوێنەرانیەوە ببینرێت، بەڵکو دەبێت لەو دیدەوە ببینرێت کە چۆن دروستکەری پەیوەندیەکانی دەسەڵاتن. بۆ نمونە بۆ تێگەیشتن لە گوتاری وەک «ڕۆژئاوایبوون» یان «هێرشی کلتوری» لە ئێراندا، نابێت ڕوو بکرێتە نوســەرانی وەک ئال ئەحمەد یان شــەریعەتی یان کەســانی تر کە ڕەنگە بە بەکارهێنانی ئەم چەمکانە زۆرتریــن کاریگەریان هەبووە، بەڵکو دەبێت بەدوای ئەو گوتارەوە بین کە لەناو کۆمەڵگادایە و نزیکترە

لە ترپەی ژیانی کۆمەڵایەتیەوە . لەڕاستیدا بۆ تێگەیشتن لەم گوتارە دەبێت پەیوەندی بە خەڵکی کۆڵانو بازاڕ، کرێکارو کارمەندو خوێندکارەوە بکرێت، چونکە لە گوتارەکانی ئەم خەڵکە ئاسایەدایە کە گەمەی دەسەڵاتو مەسەلەی رۆژئاواییبوون» یان «هێرشی کلتوری» خۆی ئاشکرا دەکات.

فۆکۆ لە یەکێک «لە وتارەکانی خۆیدا لەژێر ناونیشانی «دانەر چییە؟»»[٩]دا، جیاوازی لەنێوان دانەرو نوسەردا دەکات. لای فۆکۆ بەرهەمهێنی گوتار ناتوانێت بێ کاریگەری وەرگرتن لە هەلومەرجە دیاریکراوەکانی خۆی، گوتارێک بەرهەم بهێنێت. ئەوە راستە کە خەسڵەتە تایبەتیەکانی بەرهەمهێنی گوتار لە گوتارەکەیدا دەردەکەوێت، ئەم بەرهەمهێنە تێڕوانینو تەفسیری خۆی بۆ هەلومەرجە دیاریکراوەکان هەیە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نیە کە ئەم بەرهەمهێنەی گوتار بێ کاریگەری وەرگرتن لە هیچ سەرچاوەیەکی دی، دروستکەری گوتار بێت. بۆ نمونە گەرچی نوسەری کتێبی «رۆژئاواییبوون» ئال ئەحمەدە، بەڵام دانەری گوتاری «رۆژئاواییبوون» خودی کۆمەڵگایە، بۆ تێگەیشتنی باشتر لەم گوتارە نابێت تەنها بە دیدی نوسەر واز بهێنین، بەڵکو دەبێت بگەڕێینەوە بۆ خودی کۆمەڵگاش.

فۆکۆ گوتارەکان نەک لەبەر مانا شاراوەکانی، بەڵکو بۆ تێگەیشتن لەو هەلومەرجەی گوتارەکان لەناویدا لەدایک دەبن و ئەو گۆڕانکاریانەی گوتارەکان دروستیدەکەن دەخوێنێتەوە . فۆکۆ سەرنج لەو مەیدانانە دەدات کە تیایدا چەندان گوتار پێکەوە دەژینو پاشان لەناودەچن. بە دەربڕینێکی دی فۆکۆ گوتارەکان لە رەهەندە دەرەکیەکانیدا شیدەکاتەوە . فۆکۆ بەدوای یاساکانی دروستکەری گوتارەوە نیە، بەڵکو بەدوای تاوتوێکردنی هەلومەرجێکەوەیە کە گوتار لەناویدا دەژی. فۆکۆ بۆ ناسینی گوتار، روو ناکاتە بیرکردنەوەی بیریاران، بەڵکو رودەکاتە ئەو مەیدانەی کار کە گوتار تیایدا گشتگیر دەبێت[١٠].

لای فۆکۆ گوتارەکان رەگەز یان قاڵبەکانی تەکنیکین کە لە بواری پەیوەندیەکانی دەسەڵاتدا کاردەکەن. دەکرێت لەناو یەک ستراتیژیەتدا گوتاری جۆراوجۆر و تەنانەت ناکۆک بەیەک هەبێت[١١]. کەوابوو ئێمە نە دەتوانین و نە دەبێت چاوەڕێ بین کە بۆ نمونە گوتارەکانی وەک»رۆژئاواییبوون» یان «هێرشی کلتوری» لە چ جۆر ستراتیژیەکەوە سەرچاوەیان گرتووە، چ جۆرە مەسەلەیەکی ئەخلاقیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە، یان چ ئایدۆلۆژیایەکی ( ژێردەست یان سەردەست) دەردەبڕن.

خەسڵەتەکانی تری بیرکردنەوەی فۆکۆ ئەوەیە گوتارەکان نەک تەنها لە پەیوەندیاندا بە دەسەڵاتەوە، بەڵکو بە زانینیشەوە هەڵدەسەنگێنێت. بەبڕوای فۆکۆ « دەسەڵاتو زانین لەناو گوتاردا دەبن بەیەک شت»[١٢]. لەبەرئەوەش کە زانینو دەسەڵات نەگۆڕو جێگیر نین، «ئێمە دەبێت گوتارەکان بە ئەڵقەگەلێکی دابڕاو بزانین کە کارکردنی تەکنیکیان نە یەکسانەو نە هەمیشەییە»[١٣]. دنیای گوتار لای فۆکۆ جیهانێکی دابەشبوو بۆ گوتارە قبوڵکراوو نەکراوەکان، یان بۆ گوتارە ژێر دەستو سەردەستەکان نیە . فۆکۆ جیهانی گوتار بە ژمارەیەک رەگەزی «گوتاری» دەزانێت کە دەتوانن لەناو ستراتیژی جۆراوجۆردا، بەکاربهێندرێن[١٤]. هەر ئەم دابەشبونەی ناو گوتارە کە فۆکۆ داوامان لێدەکات سەرلەنوێ بونیادی بنێینەوە، «لەگەڵ ئەوەدا کە هاتۆتە سەر زمانو ئەوەی نەگوتراوە، ئەوەی رەواو ئەوەی ناڕەوایە ( ئەو شتانەی کە گوتار لەخۆی دەگرێت) بە کاریگەرییە جیاوازو گۆڕاوەکانیەوە (چ کەسێک گوتوێتی، لەچ پێگەیەکی دەسەڵاتەوە، لەرێگەی چ دەزگایەکەوە)، بەگۆڕانی ئاراستەکانو دوبارە بەکارهێنانەوەی پێوەرە چونیەکەکان بۆ ئامانجی ناکۆک بەیەک (کە ئەمەش لەناو دەرونی گوتاردایە)»[١٥]. گوتارەکان لای فۆکۆ پاشکۆی دەسەڵات نین کە یەکجار بۆ هەمیشە یان لایەنگری بکەن، یان دژی بن. فۆکۆ سەرنجی ئێمە بۆ «رەوتی ئاڵۆزو ناسەقامگیری دەسەڵات» رادەکێشێت. لەلای ئەم بیریارە «ئێمە دەبێت ئاڵۆزیو ناسەقامگیری دەسەڵات — جێگەیەک کە گوتار دەتوانێت هەم ئامرازو هەم بەرهەمی

دەســـەڵات بێت، هەروەها ریگرێک، یان هۆکارێکی ترازان، خاڵێکی بەرگری و خاڵێکی دەســـتپێکردنی ســـتراتیژیەتێکی نەیار بێت- قبوڵبکەین»[١٦]. « گوتار هەم هەڵکەنی دەسەڵاتەو هەم بەرهەمهێنێتی، هەم بەهێزکەرێتیو هەم هەڵوەشـــێنەرەوەی»[١٧]. گوتار دەتوانێت دەسەلات بەجۆرێک هەڵوەشێنێت کە لەتوانای بخات. بێدەنگیو شـــاردنەوەش لای فۆکۆ «کۆمەڵێک پەناگای دەســـەڵاتنو هێز بە حوکمەکان لەبارەی ئەوەی نارەوایە دەبەخشـــن». بێدەنگیو شـــاردنەوە لەهەمانکاتدا زنجیرەکانی دەســـەڵات لاواز دەکەنو فەزا نیمچە تاریکەکانی ئاسانگیریو لێکبوردن ئامادە دەکەن[١٨].

بەکورتی فۆکۆ بەمشـــێوە بەکارهێنانـــەی چەمکی گوتار، رێنمایمان دەکات بـــۆ ئەوەی لە چەمکی «دەســـەڵات» بگەین، کە تیایدا «تێڕوانینی دیاریکراو، جێگەی یاسا، تێڕوانینە چالاکە تەکنیکیەکان جێگەی بەرزتربوونی قەدەغەکردن، شـــیکردنەوەی مەیدانی گۆڕاوی پەیوەندیەکانی هێز، جێگەیەک کە جێپەنجەکانی دوور لە دەســـتی دەســـەڵات (دەسەڵات کە بۆ هەمیشە ســـەقامگیر نیە) جێگەی مافی فەرمانڕەوایی دەگرێتەوە»[١٩].

لەڕاستیدا نمونەی ستراتیژی لە نمونەیەک کە لەسەر یاسا بونیادنراوە، بە بەزرتر دادەنرێت. ئەمەش نەک لەبەر هەڵبژاردنێک یان بەرزتربوونی تیوری، بەڵکو لەبەر ئەو راســـتیەیە کە یەکێک لە خەسڵەتە زاتیەکانـــی کۆمەڵگا رۆژئاوایەکان، ئەوەیە کە پەیوەندیەکانـــی هێز-کە دێرزەمانێک خۆیان لە جەنگدا لە هەموو شـــێوەکانیدا دەردەخست، هێواش هێواش خۆی بە جلوبەرگی رێکخستنی دەسەڵاتی سیاسی رازاندۆتەوە[٢٠].

## پەراوێز و سەرچاوەکان:


1- M. FOUCAULT, «POLITICS AND THE STUDY OF DISCOURSE" IDEOLOGY AND CONSCIOUSNESS, NO. 3(1978), P. 18

2- M. FOUCAULT, «POLITICS AND…" P.18

3- IBID, P. 15

4- YOUNG ROBERT, ED. UNTYING THE TEXT: A POST-STRUCTURALIST READER, LONDON: ROUTLEDGE AND KEGAN PAUL, LIMITED 1981, P. 47-48 BURCHELL, GRAHAM, GORDON, COLIN AND MILLER, PETER, EDS. THE FOUCAULT EFFECT: STUDIES IN GOVERMMENTALITY, CHICAGO: UNIVERSITY OF CHICAGO PRESS, 1991, PP. 53-72.

5- FOSTER, HAL, ED. THE ANTI-AESTHETIC: ESSAYS ON POSTMODERN CULTURE. TOWNSEND: PORT BAY PRESS, 1983, PP. 10-12

6- GORDON, COLIN, ED. POWER/KNOWEDGE: SELECTED INTERVIEWS AND OTHER WRITINGS 1972-77, NEW YORK: PANTHEON BOOKS, 1980, P. 121.

7- M. FOUCAULT, L ORDRE DU DISCOURSE, PARRIS: GALLIMARD, 1971, P.46

8- M. FOUCAULT, «THE SUBJECT AND POWRE», IN H. L. DREYFUS AND P. RABINOW (EDS) IN MICHEL FOUCAULT: BEYOND STRUCTURALISM AND HERMENEUTICS, BRIGHTON: HARVESTER PRESS, 1982, P.208

9- M. FOUCAULT, «WHAT IS A AUTHOR?, NIETZSCHE, GENEALOGY, HISTORY" IN THE READER (P. RABINOW, ED) HAMONDSWORTH: PENGUIN, 1984.

10- M. FOUCAULT, «POLITICS AND..» P.15

11- M. FOUCAULT, THE HISTORY OF SEXUALITY 1:AN INTRODUCITON, TR. BY ROBERT HURLEY, NEW YORK: VINTAGE BOOKS, JANUARY 1980, PP. 101-102.

12- IBID, P.100.

13- IBID, P.100.

14- M. FOUCAULT, THE HISTORY OF SEXUALITY.., P.100.

15- IBID, P.100.

16- IBID, P.101.

17- IBID, P.101.

18- IBID, P.101.

19- IBID, P.102.

20- IBID, P.102.

### سەرچاوە:

وەرگێڕانی فەسڵی سێهەمی ئەم کتێبەی خوارەوەیە
حمید عزدانلو: گفتمانو جامعه . تهران. نشر نی 1380

# تۆماس هۆبز و ئەندێشەی دادپەروەری

بەهرام موحی
لە فارسییەوە: ڕەزا مەنوچەهری

دەکرێـــت تۆمـــاس هۆبز بە بناغەدانـــەری دەوڵەتی مۆدێـــرن بزانرێت. هۆبز لە فەلســـەفە سیاسییەکەیدا گۆڕانکارییەکی ریشـــەیی بەسەر تێگەیشتنی سیستمی سیاســـی دادوەرانەدا دەهێنێت. هۆبـــز بەوردی لە گرنگترین نووســـراویدا، واتە لە کتێبی «لیڤیاتان»دا هێڵە ســـەرەکیەکانی خەسڵەت و شێوەو دەسەڵاتی دەوڵەتی مەدەنی دەستنیشان دەکات.

هۆبز لەژێر کاریگەریی (زانستە سروشتییەکان)ی سەردەمەکەی خۆیدایەو هەوڵ دەدات بـــەوردی لە قوڵایی بیرکردنەوەکانیدا ئەو رێســـایانە بخاتەروو کە مرۆڤەکان بتوانن لەســـەر بنەماکانی ئەو رێسایانە لە سیستمێکی سیاسیی کە دوور بێت لە هەرا و کێشـــەمەکێش، دادپەروەرانە ژیان بگوزەرێنن. تۆماس هۆبز بۆ ئەو مەبەستە ســـەرەتا لە مێشکی خۆیدا پێکهاتەی دەوڵەت بە تەواوەتی دەڕوخێنێت، پاشان بە هەڵســـەنگاندن و توێژینەوە لەســـەر دانە بەدانەی بەش و پێکهاتەکەی، سەرلەنوێ دەوڵەت بنیات دەنێتەوە. بەپێی بۆچوونی هۆبز دوا ئامانجی دەوڵەتەکان هیچ نییە جگە لە چەسپاندنی ئاشتی و دادپەروەری.

کەواتـــە ئـــەوەش لەگەڵ مۆدێلـــە تیۆریەکەی هۆبزدا دەگونجێـــت، بۆیە دەبێت سیستمێک (دەوڵەتێک) بەدی بێت کە بتوانێت ئەو ئامانجە بهێنێتە دی. لە روانگەی هۆبـــزەوە مـــرۆڤ کە وەک هێز و وزەی دەوڵەتە، خۆی لەخۆیدا بەشـــێوەیەکی رەها خۆپەسەندەو لەژێر ناچارێتیی حەزەکان و بێزاریەکانی خۆیدایە. هۆبز بەشێوەیەکی لێبڕاوانە دەکەوێتە دژایەتیکردنی ئەو بۆچوونەی ئەرەستوو کە دەڵێت: مرۆڤ هەر

بە سروشـــت بوونەوەرێکی سیاســـی و کۆمەڵایەتییە. -ئەو بۆچوونە لە ســـەدەکانی ناوەڕاستداو لەناو بیرورِاکانی (تۆمـــاس ئەکیۆنی) دووبارە دەکەونە بەر باس-. لەڕاســـتیدا هۆبز بۆ ئەوەی نیشـــانی بدات مرۆڤەکان پێش هەر شتێک، ئامانجیان پاراستن (مانەوە)و بەدەستهێنانی دەسەڵاتە، وێنای «هەلومەرجی سروشـــتی» دەکات، کە هەلومەرجێکی پێش پێکهێنانی دەوڵەتەو تاکـــەکان لەناو هەلومەرجێکی لەو شـــێوەیەدا دادەنێت. جێگەی خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە هەلومەرجە سروشتییە وێناکراوەکەی هۆبز نیشـــانەو رەنگدانەوەی هەلومەرجی کۆمەڵگاکەی ســـەردەمی خۆیەتی، کە جەنگە درێژخایەنەکان بونیادەکانی (کۆمەڵگاکەی) داڕوخاندبوو.

هۆبز ســـەرەتا لەپێناوی روونکردنەوەی چەمکی دادپەروەریدا دەست دەکات بە شیکردنەوەی «مافی سروشـــتی» و مافی سروشـــتی لەگەڵ ئازادیی هەر تاکێک بۆ بەکارهێنانی دەســـەڵاتی خۆی بەگوێرەی ویســـتی خۆی و لەپێناو پاراســـتنی ژیانی خۆیدا پێناســـە دەکات. لە ڕوانگەی هۆبزدا ئازادی بەمانای «نەهێشتنی رێگرییە دەرەکییەکانە». هۆبز لە درێژەی شیکردنەوەی «یاسای سروشتی»دا رادەگەیەنێت کە یاســـای سروشتی، یاسا یان رێســـایەکە کە بەهۆی ئاوەزی مرۆڤەوە دیاریکراوەو بەپێی ئەوەش هیچ مرۆڤێـــک رێگای پێنەدراوە کە ژیانی خۆی لەناو ببات، یان ئەو کەرەســـتەو ئامڕازانەی کە لە خزمەتی مانەوەیدایە لەناو ببات، یان کەمتەرخەمی لەو کارەدا بکات کە بە باشترین شێواز ژیانی دەپارێزێت.

هۆبز جەخت لەســـەر ئەوە دەکاتەوە کە بەزۆری و بەشـــێوەیەکی ئاسایی جیاوازی لەنێوان «ماف» و «یاســـا» دا ناکـــەن، لەکاتێکدا کە پێویســـتە لەنێـــوان ئەو دوو چەمکەدا جیـــاوازی رەچاو بکرێت، چونکە «ماف» پشتبەســـتووە بە بوونی ئازادی بۆ بەجێگەیاندنی کارێک، یان بەجێنەگەیاندنی، ئەوە لەکاتێکدایە کە «یاسا» دیاریی دەکات، یان ناچارت دەکات کە دەبێت چ کارێک بکرێت، یان چ کارێک نەکرێـــت. لەم میانـــەدا جیاوازیی نێوان «ماف» و «یاســـا» هەر وەک جیاوازیی نێـــوان «ئازادی» و «ئەرک»ە.

هۆبـــز لەو بڕوایەدایە کە سروشـــت، مرۆڤەکانی لەرووی بەهرەو توانای جەســـتەیی و دەروونییەوە یەکسان خوڵقاندوە. ئەگەر هەندێک جیاوازیی بچوکیش لەبواری بەهرەو توانای لەئارادا بێت لەو ئاستەدا نییـــە کە کەســـێک بە بەراورد لەگەڵ کەســـێکی دیکە پێگەیەکی بەرتر و ســـەرتری بـــۆ دابنرێت. بۆ نمونە، لەبواری هێزی جەســـتەییدا، لاوازترین کەس دەتوانێت بەهێزترین کەس بەفێڵ، یان بە یارمەتیی هاوپەیمانەکانی لەناو ببات. هەر ئەو یەکســـانییە سروشتییەی مرۆڤەکانە کە حەزو خولیای لێکچویش لەنێوانیاندا دروســـت دەکات. کەواتە ئەگەر دوو مرۆڤ لە دووی یەک شت، یان بابەتێکی دیاریکراوبن و هەردووکیان نەتوانن هاوکات ئەو شـــتە بەدەســـت بهێنن، یان داگیری بکەن دەبنە دوژمنی یەکدی و بۆ گەیشـــتن بەو ئامانجە هەر یەک لەو مرۆڤانە هەوڵ دەدات ئەوی دیکەیان لە گۆڕەپانەکە دەرپەڕێنێت، یان ملکەچی خۆی بکات، یان لەناوی ببات.

هۆبز بەو ئەنجامە دەگات، لەوێرا کە مرۆڤەکان بەشـــێوەیەکی خۆی و سروشتی یەکسانن هەر کەس (تاکێک) ئەو مافەی هەیە کە بەهۆی هەموو ئەو کەرەســـتانە کە لەبەردەســـتیدان، هەنگاوی پێویست بۆ مانەوەی خۆی و گەیشتن بە ئامانجەکانی بهاوێت. لە «هەلومەرجی سروشتی» دا جگە لە ململانێ و رەشـــبینی هیچ شتێکی دیکە زاڵ نییەو بەشـــێوەیەکی ناچاری «جەنگی هەموان بەدژی هەموان» ی لێدەکەوێتەوە. لە هەلومەرجێکی لەو شێوەیەدا هەر کەسێک مافی بەسەر هەموو شتێکەوە هەیە، تەنانەت مافی بەســـەر جەستەی کەســـانی دیکەوە دەبێت. کەواتە کەس لە ئاسایشدا نییە تاوەکو بەشێوەیەکی ئاســـایی ئەو تەمەنەی کە سروشت بۆی دیاریکردووە بژی. کەواتە لە هەلومەرجێکی لەو شێوەیەدا هیچ

دەســـتکەوتێکی شارســـتانیانە بوونی نییەو ئەوەی دەمێنێتەوە ترسێکی جێگرتوو و مەترسیی مەرگە، کە ژیانی مرۆڤ لەناو دابڕاوی‌و تەریکبوون، چەرمەســـەری و داماوی، قیزەون، ئاژەڵیانەدا دەهێڵێتەوەو ژیانێکی کەم تەمەنی دەخاتە بەردەم.

کاردانەوەیەکـــی دیکەی «جەنگی هەموان بەدژی هەموان» ئەوەیە کە هیچ شـــتێکی نادادپەروەرانە بوونی نییەو خاوەندارییەتییش ناتوانێت راستیی بوونی خۆی بپارێزێت، چونکە لە شوێنێکدا دەسەڵاتی گشـــتی زاڵ نەبێت، یاســـایش ناچەســـپێت، لەو شوێنەدا کە یاسا نەچەســـپێت، نادادپەروەری و زوڵم بێمانایـــە. مرۆڤـــەکان رێگایان پێدراوە هەموو کارێک بکەن تاکو پارێزگاری لە ژیانی خۆیان بکەن، ئەو ریگەپێدانەش بەکارهێنانی توندو تیژی و فریودان و فێڵیش دەگرێتەوە.

بەپێی بۆچوونـــی هۆبز، لە بنەڕەتدا لەناو هەلومەرجی جەنگـــدا توندوتیژی‌و فێڵ «دوو کارچاکیی (فەزیلەتی) سەرەکی»ن. لەوێڕا کە لە هەلومەرجێکی لەو شێوەیەدا بۆ هەر کەسێک ئەو مافە سروشتییە بوونـــی هەیە کە حەزی لەهەر شـــتێک بوو بەکاری بهێنێت و ســـوودی لێوەربگرێت، بەڕاســـتی کەس ناتوانێت ببێت بەخاوەنی هیچ شتێک، بەڵکو هەموو کەسێک تەنها خاوەنی ئەو شتەیە کە بە زۆرداری و فری و دەستی بەسەردا گرتووەو تەنها تاکو کاتێک خاوەنی ئەو شتەیە کە بتوانێت لە بەرامبەر دەست بەسەرداگرتنی کەسانی دیکە بیپارێزێت.

هۆبز لەو بڕوایەدایە مرۆڤ بەهۆی ترس لە مەرگ و ئاواتەخوازبوون بۆ ژیانێکی ئاســـوودەو ئارام، لە ئەنجامدا ئاوەز و ژیری بەو ئاراستەیەدا رێنمایی دەکات کە بەسەر ئەو هەلومەرجە پڕ لە ترس و تۆقاندنە، کە سروشت پێی بەخشیووە زاڵ بێت. پێویستی بۆ گەیشتن بەو دۆخە چاوپۆشیکردنە لە «مافی سروشتی» و بەرژەوەندییە تایبەت و تاکە کەسیەکان، ئەوەش لەپێناو پاراستن و مانەوەی خودو گواستنەوەی ئەو مـــاف و بەرژەوەندی و رێگەپێدانانە بۆ فەرمانڕەوایەک، ئەوەش بەپێی مۆرکردنی پەیمانێکی دەوڵەتەوە دەبێت. بەهۆی بوونی ئەو پەیمانەوە هەموو دەســـەڵاتەکان بە تاکێک، یان گروپێک دەســـپێردرێت، لەو کاتەدا بوونەوەرێک دروســـت دەبێت کە ئەنجامی یەکێتیی تێکڕای خەڵکە. ئەو بوونەوەرەش هیچ نییە جگە لە «لیڤیاتان»، واتە دەوڵەتەکەی هۆبز. لەو مانایەدا مرۆڤ ئیدی نەک «هەوێنی» (وزەو هێزی) سیستمی سیاسییە، بەڵکو زیاتر لەوەش دروستکەر، یان خوڵقێنەریشیەتی.

لـــە روانگەی هۆبزەوە پێدانی مافی بەرامبەر هەمان «پەیمان»ە. بەڵام کاتێک هەر کەســـێک مافێک بە کەســـێکی دیکە دەدات (دەبەخشێت) دەبێت ئەو کەرەســـتانەش کە پێویستن بۆ سوودوەرگرتن لەو مافە بەو کەسە ببەخشێت. بۆ نمونە کاتێک کەسێک ئاشێکی ئاو دەفرۆشێت ناتوانێت ئەو روبارەی کە بەویادا دەڕوات ئاراستەکەی بۆ بگۆڕێت. کەواتە ئەو کەسەش کە مافی خۆی بۆ حوکمڕانێک دەگوازێتەوە (دەبێت ئەو مافەش بەو کەســـە، کە مافی خۆی بە حکومڕانێک بەخشـــیوە) پێیبدرێتەوە کە سوود لە هەمـــوو ئامڕازەکانی حکومڕانی وەربگرێت. بەمجۆرە تەنها متمانـــەو هێنانەدیی پەیمان هێزێکی رەهاو بەتواناو زاڵ دەتوانێت گەرەنتیی (ئەو پەیمانە) بکات. هۆبز رایدەگەیەنێت یاســـای سروشتی ناچارمان دەکات پەیمانـــە واژۆکراوەکان، کە لە خزمەتی ئاشـــتی و مانـــەوەی مرۆڤایەتیدایە رەچاو بکەین. بەبێ بوونی یاســـای سروشتی پەیمانەکان قســـەی پوچ و ناکاریگەرن. دەکرێت بەکورتی بگوترێت کە هۆبز ئاخێزگەو چاوگەی دادپەروەری لە بوونی هەمان یاسای سروشتیدا دەزانێت. لە شوێنێکدا کە پەیمانێک واژۆ ناکرێت هیچ مافێکیش بەکەس نادرێت، کەواتە هەموو کەس بەســـەر هەموو شتێکەوە مافی هەیەو ناکرێت هەڵســـوکەوتەکان بە نادادپەروەرانـــە بزانرێت، بەڵام کاتێک پەیمانێک واژۆ کرا پێشـــێلکردنی نادادپەروەرانەیە. کەواتە دەکرێت لە پێناســـەکردنی نادادپەروەری، یان زوڵمدا بگوترێت نادادپەروەری

و زوڵم هیچ نییە جگە لە پێشـــێلکردنی پەیمان، بۆیە دەکرێت ئەو ئەنجامە بەدەســـت بێت هەر شتێک نادادپەروەرانە نەبێت، دادپەروەرییە.

بەمجـــۆرە لە ڕوانگەی هۆبزەوە پێشـــمەرجی بابەتێکی دادپەروەرانەو هەڵســـوکەوتی گونجاو لەگەڵ دادپەروەریـــدا، بوونـــی دەوڵەت و یاســـاکانەو بەپێی ئـــەم مانایە ناکرێت لە روانگەی هۆبزەوە باســـی دادپەروەری وەک گوتەزایەکی ئەخلاقی بکرێت. هۆبز لەم بوارەدا ئاماژە بە پێناسەکەی تۆماس ئەکیۆنی لەسەر دادپەروەری دەکات کە «دادپەروەری ئیرادەیەکی تۆکمەیە بۆ دانی مافی هەر کەسێک بە خودی ئەو کەســـە»، ئەوەشـــی پێ زیاد دەکات لەو شوێنەدا کە «شت و ســـامانی من» واتە موڵکیەت بوونی نەبێت دادپەروەریش بوونی نییەو لە شـــوێنێکدا دەوڵەت پشتبەستوو بە هێزی ناچارکردن و زۆرەملێ بوونـــی نەبێت موڵکیەتیـــش بوونی نییە، چونکە هەمـــوان لەبەرانبەر یەکدیدا مافیان بەســـەر هەموو شـــتێکەوە هەیەو هیـــچ کارێکیش نادادپەرەوەرانە نییە، کەواتە گەوهـــەری دادپەروەری لە ڕەچاوکردنی پەیمانە بڕوا پێکراوەکاندایە.

## سەرچاوە:

ئەم وتارە ساڵی ٢٠٠٥ لە «دۆیچە ویلە» بڵاوبووەتەوەو لەم سایتەی خوارەوە وەرگیراوە:

HTTP://PHILOSOPHERS.ATSPACE.COM/HOBBES.HTM

# ئافرەتە ئاسنینەکە

جەمال بەدەوی
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

پێموانییـــە لە ســـەردەمی ئەمڕۆمانـــدا، هاوڵاتییەک هەبێت گوێبیســـتی ئەم دەســـتەواژەیە نەبوبێت: (ئەی ئازادی..ئەو تاوانانـــە چەند زۆرن کە بە ناوی تۆوە ئەنجامدەدرێن). هەروەها لەو بڕوایەدانیم مرۆڤێک ڕۆچوبێتە ناو کاری سیاسییەوە، ئـــەو دەربڕینەی نەوتبێت و بەچاوی خـــۆی بینیویەتی ئالاکانی ئازادی لەلایەن ئەو کەســـانەی ڕۆژگارێک بوو بەرزیانکردبـــوەوە، فڕێدەدرێن و پێی لێدەنرێت. بەچاوی خۆی بینیویەتی لەسەر دەستی خوێنڕێژەکان کە ڕۆژێک لە ڕۆژان کراسی ئازادیان لەبەرکردبوو.. دروشـــمەکانی ئازادییان دەوتەوە.. خۆیـــان لەپێناویدا بەخت دەکرد، ڕۆحەکان لەناودەبرێن و کەللەســـەرەکان وردوخاشـــدەکرێن. بینیویەتی ئەوانەی تا دوێنێ بوو بەشـــان و باڵی ئازادیدا هەڵیاندەدا، کەچی دواتر دەبنە سەرسەختترین دوژمنی و خراپترین نەیاری.

ئاخۆ کێ خاوەنـــی ئەو دەربڕینەیە؟ بۆچی وتویەتی؟ ئـــەی ئەو بارودۆخە چی بووە کە وایکـــردووە ئەو هاوارە بکات، هاوارێک بووەتە بەناوبانگترین گوزارشـــتی فەرهەنگی سیاســـی و لە مێژودا وەک پەندی لێهاتووە. پاشان ئازادی چۆن دەبێتە ســـەرچاوەیەک بۆ تاوان، لە کاتێکدا ئازادی ئەو بۆتەقە پیرۆزەیە کە هەرســـێ بەها بەرزەکەی مرۆڤایەتی تێدا دەخەملێت، مەبەستم بەهاکانی حەق و چاکەو جوانییە. ناتوانیـــن وێنـــای ئەوە بکەین حەق ســـەرچاوەیەکە بۆ زوڵـــم و زۆرداری.. مەحاڵە ڕوناکی ســـەرچاوەیەک بێت بۆ تاریکی.. هەرگیـــز کاری چاکە خراپەکاری و جوانی دزێـــوی بەرهەمناهێنێت. بەڵام هەموو ئەو بەها بەرزانە لەســـەر دەســـتی تاقمێک

مرۆڤ دەگۆڕدرێن بۆ دژەکانیان. تاقمێک مرۆڤ لە توانایاندا هەیە ڕاستییەکان چەواشەبکەن.. جوانی بسڕنەوە..چاکە بشێوێنن.

خاوەنی ئەو دەربڕینە مێژووییە «مەدام رۆلان»ە کە سەیرترین ئافرەتە لە مێژووی شۆڕشی فەرەنسیداو یەکێکە لەو سێ ئافرەتە بەناوبانگەی، بە مەقسەڵە گەردنە ناسکەکەیان لێکرایەوە. یەکەمیان «ماری ئەنتوانێت»ی شاژن بوو.. دووەمیان «شارلۆت کۆردای»ی فیدائیی بوو کە دڕندە مەترسیدارەکەی شۆڕشی فەرەنسی «جان پۆل مارا»ی تیرۆرکردو خەڵکی لە کارە خراپەکانی ڕزگارکرد.. سێیەمیان «مانون ماری جان ڤیلیبۆن» ناسراو بە «مەدام رۆلان» بوو.. ئەمەی دواییان خاوەنی ئەو هاوارە بەناوبانگەیە سەبارەت بەو تاوانانەی شۆڕش بەناوی ئازادییەوە ئەنجامیدەدات.

«مەدام ڕۆلان» ئافرەتێکی جوان و قەشەنگ نەبوو، بەڵام خانمێکی ڕۆشنبیر بوو. خەمی سیاسەت و هونەری ئەدەب و مەسەلە فیکرییەکان سەرقاڵیان کردبوو، وایانلێکردبوو لەو بایەخپێدانانە دووربکەوێتەوە کە هاوڕەگەزەکانی خۆی بایەخیان پێدەدا. ئەو هەر لە تەمەنی لاویەتییەوە بەرهەمی پێشەنگانی فیکری مۆدێرنی فەرەنسی کە نوقڵانەی هاتنی سەردەمی ئازادی و یەکسانی و دادپەروەرییان لێدەدا، سەرنجیان ڕاکێشابوو. ئەو پێشەنگانەی فیکری فەرەنسی چەند ساڵێک پێش بەرپابونی شۆڕش کۆچی دواییان کرد، وەک ئەوەی قەدەر ڕەحمی پێکردبن و لەناوییبردبن، پێش ئەوەی بیروڕاکانی خۆیان ببینن لەسەر دەستی سەرکردەکانی تیرۆر وەک پاچ و خاکەناز بۆ سەرکوتکردنی ئازادی و ڕوخاندنی یەکسانی و سڕینەوەی دادپەروەری بەکاربهێنرێت. ئەو شۆڕشەی ئەوان بانگەشەیان بۆ دەکرد، دەگۆڕدرێت بۆ قەسابخانەیەکی گەورە کە پێشتر مرۆڤایەتی نمونەی لەو جۆرەی بەخۆیەوە نەبینیبوو.

جێگای داخە «مەدام ڕۆلان» کە لەسەرەتای لاویەتیدا هۆگری بیروڕاکانی «ڕۆسۆ» بوو، بەوپەڕی بڕواو ئیمانەوە ئەو بیروڕایانەی وەرگرتبوو، خەونی بەوەوە دەبینی ڕۆژێک بێت ئەو بیروڕا جوانانە وەک حەقیقەتێک لەسەر ئەرزی واقیع جێبەجێبکرێن، کەچی ئەو خانمە بە هەموو هەست و سۆزو هەڵچونێکی ئافرەتانەوە، خۆی هاویشتە ناو کورەی شۆڕش و دەنگی بووە یەکێک لە دەنگە هەرە پەڕگیرو توندڕەوەکان. ئاقاری تیرۆر کە شۆڕش هانای بۆ برد، «مەدام ڕۆلان»ی لەگەڵ خۆی بردو ئەویش بێ هیچ دوودڵییەک لەگەڵیدا ڕۆشت و هەرگیز بەخەیاڵیدا نەدەهات، بەو ئاگرە بسوتێت کە بەشداربوو لە داگیرساندنیدا. بە هەمان ئەو ڕێگایەدا بڕوات کە دەیگەیاندە مەقسەڵەکەو پێشتر بە هەزاران قوربانی بێ تاوان بەناوی ئازادی و دادپەروەری و یەکسانییەوە پێیداتێپەڕین.

«مەدام ڕۆلان» لە سەروبەندی بەرپابونی شۆڕشدا، لەگەڵ «مسیۆ ڕۆلان»ی هاوسەری لە شاری (لیۆن)ەوە هاتن بۆ شاری پاریس. مێردەکەی پیاوێکی سەقەت بوو، زیاتر شایەنی گاڵتەپێکردن بوو تاکو ڕێزگرتن، بیست ساڵ لە ژنەکەی گەورەتر بوو. «مەدام ڕۆلان» لە ئەنجامی خۆشەویستییەوە شووی بە پیاوەکەی نەکردبوو، بەڵکو شووی پێکرد تاکو لەسایەیدا خۆی لە قسەی خەڵکی بپارێزێت، چونکە خەڵکی دەیانبینی ئەو خانمە لە بوارێکی پڕ گوماناویدا کار دەکات. هێندەی نەبرد خانووەکەی لە پاریس گۆڕا بۆ ساڵۆنێک، شاعیرو ئەدیب و پیاوانی سیاسەت سەردانیان دەکرد، هەروەها هەموو کەسە توندڕەوەکان، ئەوانەی هاتنی سەردەمێکی تازە گڕی تێبەردابوون و هیچ ڕێگایەکیشیان بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە، جگە لە خوێن نەدەبینی، سەردانیان دەکرد. ئامانجەکانی «مەدام ڕۆلان» لەگەڵ ئامانجەکانی ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتیمانی سەر بە حیزبی (جیرۆندییەکان) یەکیگرتەوە.

جیرۆندییەکان لە «مەدام ڕۆلان»دا سەرچاوەی هەموو ئەو خواست و ئاواتانەیان دۆزییەوە کە لە مێشکی خۆیاندا دەخەملی، خواست و ئاواتی ڕوخاندن و هەڵتەکاندنی سیستمی کۆن و هێنانەئارای

سەردەمێکی نوێ، لەسەر ئەو بنەمایانەی کە پێشەنگانی فیکری فەرەنسی «ڤۆلتێر»، «ڕۆسۆ»، «مۆنتسکیۆ»و دانەرانی ئینسایکلۆپیدیا دایانمەزراندبوو. بەڵام گرفتی جیرۆندییەکان ئەوەبوو ئەوان وەک «مەدام ڕۆلان»ی هاوڕێیان زیاتر لە شاعیرەکانی سەردەمی ڕۆمانسی دەچوون، تاکو لەو سیاسیانە بچن کە قاڵبووی ناو ئەزموون و نەهامەتییەکان بن. ئەوان پیاوانی فیکرو یاساو ڕەوانبێژی و شیعرو حەماسەتێکی بۆش بوون. یەکێکیان بە هێمنی و سەنگینیەوە دەچووە سەر مینبەرەکە، پاشان چەند گوزارشتێکی باق و بریقەداری دەوت، تاکو حەماسەتی جەماوەر گڕتێبەردات، ئیدی ئەم برادەرەمان هێمنی و سەنگینییەکەی خۆی لەدەستدەداو دەکەوتە شوێن چەپڵەڕێزانی ئامادەبوان و دەبووە کڵپەیەک هەڵچوون و بانگەشەی وێرانکردن و کوشتنی دەکرد. لێرەوە جیرۆندییەکان کە لە بانگەشەکەرانی ئازادی و دادپەروەری بوون، دەگۆڕان بۆ بانگەشەکەرانی تیرۆر و روخاندن و توندوتیژی، بەبێ ئەوەی ئاگاداری ئەو ڕێگا خراپەبن کە بە دەستی خۆیان هەڵیاندەکەند. گەر وردتر قسەبکەین، جیرۆندیەکان ئاگاداری ئەو گۆڕستانە نەبوون کە بۆخۆیان هەڵیاندەکەند.

ڕۆژێک نوێنەرێکی جیرۆندی داوا لە ئەندامانی میللەت دەکات ڕووبارێک خوێن برێژن و دەڵێ: (ئازادی درەختێکە گەر بە خوێن ئاونەدرێت ناڕوێت، بۆیە ئەندامە خراپەکەی جەستەتان ببڕن تاکو جەستەتان بە ساغی بمێنێتەوە) ئەم نوێنەرە گەمژەیە نەیدەزانی ئەو دەربڕینەی دەبێتە چەکێک خۆی و هەڤاڵەکانیشی لەت و کوت دەکات، ئەویش ئەو کاتە بوو کە نەیارەکانیان ئەوانیان ڕاپێچی بەردەم چەقۆی مەقسەڵەکە کرد، تا بە خوێنیان ئاوی درەختی ئازدی بدەن!!.

یەکێک لە سەرکردەی جیرۆندییەکان بۆ سەلماندنی پیلانێک گوایە تۆمەتباران پێیهەستاون و هیچ بەڵگەیەکیشی لەبەردەستدا نەبوو، وتی: (ئایا ئەوانەی دەیانەوێ تەنها دوای بونی بەڵگە حوکمەکان دەرچن، دەتوانن پێمان بڵێن کەی پیلانەکان لەناو فایلەکان و لەسەر کاغەزەکاندا دەنوسرێن). ئەم قسە بۆگەنەی بووە پرنسیپێک نەیارەکانیان لە پاکتاوکردنی جیرۆندییەکاندا بەکاریان هێنا. دوو ساڵ تێنەپەری، جیرۆندییەکان لەبەردەم دادگای شۆڕشدا ڕاوەستان، گەر یەکێکیان بیوتایە: (کوا چ بەڵگەیەکتان لەسەر پیلانگێڕی ئێمە هەیە؟)، سەرۆکی دادگا وەڵامی دەدایەوە: (هیچ بەڵگەیەکم نییە، چونکە پیلانەکان لە ناو فایلەکان و لەسەر کاغەزەکاندا نانوسرێن).

«بریسۆ»ی سەرکردەی جیرۆندییەکان بۆ پاساوی پەنابردنەبەر تیرۆر دەڵێ: (وڵات لە مەترسیدایە، بەرگەی ئەوە ناگرێت ڕێوڕەسمەکان بە سستی بڕوات بەڕێوە، با دادپەروەری بە خێرایی جێبەجێبکرێت، هەر هەڵەیەکیش ڕوبدات چاوپۆشی لێدەکرێت). نەیارەکانیان ئەم قسەیەیان بەباشی لەبەرکرد، ئەو کاتەی جیرۆندییەکان لە قەفەزی تۆمەتباریدا ڕاوەستان و داوای بەڵگە و شاهێدیان دەکرد، سەرۆکی دادگای شۆڕش بە پێکەنینەوە پێی دەوتن: (ئەو مەترسییەی تەوقی وڵاتی داوە، بەرگەی ئەوە ناگرێت ڕێوڕەسمەکان بە سستی بڕوات بەڕێوە).

بەم شێوەیە ئەو بەدبەختانە دەمی ئەو چەقۆیەیان تیژکرد کە دواتر ملی خۆیانی پێلێکرایەوەو گڕی ئەو ئاگرەیان خۆشکرد کە پاشان خۆیانی سوتاند. لێرەوە ئەوانە بوونە قوربانی گوزارشتە دڵڕفێن و ئاگراوییەکانیان و بوونە قوربانی ئەوەی، کەوتنەشوێن هەست و سۆزی خەڵکانی تێنەگەیشتوو. ئەوان دەستبەرداری پرنسیپەکانی حەق و ئازادی بوون کە لە کتێبەکاندا خوێندبویانەوەو لەسەر ئەرزی واقیع لەبیریانکرد.

کاتێ شۆڕش هەڵگیرساو پزیسکی گەشتە هەموو ناوچەکانی فەرەنسا، جیرۆندییەکان بە تەنها هەر خۆیان پاشای گۆڕەپانەکە نەبوون، بەڵکو (یەعقوبییە)کانیش کە یەکێکە لە دەرهاویشتە هەرە ناشرین

و دڕنده توندڕەوەکانی شـــۆڕش، لەســـەر گۆڕەپانەکە بوون، بەڵام نەیانوێرا ناخی خۆیان ئاشـــکرابکەن، تا ئەو کاتەی جیرۆندییەکان ڕێگای تیرۆریان بۆ خۆشـــکردن. یەعقوبییەکان لە یانەکەی خۆیاندا وەک دڕەندە مەترســـیدارەکان خۆیان مەڵاســـدابوو، بۆ هێرشـــکردن و پەلاماردان چاوەڕوانی کاتی گونجاویان دەکرد. ئیدی جیرۆندییەکان هاتن و بە نەزانینی خۆیان دەرگاکەیان بۆ یەعقوبییەکان خستە سەرپشت، ئەوانیش دەستیانگرت بەسەر شۆڕشداو شۆڕشیان کردە قەسابخانەیەکی خوێناوی کە لە مێژودا وێنەی نییە.

یەعقوبییـــەکان گەرچـــی هەمان ناوبانگی جەمـــاوەری جیرۆندییەکانیان نەبـــوو، هەروەها هێندەی جیرۆندییەکان ئەندامیان لە پەرلەماندا نەبوو، بەڵام بەوە لە جیرۆندییەکان جیادەکرانەوە کە ڕێخستنێکی بەهێزیان هەبوو، وردتر دەجوڵانەوەو کاتی گونجاویان بۆ پەلاماردان هەڵدەبژارد. لەناو هۆڵی ئەنجومەنی یاســـادانانـدا، وەک باز چۆن لەسەر لوتکەی شاخەکان دەنیشـــێت، ئاوا لەسەر کورسییە بەرزەکانی لای چەپی هۆڵەکە دادەنیشـــتن، ئالێرەوەیە ناوی (حیزبی شـــاخ)یان لێنرا، هەر لێرەشـــەوەیە چەپەکان لە فەرهەنگی سیاســـیدا مەفهومی توندڕەوییان وەرگرتووە. ئا لەوێدا ســـەرکردەکان لە تەنیشـــت یەک و بە یەکگرتویی دادەنیشتن، لەو سەرکردانە «دانتۆن»، «مارا»، «کامی دیمۆلان»، «سان جۆست»، پاشان ســـەرۆکە ترسناکەکەیان «ڕۆبسپێر» کە بووەتە ســـمبولی تیرۆر بۆ هەموو سەردەم و ڕۆژگارێک. هەر هەموو ئەو ســـەرکردانەش مرۆڤ بوون، کەچی دڵیان پڕ بوو لە ڕق بەرامبەر بە مرۆڤایەتی و بەرامبەر هەر شتێکی جوان و پیرۆز لە ژیاندا.

لەســـەر دەســـتی ئەم دڕندە بکوژانە، شۆڕشی فەرەنســـی لە جیهادکردن لەپێناوی ئازادی گۆڕا بۆ ســـتەمکارییەکی ڕێکخراو کە تێدا چەوســـاندنەوە لەوپەڕی بڵاوبونەوەدابوو، تێدا حەق دیارنەماو ترس و تۆقانـــدن و نائارامی بەرقەراربوون، ئەمن و ئاســـایش نەمان و دەرکەوتەکانی ئازادی ســـڕانەوە. ئاڵای هەڵەشـــەیی بەرزکرایەوەو تەنها قســـەی زۆردارو ســـتەمکارو ئەوانەی بازرگانییان بە هەست و سۆزی جەماوەرو خەڵکی ســـادەو ســـاویلکەوە دەکرد، دەیخوارد. ئیدی فەرەنســـا لەســـەر دەستی ئەوان بووە دۆزەخێک ســـوتەمەنییەکەی خەڵک بـــوو، هەڵگرانی ئازادی بیروڕا خیانەتیان لە ئـــازادی بیروڕا کرد، ســـەرکردەکانی ڕیفۆرم لە پرنسیپەکانی ڕیفۆرم دوورکەوتنەوەو پشتیانتێکرد، ئەوانەی پاڵپشتی ئازادی بوون بە پێڵاوەکانیان پێیان بە ئازادیدا دەنا.

## کۆتایی پادشا:

لە مێژووی شۆڕشی فەرەنسیدا ئەو تاوانەی جیرۆندییەکان ئەنجامیاندا، هیچی لە تاوانی یەعقوبییەکان کەمترنەبوو. چونکە ئەوەی ڕێگا بۆ تیرۆر خۆشـــدەکات، هیچی لە بکەری کارە تیرۆرســـتییەکە کەمتر نییە. جیرۆندییەکان ئەو ســـەرەتایە بوون کە دەرگایان لەبەردەم ســـەرکردە تیرۆرســـتە خوێنڕێژەکاندا کردەوە. چارەنوســـی شۆڕشـــی فەرەنسی لە قۆناغەکانی بەرایدا بەدەســـت جیرۆندییەکانەوە بوو، ئەوان گەر پابەندی پرنسیپە بنەڕەتییەکانی خۆیان بونایەو نەکەوتنایەتە شوێن هەست و سۆزی ئەم ئافرەتە ســـەیرە «مەدام ڕۆلان» کە قەدەر فڕێیدایە ســـەر ڕێـــگای جیرۆندییـــەکان و ئەوانیش جڵەوی خۆیان دایە دەســـتی و ئەویش ئەوانی دایەدەست مەقســـەڵەکە، ئەوا دەیانتوانی پارێزگاری لە شۆڕش و ڕەوتە میانڕەوییەکەی بکەن.

دادگایی کردنی «لویسی شازدەهەم»، تاقیکردنەوەیەک بوو بۆ دیاریکردنی تواناو ژیری جیرۆندییەکان. ئەوان لە قوڵایی ناخی خۆیاندا مەیلیان بەلای مانەوەی سیســـتمی پاشایەتیدا بوو، پێیانوابوو سیستمی

پاشـــایەتی لە سیستمی کۆماری باشـــترە. جگە لەوە جیرۆندییەکان دەیانویست پارێزگاری لە پاکژی شـــۆڕش بکەن و شـــۆڕش بە خوێنی پاشـــا پیس نەبێت. توندڕەوترین شۆڕشـــگێڕ لـــەوە زیاتر بیری نەدەکردەوە کە حکومەتێکی پاشایەتی دەستوری دادپەروەر بێتەئاراوە. وەلێ «مەدام ڕۆلان» لە هەموو پیاوەکان توندڕەوتر بوو! ئەم خانمە پێیوابوو نەمری فەرەنســـا تەنها لە ڕێگەی لەســـێدارەدانی پاشاوە بەدیدێت، لەو بارەیەوە شەرمی نەدەکرد بە هاوڕێکانی بڵێ: (ئێوە خۆتان بە شتە بچوکەکانەوە سەرقاڵ کردووەو لێدەگەڕێن هەردوو ســـەرە گەورەکە، پاشاو شاژن، لەدەستتان هەڵبێن تاکو نەهامەتی و دەردو بەڵا بەسەر وڵات و نیشتیماندا بێنن. ئەوەی تا ئەمڕۆ پێیهەڵنەستاون، ئەوەتا ئێستا بانگتان دەکات و کار بۆ دادگایی کردنی هەردوو ســـتەمکارەکە بکەن: پاشاو شاژن، گەر نا ئەوا ئێوە کۆمەڵێ هەرزەکاری گەورەن).

ئا بەم شـــێوەیە «مەدام ڕۆلان» توانی ببێتە ئەو هێزەی دنەی لە ســـێدارەدانی پاشـــای دەدا، بەبێ ئەوەی حســـاب بۆ ئەوە بکات کارێکی لەو جۆرە چی بەســـەر فەرەنسادا دێنێت، بەبێ ئەوەی حساب بۆ تۆڵەی وڵاتانی پاشـــایەتی ئەوروپا بکات کە پێیانوابوو کوشـــتنی «لویسی شازدەهەم»، دەستدرێژییە بۆ ســـەر سیستەمە پاشایەتییەکانی ئەوروپا. ئاخۆ «مەدام ڕۆلان» کارێکی زیرەکانەی ئەنجامدا، کاتێ دەمـــاری پیاوەتی هـــاوڕێ جیرۆندییەکانی خۆی بزواندو ناچاریکردن-بەبێ ویســـتی خۆیان- دەنگ بۆ لەسێدارەدانی پاشا بدەن؟ ئەی ئایا «لویسی شازدەهەم» شایەنی ئەم کۆتاییە بوو کە «مەدام ڕۆلان» بۆی دیاریکرد؟.. کۆتاییەک کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەر گۆڕینی ڕەوتی شۆڕش لە ئاشتییەوە بۆ جەنگ، لە میانڕەوییەوە بۆ توندڕەوی و تیرۆر.

مێژونوسانی شۆڕشی فەرەنسی کۆکن لەسەر ئەوەی «لویسی شازدەهەم» خراپترین پاشای بۆربۆنەکان نەبووە، بەڵکو ئەو قوربانی دەستی ئەو گەندەڵیانە بوو کە باوک و باپیرانی پێیهەستابوون. «لویسی شـــازدەهەم» خاوەنی کۆمەڵێ خەســـڵەتی جوان و بەرز بوو، لە هەموویان گرنگتر هەردوو خەســـڵەتی دڵپاکـــی و ئاینداریییەکەی بوو. «مینیە»ی مێژوونوس لە کتێبەکەی دەربارەی شۆڕشـــی فەرەنســـی و لەســـێدارەدانی پاشادا دەڵێ: (ئاوا پاشایەک لە باشترین پاشـــاکان-گەرچی لە هەمانکاتدا لە هەموویان لاوازتر بوو- لە تەمەنی ســـی و نۆ ســـاڵیدا لەناوچوو، ئەمەش دوای ئەوەی بۆ ماوەی شازدە ساڵ و نیو حوکمی کـــرد، ماوەی حوکمکردنەکەی بۆ کاری باش و چاکە تەرخانکردبوو. باوباپیرانی شۆڕشـــیان بە میراتی بۆ جێهێشـــتبوو، پاشـــا لە هەموو پاشاکانی دیکە زیاتر توانای ئەوەی هەبوو نەهێڵێت شۆڕش بەرپاببێت، یاخود گەر بەرپاش بوو دایمرکێنێتەوە. ئەو پێش بەرپابونی شـــۆڕش دەیتوانی پاشـــایەکی ریفۆرمخوازبێت، یاخود دەیتوانی پاش بەرپابونی شۆڕش ببێتە پاشایەکی دەستوری، چونکە ئەو تاقە پاشایەک بوو هیچ تەماعێک و هیچ حەزو شەیدایییەکی بۆ دەسەڵات نەبوو، ئەو هەردوو ئەو خەسڵەتەی تێدابوو کە وادەکەن پاشای چاک دروستبکەن، ئەوانیش ترس لە خوداو خۆشەویستی میللەت بوو).

لە کاتی دادگایی کردنی پاشـــادا، فەرمانی لەسێدارەدانی لەسەر بڕیاری جیرۆندییەکان ڕاوەستابوو، بـــەو پێیەی ئەوان زۆرینـــەی دەنگەکانیان پێکدەهێنا. بڕیـــاری جیرۆندییەکانیش بە ئیرادەی «مەدام ڕۆلان»ەوە پەیوەســـت بوو. بەڵام پاشـــا بەختێکی خراپی هەبوو، چونکە «مەدام ڕۆلان» ڕقو کینێکی زۆری بەرامبەر پاشـــا هەبوو. لێرەوە بەهۆی مەکرو پلانگێڕی «مـــەدام ڕۆلان»و کۆکردنەوەی زۆرینەی دەنگەکان لەلایەن «مەدام ڕۆلان»ەوە بۆ لەســـێدارەدانی پاشا، پاشا ژیانی خۆی لەدەستدا. ئەم ئافرەتە ئاسنینە پێیوابوو دوای ڕوخاندنی پاشایەتی، ئیدی مەسەلەکان بۆ حیزبەکەی تەختدەبێت و بارودۆخی فەرەنســـا دەکەوێتە دەستییەوەو بە هیوای ئەوەبوو لەگەڵ هاوڕێ جیرۆندییەکانیدا حوکمی وڵات بکات.

بەڵام یەعقوبییەکان دوای لەسـێدارەدانی «لویسی شازدەهەم» تادەهات ناوناوبانگیان زیاتر هەڵدەکشا، خۆیان بۆ «مەدام رۆلان» مەڵاسـدابوو، سوربوون لەسەر ئەوەی لەناویبەرن. سەرکردەی یەعقوبییەکان «دانتۆن»، پلانی نەخشـەی تۆڵەسـەندنەوەکەی گرتەئەستۆی خۆی. پلانەکە بە سازکردنی هێرشێکی رۆژنامەوانی بۆ تێکدان و شێواندنی ناوبانگی خانمی دەسەڵاتدارو مێردە هەڵخەڵەتاوەکەی دەستپێکرد، مێردەکەی بەوە تۆمەتبارکرا کە ناتوانێت داواکاریی ژیانی ژن و مێردایەتیان دابینبکات، لێرەوە مێردەکەی جڵەوی بۆ ژنەکەی شلکردووە تاکو لە رێگەی دیکەوە بەشوێن چێژو لەزەتدا بگەرێت. ئیدی رۆژنامەکان کەوتنە لەکەدارکردنی داوێنپاکی و نێوبانگ و شـەرەفی «مەدام رۆلان» کە نەیدەتوانی وەڵامی ئەو تیرە ژەهراوییانە بداتەوە.

لـەو ماوەیەداو لە مانگی ئەیلولی سـاڵی ١٧٩٢، لە پاریس قەسـابخانەیەکی قێـزەون روویدا، تێدا کۆمەڵێ چەتەو تاڵانچی پەلاماری کۆشـکی خانەدانەکان و کڵێسـاکان و گرتوخانەکانیان دا کە پڕبوون لە زیندانی و کەوتنە کوشتن و سەربڕینیان. دواتر رژانە سەر شەقامەکان و دەستیانکرد بە روخاندن و تاڵانکردنی دووکانەکان و هەر رێبوارێکیشـیان توشبهاتایە، دەیانکوشت و هەزاران کەس بوونە قوربانی ئەو قەسابخانەیە. ئەمە بووە  هۆی وروژاندنی ئەندێشەکان. «مەدام رۆلان» ئەم هەلەی قۆستەوە تاکو رق و کینەی خۆی بەسەر «دانتۆن»ی نەیارە دڵرەقەکەیدا برژێنێت و بە ئەنجامدانی ئەو قەسابخانەیە تۆمەتبـاری بکات. ئەمە وەک ئەوە وابوو ئـەم ئافرەتە خوێنرێژە لەناکاو لەو توندرەوییەی خۆی بەئاگا هاتبێتەوە کـە عەیامێک بوو پەیرەوی لێدەکرد، لێرەوە «مـەدام رۆلان» کەوتە دژایەتیکردنی تیرۆرو دەڵێ ئەو شۆرشـەی کە خۆشیویسـت و شانازی دەکرد بەوەی بەشداربووە تێیدا، کەچی ئێستا بووەتە دەردوبەڵا بۆ فەرەنسـاو نەنگی بۆ ئەوانەی پێیهەسـتان. «مـەدام رۆلان» یەعەقوبییەکانی تۆمەتبار کرد بەوەی شۆرشـیان گەندەڵ کردو لە ئامانجە باڵاکانی لایانداو کردیان بە ئامرازێکی فیتنەی پیس و قێزەون.

## لە رێگا بەرەو مەقسەلەکە:

دەبوایە ئەم ململانێ ئاشـکرایە بە سـەرکەوتنی یەعقوبییەکان بەسـەر نەیـارە جیرۆندییەکان و خانمی سـەرکردە ئاسنیینەکەیان کۆتایی پێبهاتایە. ئەوکات چیتر شۆرش رێگای تیرۆری گرتبووەبەر، یەعقوبییـەکان لە ئەنجومەنی نیشـتیمانیدا ببونە زۆرینەو دەیانتوانی نەیارەکانیان بەرەو مەقسـەلە بنێرن. ئیدی ئەو دەرفەتە هاتەپێشـەوە کە تێدا سـەرکردەکانی تیرۆر بڕیاریاندا، نابێت بۆ لەناوبردنی «مەدام رۆلان»و تاقمەکەی پاشەکشـە بکەن. سـەرەتای جێبەجێکردنی پلانەکە بەوە دەستپێکرد کە «دانتۆن» بە راشکاوی لە ئەنجومەنی عورفی دەسەڵاتدار، جیرۆندییەکانی بە خیانەتی مەزن تۆمەتبار کردو رایگەیاند جیرۆندییەکان تەنها لەژێر کاریگەری ترسـی رای گشـتیدا، دەنگیان بۆ لەسێدارەدانی پاشـا داوە. ئەوان دوای دەنگدانەکەش هەوڵیاندا پاشـا رزگاربکەن، بەوەی مەسەلەی لەسێدارەدانەکەی جێبەجـێ نەکرێت. دواتر نۆرە هاتە سـەر «مارا»و بەوە تۆمەتباری کـردن کە پیلانیان دژ بە ئەمن و ئاسـایش و سەلامەتی کۆمار دارشـتووە، هەوڵیانداوە هەرێمەکان دژ بە پایتەخت بوروژێنن، تا جەنگی ناوخۆ بەرپابێت و شـۆرش شکستپێبێنن. پاشان «رۆبسپێر» دێتە قسەو داوادەکات تەواوی وڵات لەو ناپاکانە پاکبکرێتەوە کە لە بەردەمیدا باس لە خۆشەویستی وڵات و نیشتیمانپەروەری دەکەن، کەچی لە دواوە خەریکی خراپەکاری و تێکدانن. «رۆبسـپێر» داوایکرد هەر هەموو ئەوانە راپێچی دادگای شۆرش

بکرێن، تاکو سزای خۆیان دەرهەق بەو تاوانانەی بەرامبەر بە نیشتیمان کردویانە وەربگرن.

دوای ئەوە بە چەند رۆژێکی کەم، دەستەیەک سەرباز هەڵدەکوتنە سەر هۆڵی پەرلەمان و ٢٤ ئەندام پەرلەمانی سەر بە جیرۆندییەکان کە حەسانەی پەرلەمانیشیان هەبوو، قۆڵبەستدەکەن و بەرەو مەقسەڵە دەیانبەن. لێرەوە دەبوایە ئەفسانەی «مەدام رۆلان» کۆتایی پێبهاتایە، وەک کۆتایی هاتنی هەموو ئەو ئەفسانانەی شۆرش هێنابویەئارا. ئیدی «مەدام رۆلان» لەگەڵ حیزبەکەیدا کە رۆژگارێک ئەوپەری دەسەڵات و نفوزیان هەبوو دەکەون، هەردوکیان پێکەوە دەکەونە ناو چڵپاوی ریسوایی و ترۆبوون. ئەوە کۆتاییەکی ئازاربەخش بوو، پەڵەیەکی رەشە لە مێژوی شۆرشی فەرەنسیدا.

ئەمەی خوارەوە دیمەنی کۆتاییە کە بە پێنوسی ئەدیبی میسری مەزن خوالێخۆشبوو «حەسەن بەگ شەریف» لە کتێبەکەیدا: (چەند دیمەنێک لە شۆرشی مەزنی فەرەنسی)، نوسراوە.

## کۆتایی گاڵتەجارییەکە:

"مەدام رۆلان» دوای گرتنی هاورێ سیاسییەکانی، هەستیکرد ژیانی کەوتوەتە مەترسییەوەو نەیارەکانی بە رق و کینەوە بە شوێنیدا دەگەرێن. ئەم هەستەی بە مەترسی ئەو کاتە زیاتر بوو کە ئەنجومەنی نیشتیمانی بریاری گرتنی مێردەکەی دەرکرد، تا ئەویش بە هەمان ئەو تۆمەتانەی سەری جیرۆندییەکانی پەراندبوو، تۆمەتباربکرێت و پاشان دادگایی بکرێت. «مەدام رۆلان» دەیتوانی وەک مێردەکەی رابکات و بە تەنها خۆی دەربازبکات، بەڵام پێدەچێ ئەو کارەساتەی بەسەر هاورێ و خۆشەویستانیدا هات، ئەو شکستەی توشی سیاسەت و هیواو ئاواتەکانی هات، ئەو چارەنوسە پڕ مەترسییەی چاوەروانی پاشماوەی گەنجە دەربەدەرەکانی ناو حیزبەکەی دەکرد، پێدەچێ هەر هەموو ئەوانە ژیانیان لەبەرچاو رەشکردبێت و برستیان لێبریبێت، بۆیە لەجێگای خۆی مایەوەو بێئەوەی پەشیمان بێت لە هیچ شتێک چاورێی حوکمی یەزدانی دەکرد.

وەک ئەوەی چاورێی دەکرد، دەسەڵاتداران فەرمانی گرتنیان دەرکردو برایە بەردەم دادگای شۆرش، تا لەوێدا دادگایی بکرێت. ئەو تۆمەتەی ئاراستەی کرابوو، بریتی بوو لەوەی گوایە لەگەڵ مێردەکەی و ئەوانەی کە لەسەریان ساغبۆتەوە خیانەتیان کردووە، بەشداربووە لەوەی دژایەتی و بەربەرەکانێی پیاوانی کۆماری کردووەو ناوبانگی شۆرشی لەکەدار کردووە. لەگەڵ چەندین تۆمەتی نادیارو ئاڵۆزی دیکە کە هیچ مانایەکیان نەبوو، بەڵام بەس بوو بۆ ئەوەی خاوەنی ئەو تۆمەتە نادیارانە رەوانەی مەقسەڵەکە بکرێت. «مەدام رۆلان» هەوڵی دا بەرگری لە خۆی بکات و ئەو سوکایەتیانەی بەرامبەر بە ناموس و شەرەفی کراوە رەتبکاتەوە، وەلێ دادوەرەکان رێگەی قەسەکردنیان پێنەداو فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ دەرکرد. ئەویش ئەو حوکمە ترسناکەی بە لەخۆبردوییەکی گەورەوە وەرگرت و بە رویاندا هەڵشاخاو وتی: (ئێوە وای دەبینن من شایەنی ئەوەم هاوبەشی نەمری و مەزنی ئەو پیاوە مەزنانەبم کە لەسەر دەستی ئێوە کوژران، لەگەڵ ئەواندا بەرەو رێگای نەمری برۆم کە گرتبویانەبەر، ئەوا منیش وەک ئەوان بەوپەری نەبەردییەوە روبەروی مەرگ دەبمەوە). «مەدام رۆلان» مانەوەی لە زیندان ئەو دەرفەتەی بۆ رەخساند یادەوەریەکانی بنوسێت، ئەم یادەوەریانەی وەک شاکارێکی مێژوییەو شایەنی خوێندنەوەو تێرامانەو پرە لە پەندو ئامۆژگاری. کاتێ بریاری لەسێدارەدانی بۆ دەرچوو، گەرایەوە زیندان و قەڵەمەکەی گرت بەدەستەوەو دواهەمین دێری یادەوەرییەکانی نوسی: (ئەی سروشت ئامێزی خۆتم بۆ

بکەرەوەو بمگرەخۆت، تۆش ئەی خودای بەزەیی لەپاڵ خۆتدا وەرمبگرە). ڕۆژی پاشتر، بەرەو گۆڕەپانی لەسێدارەدانەکە ڕاپێچیانکرد، ئەویش بەوپەڕی لەسەرخۆیی و هێمنییەوە لەسەر گالیسکەکەوە بە زەردەخەنەیەک سەلامی لە جەماوەر دەکردو ماڵئاوایی لەوانە دەکرد کە دەیناسین. کاتێ گەشتە تەنیشت پەیکەری ئازادی کە لە گۆڕەپانی شۆڕشدا دانرابوو، دەنگی بەرزکردەوەو هاوارە بەناوبانگەکەی خۆی کرد: (ئەی ئازادی... ئەو تاوانانە چەند زۆرن کە بە ناوی تۆوە ئەنجامدەدرێن).

مێردەکەی لە شاری ڕوان خۆی شاردبوەوەو بۆ ماوەی چەندین مانگ خۆی حەشاردابوو، کاتێ بە مردنی ژنەکەی زانی، لە حەشارگەکەی هاتەدەرەوەو ڕویکردە چۆڵەوانی، پێدەچێ بێهیوابونی و ئەو نەهامەتیانەی سەرشانیان قورسکردبوو، ژیانی لەبەرچاوی ئەمیش بێمانا کردبێت. بۆیە ڕۆژێک دوای لەسێدارەدانی «مادام ڕۆلان»، هەندێ جوتیار مێردەکەی خانمی لەسێدارەدراویان بینی لەناو کێڵگەیەکدا بەدەما کەوتووە، کاتێ جولاندیان، بینیان لاشەیەکی ڕەقی بێ جووڵەیەو لە دەستە نوقاوەکەیدا کاغەزێکیان بینی ئەمەی تێدا نوسرابوو: (چیتر حەز بە ژیانێک ناکەم لەناو میللەتێکدا کە شوێن دەستی هیچ پرنسیپێکی بەرزی تێدانەماوە کە تا ئەمڕۆ لەپێناویدا ژیابوم. من دەمرم و خوازیارم وڵاتەکەم ئەم کابوسە یەخەی بەردات کە خەریکە دەیخنکێنێت، ڕۆژێک بێت دژ بەو زوڵم و زۆردارییەی لە وڵاتدا هەیە ڕاپەڕێت تاکو ژیانێکی بەختەوەرو ئازاد بژی).

لەوکات و ساتەدا لە باکوری فەرەنسا، کۆمەڵێ پیاوی جلوبەرگ دڕاوی لاشە پیسی ڕیش درێژ کە ڕوخساریان هیچ جوانییەکی گەنجی پێوەنەمابوو، تەواو شەکەوت و ماندوببوون، ئەوەندە خۆیان شاردبوەوەو ڕایانکردبوو بڕست و هێزیان لەبەر بڕابوو، ئەوانە پاشماوەی ئەندامانی حیزبی جیرۆندییەکان بوون کە پێش ئەوەی فەرمانی گرتنیان دەرچێت، لە هۆڵی ئەنجومەنی نیشتیمانی هاتبونەدەرەوە. ئەوانە بۆ هەمان مەبەست چوبونە شاری بۆردۆ (واتە بۆ مەبەستی ڕاپەڕین و بەرپاکردنی شۆڕش دژ بە یەعقوبییەکان-و-)، وەلێ ئەوانیش شکستیان هێنابوو، کاتێ ویستبویان لە بۆردۆ دەرچن، دوانیان دەکەونە دەست ئەو پۆلیسانەی دوایان کەوتبوون، ئەو دوانە ڕەوانەی مەقسەلە کران و گەشتنەوە بە هاوڕێکانی پێشتریان.

ئەوانەی مانەوە بە سەرکەوتویی بۆی دەرچوون و تا ماوەیەکی درێژ لەناو بیرەکاندا خۆیان حەشاردەداو لە دارستانەکان و کەلاوەو ژێرزەمینەکاندا دەنوستن. شەوێک هەستیانکرد پۆلیس داویەتی بەسەریاندا، بۆیە ویستیان خۆیان خۆیان بکوژن و کۆتایی بە ژیانی خۆیان بێنن، ئیدی هەریەکەیان ساچمەزەنەکەی دەرهێناو نای بە خۆیەوە، بەم شێوەیە ئەوەی مرد مردو ئەوەشی بریندارببوو کەوتە پەلەقاژەی مردن. دەسەڵاتی شۆڕشگێڕ لێگەڕا ئەو بریندارانە مردنێکی نافەرمی بمرن، بۆیە ناردنی بۆ شوێنک تاکو کەوڵ بکرێن، تاکو وەک ئەوانە بمرن کە دەیانەوێ ڕوبەڕوی زۆرداری ببنەوەو لەبەرامبەر زۆرداراندا سەر بەرزدەکەنەوە.

## سەرچاوە:

کتێبی الطغاة و البغاة، نوسینی جەمال بەدەوی، چاپی یەکەم ١٩٩٦، لاپەرە ١١١ بۆ١٢١، دەزگای ئەلشروق

# ئاوڕدانەوەیەک لە تایبەتمەندیەکانی ڕژێمی تۆتالیتار

**بەهرام یەحیی**
**لە فارسییەوە: سامان کۆنەپۆشی**

## ئاماژە:

کاتێک سیســـتمە تەواویەتخوازەکان (تۆتالیتار) لە سەدەی بیستەمدا سەریان هەڵدا، ئەو واتایانەی پێشـــووی هزری سیاسی، کە بۆ پێناسەکردن و شیکردنەوەی حکومەتـــە دیکتاتۆریەکانی چەشـــنی کەونـــار کەڵکیان لێ وەردەگیـــرا، کارامەیی خۆیانیان بۆ لێکدانەوەی ئەم دیاردە تازەیە لەدەســـت دا. هۆکارگەلێکی لە چەشنی لافی دەســـەڵاتی بێ ســـنوور، بەرینبوونـــەوەی زاڵیەتیی دەوڵەت بەســـەر تێکڕای هەرێمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و تەنانەت تاکەکەسیدا، شێوە نوێیەکانی بەڕێوەبردنی تیرۆری پەتی و ڕەهەندە ســـامناکەکانی دژایەتیکردنی مرۆڤ لە فاشیزم، ناسیۆنال سوسیالیزم و ستالینیزمدا، توێژەران، سۆسیۆلۆژان و مێژوونووسانی ڕووبەڕووی ئەم پێویســـتیە کردەوە کە دەبێ ئەم چەشنە ڕژێمانە لە جۆرەکانی ڕابردووی سیستمە بڕیاردەرانە، سەرەڕۆ و سەرکوتکەرەکان جیا بکرێنەوە.

لە دوای جەنگی جیهانیی دووەم و لە ناوەڕاســـتەکانی دەیەی پەنجای ســـەدەی بیســـتەم بەملاوە، هزرڤانـــان و توێژەرانی هزری سیاســـی هەوڵێکی تەکووزیدار و ڕێکوپێکیان بۆ ئەم مەبەســـتە دەســـت پێ کـــرد. هانا ئارێنت، بـــە هۆی کتێبی «توخمەکان و ئاخێزگەکانی دەســـەڵاتداریەتیی تەواویەتخـــواز» و، کارل یوئاخیم فریدریـــش، بە هۆی کتێبـــی «دیکتاتۆریی تۆتالیتاری»، لەم بوارەدا ڕێخۆشـــکەر بوون.

فاکتـــەری قوتبوونەوەی تیـــۆری تەواویەتخـــوازی (تۆتالیتاریزم)، ســـەرەڕای

گەنگەشـــەخوڵقێنی و جگـــە لـــە کارابوون یان ناکارابوونـــی ئەم تیۆرە، ئەوە بوو کـــە هەوڵی دەدا بە پێی هەڵســـەنگاندنگەلێکی هاوبەش، دیاردەگەلێکی لە چەشـــنی ناســـیۆنال سۆسیالیزم (لە ئاڵمان)، ستالینیسم (لە یەکیەتیی سۆڤیەت) و فاشیزم (لە ئیتالیا) لە چوارچێوەی واتایەکی روون و یەکانەدا جـــێ بکاتەوە و، لە رووگەی هۆکار و رەوتی ســـەرهەڵدانیانەوە، بنەمـــا و تایبەتمەندیەکانی پێکهاتەی ناوەکیان و پێگەی جیهانیان بخاتە بەر توێژینەوە. ئەم نووسینە هەوڵێکە بۆ تیشک خستنە سەر واتای تۆتالیتاریزم، تایبەتمەندیە پێکهاتەییەکان و کارکردەکانی.

## پێشینەی چەمکی تۆتالیتاریسم:

لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، رژێمگەلێک لە ئەوروپا ســـەریان هەڵ دا کە بە ســـەرنجدان لە بێ سنووریی لافی دەسەڵاتداریەتی و نواندنی دەسەڵات (اعمال قدرت) لە لایەن ئەم رژێمانەوە، چیتر نەدەکرا بە هۆی چەمکگەلێکی لە چەشـــنی تیرانیس (TYRANNIS، جباریت)، سەرەڕۆیی (DESPOTIE)، ئاتۆکراســـی (AUTOKRATIE، خودکامگـــی)، حکومەتـــی رەهاییخـــواز (ABSOLUTISMUS) و هەیمەنەخـــوازی (AUTORITARISMUS) راڤـــە بکرێن و لێک بدرێنەوە. فاشـــیزمی موســـولینی، کۆمۆنیسمی ستالینی و ناسیۆنال سوسیالیسمی هیتلەری لەم چەشنە رژێمانە بوون.

سیاســـەتڤانی لیبراڵی ئیتالی، جیۆڤانی ئامێندۆلا یەکەمین کەسێک بوو کە لە بیستەکانی سەدەی بیســـتەمدا پەیڤی «تۆتالیتار»ی بۆ وەســـفکردنی رژێمی موســـولینی بەکار هێنا و، باسی «سیستمی تەواویەتخـــواز»ی (SISTEMA TOTALITARIO) هێنایـــە ئـــارا. بە باوەڕی ئـــەو، لەو کاتەوە کە دێمۆکراســـیە جەماوەریەکان بزاڤی سەرکەوتووانەی خۆیان لە ئەوروپا دەست پێ کردوە، نەیار و دژبەرە سەرســـەختەکانیان، لە بەرەی راست و چەپەوە، لە چوارچێوەی بزاڤە تۆتالیتارەکاندا هاتوونەتە مەیدان. ئەم بزاڤانە رووەکەی تری دراوی رەوتی دیموکراتیزەبوونن لە ئەوروپادا.[1]

شـــایانی باسە کە موسولینی بە هیچ شێوەیەک نکۆڵی لە پلارێکی لەم چەشنی نەدەکرد، بەڵکو بە پێچەوانە، لە کۆبوونەوەیەکدا کە ســـاڵی ١٩٢٥ گیرا، لە رێگای ئەم رســـتانەوە تێگەیشتنی تۆتالیتاری خۆی لە دەوڵەت دەربڕی: «نابێ هیچ شتێک لە دەرەوەی دەوڵەت یان لە بەرامبەر دەوڵەتدا بێت، هەموو شتێک بۆ دەوڵەت!».

هەر لەو ســـاڵانەدا باســـەکانی پەیوەندیدار بە دەوڵەتی تەواویەتخواز لە ئیتالیاوە بەرەو ئاڵمان بڵاو بوونەوە. لەم وڵاتەشـــدا بیرمەندان و یاساناسانێک هەبوون کە خوازیاری دەوڵەتی تەواویەتخواز بوون و ناسراوترینیان کارل شـــمیت، یاساناسی ئاڵمانی بوو. کارل شمیت، لە کۆتاییەکانی دەیەی بیستەمدا، واتای دەوڵەتی تۆتالیتاری لە شـــیکردنەوەی نەریتی لیبراڵی هەڵێنجاند. بە باوەڕی شـــمیت، هەر بەو جـــۆرەی کە دەوڵەتی لیبراڵ لە هەوێنی دەوڵەتی رەهاییخوازەوە ســـەریهەڵدا، ئەم دەوڵەتەش دەبێ بە شـــێوەیەکی دیالێکتیکی لە هەوێنی دەوڵەتی لیبراڵەوە ســـەرهەڵبدات. کارل شـــمیت لە ماناگەلێکی جۆراوجـــۆردا کەڵک لە وتەزای دەوڵەتـــی تەواویەتخواز وەردەگرێت. ئەگەر دەوڵەت، ســـەرەتا دەوڵەتی بێ-توانای تۆتالیتار بوو و، لە کۆمەڵگە و ئابووریدا بە شـــێوەیەکی جیدی ئاوڕی لێ نەدەدرایەوە، بە تێپەڕینی کات روخساری ناسراوی دەوڵەتێکی بەهێزی خاوەن تەواویەتی بە خۆیەوە گرت.

کارل شمیت کە یەکێک لە رەخنەگرانی جیدی کۆماری وایمار و ئەو فرەییخوازیە بوو کە لەم کۆمارەدا رەچاو دەکرا، بە چاوێکی رەخنەگرانەوە لە تێکڕای ئەو گۆڕانکاریە سیاسی ـ کۆمەڵایەتیانەی دەڕوانیەوە کە لە دوای شۆڕشـــی فەرەنســـا لە ئەوروپادا پێک هاتبوون. بە باوەڕی ئەو، شۆڕشـــی فەرەنســـا لە

رزگاربوون و جیابوونەوەی کۆمەڵگە لە دەوڵەتدا کۆتایی پێ هات، پشێوی خستە نێو کارکردی دەوڵەت و گرنگایەتی دەوڵەتی لە بەرامبەر کۆمەڵگەدا داشکاند. ئەمە کوێرەڕێگایەکە کە لە ئاکامدا ئازادبوونی خۆپەرستی لێ کەوتەوە و هێزەکان، دەستەکان و چینە کۆمەڵایەتیەکانی توشی چەندپارچەیی کرد. لە روانگەی شمیتدا ئەم رەوتە، بێجگە لە جەنگی نێوخۆیی، ئاکامێکی دیکەی بە دوادا نایەت. دەوڵەت بە هۆی فرەییەکی بێ سنوور، کە لە پارتە سیاسیەکان، پارلمان و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان پێک هاتوە، بووە بە رێکخراوێکی سیاسی و یاسایی کە وێنەیەکی راستینە لە جەنگێکی نێوخۆیی نیشان دەدات و، بە هیچ شێوەیەک ناتوانێت دژایەتیە ئاشتیهەڵنەگرە کۆمەڵایەتیەکان کۆنترۆڵ و چارەسەر بکات. لەم روویەوە، دەوڵەت خەریکە دەپووکێتەوە و بە پووکانەوەی خۆی نەتەوەش رووەو نشێوی پووکانەوە گلێر دەکاتەوە. ئەو پێی وایە، تەنیا بە مەرجێک دەتوانین لە چارەنووسێکی لەم چەشنە رزگارمان بێت کە دەوڵەت، جارێکی دیکە، کارکردی تەکووزیخوڵقێنی خۆی لە کۆمەڵگە بسێنێتەوە و، لە بەرامبەر کۆمەڵگە و ئاشتیهەڵنەگریەکان و رکابەریە ناوەکیەکانیدا ببێتەوە بە دەوڵەتی تەواویەتخواز.

شمیت واتای ئەمری سیاسی بە پێشمەرجی واتای دەوڵەت دەزانی. ئەو پێی وابوو کە تەنیا لە تێپەڕگەی ئەمری سیاسیەوە دەتوانین وتەزای دەوڵەت لێک بدەینەوە. بەڵام واتای ئەمری سیاسی شتێک نیە جگە لە توانست و ئیرادەی بڕیاردان و کرداری رادیکاڵ لە پەیوەندیەکانی مرۆڤەکان و گروپە مرۆییەکاندا لە سەر بنەمای نموونەی «دۆست و دوژمن». لای کارل شمیت، جیاکردنەوەی دۆست و دوژمن نموونەیەکە کە واتا بە هەڵسەنگێنەر دەزانێت، نەک بە پێناسە یان روونکەرەوەی نێوئاخنەکەی. هەر وەکی لە ئەمری مۆراڵیدا چاکە لە خراپە و، لە ئەمری ستاتیکیشدا جوان و ناشرین لێک جیا دەکرێنەوە، جیاکردنەوەی دۆست لە دوژمن لە ئەمری سیاسیدا هەڵسەنگێنەرێکی سەربەخۆیە.[٢]

بە هاتنەسەرکاری ئادۆڵف هیتلەر، سەرئەنجام دەوڵەتی تۆتالیتار لە ئاڵماندا دامەزرا. هانس کوهن، مێژووناسی ئاڵمانی، یەکێک لە یەکەمین توێژەران و رەخنەگرانی سەرەتایی سیستمە تەواویەتخوازەکان بوو. ئەو کە ناچار بوو کۆچ بکات بۆ ئەمریکا، لە کتێبی «دیکتاتۆری لە جیهانی مۆدێرندا» (ساڵی ١٩٣٥) نووسی: «دیکتاتۆریەکان، بەو جۆرەی کە لە دوای جەنگی جیهانی لە روسیا، ئیتالیا و ئاڵماندا سەریانهەڵداوە، خاڵگەلێکی هاوبەشی ئەوتۆیان لەگەڵ فۆرمە نەریتیەکانی دیسپۆتیسم و ئاتۆکراسیدا نیە. دیکتاتۆریە مۆدێرنەکان، بە بەراورد لەگەڵ سەرەڕۆکانی رابردوو، دەسەڵاتێکی بێ سنوورتر دەنوێنن. لە کاتێکدا کە دیکتاتۆریەکانی پێشوو، پتر لە هەر شتێک، پشتیان بە نەریتە تیۆکراتیەکان (دین-سەروەرانە) یان سوپا دەبەست، دیکتاتۆریە مۆدێرنەکان بەبێ پشتیوانیی جیهانبینیەکی نوێی مەسیحایی و، بەبێ تێکنیکە تازەکانی پڕوپاگەندە، کە بتوانن بەم شێوەیە ئاراستە بە بیروڕای گشتی ببەخشن، بیچمیان نەدەگرت.»[٣]

کوهن لە توێژینەوەکانی خۆیدا ئاماژە بە خاڵێکی گرنگی دیکەش دەکات. بە باوەڕی ئەو، چەشنی کەونااری دیسپۆتیسم ناتوانێت لە جیهانی مۆدێرندا درێژە بە ژیانی خۆی بدات، چونکە شۆڕشی فەرەنسا، لە دوای خۆی، دێمۆکراسی وەک لێڕوانینێکی رۆحی بۆ جەماوەری خەڵک بە دیاری هێنا و، ئەوانی سەبارەت بە مافەکانی خۆیان بۆ گرتنەدەستی چارەنووسی وڵاتەکەیان وشیار کردەوە. بەم پێیە دەبێ بڵێین، دیکتاتۆریە ئەمڕۆییەکان بزاڤگەلێکی پۆست دێمۆکراتین. کوهن ئایدیۆلۆژیای مەسیحایی و تێکنۆلۆژیای مۆدێرنی رێنوێنیکردنی جەماوەری بە تایبەتمەندیی دیکتاتۆریەکانی ئاڵمان، ئیتالیا و روسیا دەزانی، کە لە باری مێژووییەوە دیکتاتۆریگەلێکی تازە بوون.

بەم پێیە دەتوانین دەوڵەتی تەواویەتخواز، لە پلەی یەکەمدا، لە چەشنی دەوڵەتە دێمۆکراتیەکان و

پاشـــان لە چەشنی دیکتاتۆریە هەیمەنەخوازەکان و چەشـــنەکانی پێشووی ئاتۆکراسی جیا بکەینەوە. ڕژێمی تەواویەتخواز هاوکات هەم ئەنتی دیمۆکراتیە، هەم شێوەدیمۆکراتی و هەمیش پۆست دیمۆکراتی. سیستمی تۆتالیتار سیستمێکە کە هەوڵ دەدات شاریڤانان (هاوڵاتیان) بخاتە چوارچێوەی ئایدیۆلۆژیایەکی بەرتەســـکەوە و لەو چوارچێوەیەدا بیچمیان پێ بدات، لە ڕێگای کۆنترۆڵێکی توندەوە چاودێریان بکات، ناچاریان بکات زاڵیەتیەکەی قەبووڵ بکەن و بەسیجیان بکات.

توێژەرانێکی دیکەش کەوتوونەتە شـــوێن بیرۆکەکانـــی کوهن. یەکێک لەم توێژەرانە کارڵتۆن هیس، مێژوونـاســـی ئەمریکی بوو. ئەو لـــە دوای جەنگی جیهانیی دووەم لە کۆبوونەوەیەکدا (ســـاڵی ١٩٣٩، ســـیمپۆزیۆمی) باسی لە تۆتالیتاریســـم لە مێژووی شارســـتانیەتی خۆرئاوادا کرد و وتی، دیاردەکانی دیکتاتۆری، دیسپۆتیسم و ئاتۆکراسی بە هیچ شێوەیەک لە مێژووی خۆرئاوادا تازە نین، بەڵام چەشنێکی نوێ لە دیکتاتۆری پێک هاتوە کە لە نێو جەماوەرەوە سەری هەڵ داوە و جەماوەر پشتیوانی لێ دەکەن. کارڵتـــۆن ئەم دیکتاتۆریە نوێیەی بە سیســـتمێکی تەواویەتخواز ناودێر کرد کە کەمڕەنگبوونەوەی دین، ڕووخانی دەســـەڵاتە لۆکاڵیەکان و ئاوابوونی ڕێوڕەســـم و نەریتەکان بوونەتە هۆی پێکهاتنی. پرســـی ســـێکۆلاریزەبوون، لیبراڵیزەبوون و دیمۆکراتیزەبوونی کۆمەڵگە و هەروەها شۆڕشـــی پیشەسازی، ئەو پێکهاتانەیان تێک دا کە هاوســـەنگیان لە کۆمەڵگەدا پێک دێنا و، بواریان بۆ ســـەرهەڵدانی سیستمی تۆتالیتار ڕەخساند.

«هیس»، ســـەرەڕای ڕەگەزی پشتیوانیی جەماوەری لە سیستمە تۆتالیتارەکان، پاوانکردنی تەواو و یەکجارەکی دەســـەڵاتیش بە یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانـــی دیکتاتۆریە تەواویەتخوازەکان دەزانێت. بە باوەڕی ئەو، تۆتالیتاریســـم خرۆشـــانێکە بە دژی کۆی کولتووری مێژوویی خۆرئاوا. ئەم سیســـتمە خرۆشـــانێکە بە دژی نەرمەڕۆیی (میانەروی) و هاوســـەنگیی یونانی کلاسیک، تەکووزیی یاسامەندی ڕۆمای کەونار، دلۆڤانی و لێبوردەیی و ئاشتیخوازیی عیسای مەسیح، کەلەپووری دەوڵەمەندی سەدەکانی ناوەڕاست و لە ئاکامیشدا، بە دژی ڕۆشنگەری، ئاوەز و مرۆڤتەوەریی سەدەی هەژدەیەم و دیمۆکراسیی لیبراڵی سەدەی نۆزدەیەم.

سیســـتمی تۆتالیتار هەموو ئەم توخمە بناژۆییانەی کولتووری مێژوویی خۆرئاوا دەخاتە گۆشەیەک و، دەســـت دەداتە شـــەڕێکی مەرگهێـــن بە دژی هەموو ئەو دەســـتانەی کە خوازیاری پاراســـتنی ئەم بایەخانەن[٤]

## تایبەتمەندیە پێکهاتەییەکانی سیستمی تۆتالیتار:

مۆدێلگەلێکی جۆراوجۆر بۆ لێکدانەوەی دیاردەی تۆتالیتاریسم و تایبەتمەندیە دیاریکەرەکانی لە ئارا دان. لـــەم نێوەدا دەتوانین ئاماژە بەو مۆدێلانە بکەین کە هانا ئارێنت، کارل یوئاخیم فریدریش، پیتەر گراف کلیمانزاگ و کارل پوپەر بە مەبەســـتی لێکدانەوەی ئەم دیاردەیە، پێشکەشیان کردوە. ئەم وتارە گرنگی بە دوو مۆدێلی یەکەم دەدات.

هزرڤانی ئاڵمانی، هانا ئارێنت لە یەکێک لە گرنگترین بەرهەمەکانی خۆیدا، «توخم و ئاخێزگەکانی دەســـەڵاتداریەتیی تەواویەتخواز»، تۆتالیتاریســـم بە لێکەوتەی قەیرانێکی قووڵ لە جیهانی مۆدێرندا دەزانێـــت کە لەگەڵ خۆیدا بیچمی بە چەشـــنێکی تەواو نوێ لە دەوڵـــەت داوە. بە باوەڕی ئارێنت، پتر لە هەموو شـــتێک بە هۆی دوو تایبەتمەندیەوە دەتوانین ئەم دەوڵەتە دەسنیشـــان بکەین: ئایدیۆلۆژیا و تیـــرۆر. لۆژیکی هزری ئایدیۆلۆژیایی بنەمای ڕەفتاریـــی دەوڵەتی تۆتالیتار پێک دێنێت و تیرۆریش

سرشتەکەی. ئارێنت رژێمی ناسیۆنال سوسیالیستی ئاڵمان و سیستمی سۆڤیەت (هەتا مردنی ستالین لە ساڵی ١٩٥٣دا) بە نموونەی وەدیهاتووی دەسەڵاتداریەتیی تەواویەتخواز دەزانێت. ئەو ئەم دوو رژیمە بە دەرکەوتە جۆراوجۆرەکانی دەسەڵاتداریەتیی تۆتالیتار دەقەبڵێنێت.

تێزی ناوەندیی ئارێنت دەڵێت کە رژێمی تۆتالیتار نایەوێت تەنیا دەســەڵات و حکومەت بەدەستەوە بگرێت، بەڵکو بۆشگا (فەزا)ی ئەمری سیاسی بە یەکجاری خاپوور دەکات. لەم رووەوە بەهرە و توانایی مرۆڤ بۆ نواندنی کرداری هاوبەش دەرەتانی دەرکەوتنی نابێت. ئارێنت دەســەڵاتداریەتیی تۆتالیتار بە ئاوابوونی دەوڵەتی نەتەوەیی دەنرخێنێت و، رۆڵی بۆرۆکراســی لە دەسەڵاتداریەتیی تەواویەتخوازدا بە کەلەپووری دیسپۆتیســم لەقەڵەم دەدات. بە باوەڕی ئەو، لە دوایین حکومەتە ســەرەڕۆکانی ئەورووپای بەر لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا، واتە لە ئوتریش، مەجارســتان و روســیای تێزاریدا، حکومەتگەلێکی رەهاییخواز لە فۆرمی بۆرۆکراتیدا پێک هاتبوون کە دەســەڵاتەکانی، نە بە هۆی یاساوە و نە لە رێگای خەڵکەوە، سنووردار نەدەکرایەوە. ئارێنت، لە رێگای زاڵیەتیی بۆرۆکراسیەوە، لە لەکارکەوتنی دەسەڵاتی یاسادانان و لەنێوچوونی دابەشینی دەسەڵاتە دەوڵەتیەکان تێدەگەیشت.

بە بــاوەڕی ئارێنت، تایبەتمەندیــی بزاڤە تۆتالیتارەکان کۆیلایەتی و گوێلەمشــتیی راســتینەی ئالیگرانیانە. سەکەماتی و لاتولەواکان، لایەنە دەرکراو و پەراوێزنشینە کۆمەڵایەتیەکان و، دەستە و باندە خراپەکار و بێ ئاکارەکان رۆڵێکی جێی سەرنج لە بزاڤە تۆتالیتارەکاندا دەگێڕن. دەستەیەک لە ئیلیتە فکری و هونەریەکان، لانیکەم لە قۆناخێکدا، بە هۆی حکومەتە تەواویەتخوازەکانەوە شوناســی خۆیان دیاری دەکەن. ئارێنت باس لە یەکیەتیی کاتی «ئیلیتەکان و ســەکەماتیەکان» دەکات، بەڵام وەبیرمان دێنێتەوە کە لەگەڵ هەموو ئەمانەشــدا، بەرژەوەندیەکانی هیچکام لەم دوو دەســتە بە هاتنەسەرکاری دەسەڵاتداریەتیی تۆتالیتار دەستەبەر نابن.

لە روانگەی ئارێنتدا، تیرۆر سرشــتی دەســەڵاتداریەتیی تەواویەتخوازە و، لە هەنگاوگەلێکدا خۆی دەنوێنێت کە بە مەبەستی ترساندنی بندەستەکان بەڕێوە دەچێت و هەروەها لەو خراپەکاریە توندئاژۆیانەدا کە پەیڕەوی لە تەکووزیەکی «کارخانەیی» دەکەن. ئەم هێماگەلە لە ژوورەکانی گازی «رایشی سێیەم» و ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملی یەکیەتیی سۆڤیەتدا وەدی هاتن. رێکخستنی ئیداریی کوشتنی بەکۆمەڵی مرۆڤــەکان بــە جۆرێک بەڕێوە دەچێت کە هیچ کەس هەســت بــە «گوناه و هەڵە» نــاکات، چونکە سیاسەتڤانی خەڵک بە شێوەیەک پلانی بۆ دارشتوون کە هەموو ئەو کەسانەی لەم کوشتارەدا بەشدارن، بێگوناهن. کوژراوەکان بێگوناهن، چونکە هیچ گوناهێکیان بە دژی رژێم نەکردوە. بکوژەکانیش بێگوناهن، چونکە بە پێــی هاندەرە جینایەتکارانەکان نەجوڵاونەتەوە، بەڵکو «مافی کوشــتن»یان بووە. بۆ هانا ئارێنت، هەســتی تۆڵەسەندنەوە، کینە و هەوڵدان بۆ مڵکدارێتی دەتوانن هاندەرگەلێکی جینایەتکارانە بــن، بەڵام ئەمانــە هاندەرە دیاریکەرەکانی کوشــتنی بەکۆمەڵی دەســەڵاتداریەتیی تەواویەتخواز نین. کوشــتنی بەکۆمەڵی سیســتمی تۆتالیتار پتر ئاکامی ئایدیۆلۆژیایەکە کە «لافی لێکدانەوەی تەواوی جیهان» لێ دەدات. ئەم ئایدیۆلۆژیایە کارێک دەکات کە لایەنگرە باوەڕمەندەکانی، بەبێ ئەوەی ســەرنج لە راستیەکان بدەن، بە شوێن ئامانجگەلێکی یوتوپیاییدا بڕۆن. هەر کەسێک لە بەرامبەر ئەم ئامانجە یوتوپیاییەدا راوەســتێت دەبێتە لەمپەرێک لە بەردەم رەوتی مێژوودا و، دەبێ بەبێ لێبوردەیی، وەکوو شــتێکی زیادی و بێکەڵک، لەنێو ببرێت. ئارێنت لە کۆتاییدا جەخت دەکاتەوە کە دەســەڵاتداریەتیی تۆتالیتار لەناکاو بەرئاوەژوو دەبێتەوە، نەک لە رەوتێکی درێژماوەدا و، ئالیگرانی نکۆڵی لە بەشــداریی خۆیان لە جینایەتەکان و تەنانەت لەوەش دەکەن کە سەر بەو بزاڤەش بووبێتن.[٥]

کارل یوئاخیم فریدریش، یەکێکی تر لە توێژەرانی واتای تۆتالیتاریسم، دیکتاتۆریی تەواویەتخواز بە خاوەن شەش خاسمانی یان تایبەتمەندیی بناژۆیی دەزانێت:

1ـ دیکتاتۆریـــی تۆتالیتـــاری ئایدیۆلۆژیایەکی داڕێژراوی هەیە کـــە لیزگەیەکی فێرکاری بۆ هەموو رووبەرەکانـــی ژیان و بوونی مرۆڤ لەخۆ دەگرێت. هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە، لانیکەم بە شـــێوەیەکی ناچالاکانـــە، دەبێ مل بۆ ئەم ئایدیۆلۆژیایە راکێشـــن. ئەم ئایدیۆلۆژیایە لە ســـەر بنەمای ئاخافتن لە بارودۆخێکی ئارمانجیی کۆتایی بۆ مرۆڤایەتی راوەستاوە و، بە سروشوەرگرتن لە رێبازە دینیەکان، پەیام و خواســـتێکی «هەزارەیی» دەسەپێنێت. ئەم ئایدیۆلۆژیایە دژبەری بنەمایی ئەو کۆمەڵگانەیە کە هەن و دەخوازێت بە مەبەستی پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی نوێ، جیهان داگیر بکات.

2ـ دیکتاتۆریـــە تۆتالیتارەکان خاوەن حیزبێکی جەماوەریـــی تاکانەن، کە بەزۆری دیکتاتۆرێک لە لوتکەی دەســـەڵاتی ئەم حیزبـــە دایە. ئەم حیزبە لە ژنان و پیاوانێک پێـــک هاتوە کە ئەوپەڕی دە لە ســـەدی حەشیمەتی کۆمەڵگە پێک دێنن و، بەبێ کەمترین گومان و بچوکترین پرسیارێک، باوەڕیان بە ئایدیۆلۆژیای حیزب هەیە. ئەم حیزبە بە شێوازێکی هیرارشی رێک خراوە و تایبەتمەندیەکەی ئەوەیە کە یان لە سەرەوەی دەوڵەتەوەیە، یان ئەوەی کە لە دەوڵەتدا تواوەتەوە.

3ـ سیســـتمێکی تیـــرۆری رۆحی و فیزیکی کە لـــە کۆنترۆڵی حیزب و پۆلیســـی نهێنی دایە. ئەم سیســـتمە نەک تەنیا دوژمنە ناســـراوەکانی رێبەر و حیزب، بەڵکو ئەو دەستە و چینانەی خەڵک کە بە شـــێوەیەکی سەرەڕۆیانە هەڵبژێردراون، لەنێو دەبات. سیســـتمی تیرۆر بۆ ئەم ئامانجە بە چەشنێکی تەکووزیدار کەڵک لە زانیاریی مۆدێرن و بە تایبەتی دەروونناسیی زانستی وەردەگرێت.

4ـ دیکتاتۆریـــی تۆتالیتار بـــە یارمەتیی تێکنۆلۆژیا کۆنترۆڵی راگەیەنە گشـــتیە کاریگەرەکان، لە چەشنی چاپەمەنیەکان و رادیۆ و سینەما بە تەواوەتی لە دەستی حیزبی دەوڵەتدا پاوان دەکات.

5ـ دیکتاتۆریـــی تۆتالیتاری بە یارمەتیـــی تێکنۆلۆژیا بە تەواوەتی بەکارهێنانی کارتێکەری ئامێرە جەنگیەکان پاوان دەکات.

6ـ دیکتاتۆریـــی تۆتالیتار، بـــە یارمەتیی هاوئاهەنگیی بۆرۆکراتیـــک، چاودێری و رێنوێنیکەرێکی ناوەندی بە سەر گشت ئابووری و هەموو کەرتە یاساییە سەربەخۆکاندا زاڵ دەکات.[٦]

لـــە روانگەی ئەم توێژەرەوە دیـــارە کە ناتوانین هەموو تایبەتمەندیەکانی سیســـتمی تۆتالیتار لەم خاســـمانیانەدا بەدی بکەین. بۆ وێنە دەتوانین خاســـمانیی کۆنترۆڵی دەزگای دادوەری و دادگەکانیش بخەینە ریزی ئەم پێڕستەی سەرەوە، ئەگەرچی ئەم خاسمانیە گەنگەشە هەڵ دەگرێت و لێڕوانینگەلێکی پارادۆکســـیکاڵ و دژواز لەم بارەوە لە ئارا دان. بەڵام بە کورتی دەتوانین بڵێین، تایبەتمەندیە شـــەش فاقەکان، هێڵە بنەواشەییەکان و دەمارە سەرەکیەکانی دیکتاتۆریی تۆتالیتاری دیاری دەکەن.

بەڵگەنەویستە کە سیســـتمە تەواویەتخوازەکان روخساری جۆراوجۆر بەخۆیانەوە دەگرن. بۆ وێنە، رۆڵی حیزبی کۆمۆنیســـت لە ســـەردەمی رێبەرایەتیی ســـتالیندا بەرچاو نەبوو، بـــەڵام لە دوای مردنی وی گرنگایەتیەکـــی زێدەتری وەدەســـت هێنا. یان لە ئاڵمانی هیتلەردا گرنگایەتیی حیزبی ناســـیۆنال سوسیالیســـت پتـــر لە دەوڵەت بـــوو، لە کاتێکدا کە لـــە ئیتالیا دۆخەکە بە شـــێوەیەکی دیکە بوو و هاوســـەنگیی هێزەکان نەیدەهێشـــت موســـولینی پێکهاتە و دامەزراوەکانی دەوڵەت بە یەکجاری بکاتە دوماڵەکان (شتگەلێکی زیادی)ی حیزبی فاشیستی «یەکیەتیی خەباتکارانی ئیتالیا».

ئەو شـــتەی لەم تایبەتمەندیەدا گرنگە ئەوەیە کە رژیمـــی تەواویەتخواز لە باری مێژووییەوە وەکی دیاردەیەکـــی نـــوێ چاوی لێ دەکرێت. ئەم رژیمـــە ئەگەرچی لەگەڵ رژیمە ئاتۆکراســـیەکانی رابردوودا

هاوبەشیگەلێکی هەیە، بەڵام زۆرێک لە خاسمانیە شەش فاقەکانی لە رژیمە ئاتۆکراسیەکانی رابردوودا نابینرێن. نە ســەرەڕۆییەکانی خۆرهەڵاتی دونیا، نە حکومەتە رەهاییخوازەکانی ئەوروپای مۆدێرن، نە ئیمپراتۆریی رۆما، نە حکومەتە تیرانیســیەکانی یونانی کەونار، نە تیرانیسەکانی دەوڵەت ـ شارەکانی ســەردەمی رێنێسانســی ئیتالیا، نە دیکتاتۆریە بناپارتیەکان یاخود دیکتاتۆریە مۆدێرنەکان، خاوەن هەموو ئەم تایبەتمەندیانە نەبوون. بۆ وێنە زۆرێک لە رژیمە دیکتاتۆرەکان دواتر هەوڵیان دا سیستمێکی پۆلیسی نهێنی رێک بخەن، بەڵام هیچکام لەم رێکخراوانە، لە باری رەهەند و ئاستەکانی تیرۆر و تۆقاندن و بەدواداچوونــەوە، نەیانتوانی بگەنە ئاســتی «گەشــتاپو» لە ئاڵمان یــان GPU (دواتر MWD و سەرئەنجام KGB) لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا.

## رۆڵی ئایدیۆلۆژیا:

ئایدیۆلۆژیا و بە تایبەتی ئایدیۆلۆژیای تۆتالیتار هەمیشــە خاوەن نێوەرۆکێک بووە کە دڵنیاییەکی باوەڕمەندانــە (ئیمانی)ی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. ئایدیۆلۆژیا تەواویەتخوازەکان لە رێبازێکی فەرمی پێک هاتوون کە بە پێی «پەیامێکی مێژوویی» بنیات نراوە. ئەوان خاوەن توخمگەلێکی یوتوپیایی بەهێزن و، باوەڕیان بە بیرۆکەیەک هەیە کە ئامانجەکەی بریتیە لە وەدیهێنانی بەهەشــت لە ســەر زەویدا. ئەم جیهانبینیە یوتوپیاییە بارێکی ئایینی بە ئایدیۆلۆژیای تۆتالیتار دەبەخشــێت و جۆش و خرۆشێک لە نێو ئالیگرانیدا پێک دێنێت. ئەم جۆش و خرۆشە ئالیگران بانگهێشتی لەخۆبوردەیی دەکات. دەتوانین ئەم حاڵەتە رۆحیە لە کەسانێکدا بەدی بکەین کە ئیمانیان بە « ئەمری ترانسدێنتاڵ» هەیە و سروشی لێ وەردەگرن.

هانــا ئارێنت بزاڤە تەواویەتخوازکان بە بزاڤگەلێکی لایەنگر و نوێنەری رێبازێکی نهێنیی ئیزۆتریک دەزانێت، کە ئەندامەکانیان پێیان وایە دەبێ خاوەن زانایەکی تایبەت بین هەتا لەم رێبازە تێ¬بگەین. بە بۆچوونی ئەو، کاری دەستەگەلێکی لەم چەشنە ئەوەیە کە پەرە بە پرەنسیپی «خۆیی» و «ناخۆیی» بدەن. رژیمی هیتلەری ئەم پرەنسیپەی لە ئاستێکی ئێجگار بەریندا هێنایە رووبەری کۆمەڵگە. سەرەتا جوولەکەکانی بە «ناخۆیی» وەسف کرد و بەم شێوە دەستی پێ کرد. پاشان هەنگاوێک چووە پێشەوە و بۆرۆکراسیەکی پێچاوپێچی دامەزراند کە کارەکەی بریتی بوو لە یارمەتیدانی هەشتا میلیۆن ئاڵمانی، هەتا بزانن ئایا خوێنی جوو لە دەمارەکانی باپیرانیاندا بووە یان نە. هەر ئاڵمانیەک کە سەربەرزانە لەم «رێوڕەسم»ە دەهاتە دەرێ، پێی وابوو کە سەر بە دەستەی «خۆییەکان»ە و، لە بەرامبەر دەستەیەکی فانتازیی «ناخۆیی»دا راوەســتاوە. ئارێنت ئەوەش دەڵێت کە بزاڤی بێلشویکەکانیش ئەم پرەنسیپەیان لە «پاکســازیە ســتالینیەکان»دا رەچاو کرد. هەر کەسێک لەم پاکسازیانە رزگاری بووایە، پێی وا بوو سەرلەنوێ گەڕاوەتەوە نێو «دەستەی خۆییەکان».[٧]

بزاڤــە تۆتالیتارەکان پێویســتداری یوتوپیان. ئــەوان گرنگی بە تەکووزیەکــی فانتازی دەدەن کە لەخۆیانەوە دروستیان کردوە، نەک بە پێی واقعیەت. بە یارمەتیی توخمە دڵخوازە جیهانیەکان بیرۆکەیەک ســەبارەت بە جیهان دادەڕێژن کە پەیوەندیەکی لەگــەڵ جیهانی ئەزموونیدا نیە. یەکێک لەم بیرۆکانە، تیۆری پیلانە.

بەڵگەنەویســتە کە ئەم بیرۆکانە تەمەنێکی درێژیان نیە و ســەرئەنجام واقعیەت ئەم خەونانە تێک دەشکێنێت. حیزبە سیاسیە تەواویەتخوازەکان ئەو بەرنامە ئاوەزگەرایانە بایکۆت دەکەن کە واقعبینانە،

بەڵام رەخنەگرانە، لەو بارودۆخە دەڕواننەوە کە هەیە و، بەرنامەگەلێکی دژەئاوەزی ئایدیۆلۆژیایی دەکەنە جێنشینی ئەو بەرنامە ئاوەزگەرایانە.

لــەم بەرنامانــەدا ئیمان بۆتە جێنشــینی ئاوەز و، بەڵێنــی و پەیمانی ئیزۆتریک لــە جێی زانین و هەڵســەنگاندن دانــراوە. لــە سیســتمە تۆتالیتارەکاندا کاتێک بــاس لە «بەناوەکیبــوون» یاخود «بنەجێبــوون»ی ئایدیۆلۆژیــا دەکرێت، مەبەســت ئەوەیە کە زۆرێک لە مرۆڤــەکان لە نێو حیزب و دەرەوەی حیزبدا خوویان بە بیرکردنەوە، قسەکردن و هەڵسوکەوت لە چوارچێوەی ئایدیۆلۆژیادا گرتوە.

ئایدیۆلۆژیا کە فاکتەری بەهێزیی بزاڤە تۆتالیتاریەکانە، تەنیا دەست و پێکان نابەستێتەوە، بەڵکو بەر لە هەموو شتێک مێشکەکان بەدیل دەگرێت. «زانایی و دیرایەت»ێک کە وا بڕیارە لە ئایدیۆلۆژیای تەواویەتخوازدا کۆتایی پێ بێت، تەنیا پەرە بە جۆش و خرۆشی شۆڕشگێڕانە دەدات. مرۆڤێک کە دیلی ئایدیۆلۆژیایە تەنانەت ئامادەیە، لە خزمەتی «پێکهاتەی بەرزتر»دا، مل بۆ «داڕشتی بەرزتر» راکێشێت و جینایەتیش بکات. هەر لەم راســتا دایە کە هانس ئیشــپەربێر، بیرمەندی ئوتریشــی، لە توێکاریی وردبینانەی دەروونناســانە کۆمەڵناســانەی چەمکی تیرانیسدا دەڵێت: «حکومەتی تیرانیس لە رێگای تیرانیسێکەوە کە لە لوتکەی دەسەڵات دایە ناتوانێت درێژە بە تەمەنی خۆی بدات، بەڵکو پتر لە رێگای فەرمانبەران و قوربانیگەلێکی بێ¬ئەژمارەوە کە ئەویان کردۆتە تیرانیس ئەم کارە دەکات».[8]

لەوێوە کە ئایدیۆلۆژیای تەواویەتخواز خاوەن هەقانیەت نیە، بۆیە لافی هەقیقەتی رەها دەکاتە بنەمای هەقانیەتی خۆی. لەم روویەوە بە شــێوەیەکی پێویست چەقبەستوویانەیە. ئەم ئایدیۆلۆژیایە خۆی بە نوێنەری پەیامێکی مێژوویی دەزانێت و، لە رێگای شۆردنەوەی مێشک و پڕوپاگەندەوە، پەیامێکی لەم چەشــنە دەکاتە پەژارەی سەرەکیی شــوێنکەوتووان و فەرمانبەرانی پێشەوا و رێبەر. بەم پێیە، لابردنی دژایەتیە شیمانەییەکانی نێوان «ئاگایی» و «رەفتار» و پێکهێنانی یەکانەکی و یەکپارچەیی لە نێوان «ئیــرادەی رێبەری» و «ئیرادەی خەڵک»دا، بە یەکەمین ئەرکی ئایدیۆلۆژیای تۆتالیتار دەقەبڵێنرێت. تەنیا لەم رێگاوەیە کە کاری پاساودانەوەی مانەویی دەسەڵاتداریەتیی تەواویەتخواز، لە رەهەندگەلێکەوە کە پێویســتە، دەلوێت و دەســتەبەر دەبێت. تەنیا کاتێک کە تاک و گروپ بە شێوەیەکی تەواو و کامڵ بە هۆی رێبەرەوە شوناســی خۆیان دیاری بکەن و، هەڵســوکەوتێک بگرنە پێش کە لەگەڵ فەرمانەکانی رێبەردا بگونجێت، دەتوانین چاوەڕوانی ســەرکەوتنمان لە بەرنامەیەکی لەم چەشــنە هەبێت. بە هۆی نێوبژیوانیی کارکردێکی لەم چەشــنە دەتوانین نمایشــی دەســەڵات و زاڵیەتیی رەها بە سەر خەڵکدا بکەینە جێنشــینی دەســەڵاتی راســتینەی خەڵک. ئایدیۆلۆژیای تۆتالیتار پێویســتی بە مەکیاژێکی «زانســتی»یش هەیە هەتا کاراییەکی زێدەتری هەبێت. ئەم کارە بە بەراورد لەگەڵ کۆمۆنیســمدا، بە شــێوەیەکی ناتەکووزیدارتر و ناجیدیتر لە ئایدیۆلۆژیای ناســیۆنال سوسیالیســمدا بەڕێوە دەچوو. لە ناســیۆنال سوسیالیســمدا باس لە تیۆرگەلێکی زانستی ســەبارەت بە رەگەزی بەرزتر یان نزمتر دەکرا و، لە کۆمۆنیســمدا لە «جیهانبینی و سوسیالیســمی زانستی» دەدوان. کارکردی تیۆرگەلێکی زانستی لەم چەشــنە لە ئایدیۆلۆژیای تەواویەتخوازدا بریتی بوو لە پێکهێنان و بنەجێکردنی نموونەی فکریی «دۆست دوژمن». ئەم بیرکردنەوەیە لە لایەکەوە دەبێ نموونەیەک بێت بۆ لایەنگریی سیاسی و لە لایەکی دیکەشــەوە، لە خزمەت بەئیزۆتریککردنی بزاڤە تەواویەتخوازەکاندا. ئاخافتن لە ســەر رەگەزی بەرزتر، پێویستیە سروشتیەکان، سرشتی تایبەت و دوژمنی چینایەتی بەم مانایە دێت کە رێگا بۆ دروستکردنی ئۆردوگاکانی مەرگ، ژوورەکانی گاز، نەخۆشــخانە دەروونیــەکان و دوورگەکانی گولاگ خۆش دەکرێت. بــەڵام ئــەم ئایدیۆلۆژیایە هەر بەوە قەناعەت ناکات کە تەنیا لافــی ئەوە لێ بدات کە هەقیقەتی رەهای

پێیە، یان خۆی بە هەڵگری پەیامێکی مێژوویی بزانێت. ئەمە ئەرکی ڕێبەریی بزاڤی تەواویەتخوازە کە لەخۆبردووانە و بە کەڵکوەرگرتن لە تێکڕای ئەو کەرەستانەی لەبەردەستدان، هەوڵ بۆ دەستەبەرکردن و ناساندنی ئامانجەکانی خۆی بدات.

ســـەرەڕای پڕوپاگەندە و هاندان، ستراتژیی «پاراســـتن»یش بۆ وەدیهێنانی ئایدیۆلۆژیای تۆتالیتار کەڵکی لێ وەردەگیرێت. پاراستن بە مانای تێکنیکێکی تایبەتی شۆردنەوەی مێشک دێت، کە تەنیا ئەو کەسانە بە خاوەن بەهرەی دۆزینەوەی هەقیقەتی مێژوویی کۆمەڵایەتی دەزانێت کە سەر بە دەستەیەکی تایبەت بن. بۆ وێنە، کەسێک کە سەر بە ڕەگەزی ئاریایی یان ئەندامی پێشەنگی پرۆلیتاریا بێت. دیارە ئەم بەهرە تاکەکەسیە لە ڕێگای هەوڵ و بەرپرسایەتیی تاکەکەسیەوە وەدەست نایەت، بەڵکو تەنیا بە یارمەتی و نێوبژیوانی ئیلیتەکان و حیزبی تۆتالیتار شکۆفا دەبێت. ڕێبەر و حیزب تاکانە گارانتیکاری هەقیقەتن و، لە ئاکامیشـــدا هەر ئەوانن کە دیاری دەکەن چ کەســـێک بەهرەی گەیشـــتن بە هەقیقەتی مێژوویی کۆمەڵایەتی هەیە. هەموو ئەم کارکردانەی ئایدیۆلۆژیای تۆتالیتار لە ئاکامدا لێک گرێ دەدرێن و لە نموونەی فکریی «دۆســـت دوژمن»دا کۆتاییان پێ دێت، هەتا لە ئەنجامدا نێوەرۆکی ئایدیۆلۆژیای تۆتالیتـــار پێک بێنن و لە دیکتاتۆریی تەواویەتخـــوازدا کەڵکی لێ وەربگیرێت. لەم ڕوویەوە لە زۆرێک لەو توێژینەوانەدا کە ســـەبارەت بە بزاڤە تۆتالیتارەکان دەکرێن، نموونەی فکریی دۆست دوژمن وەکوو توخمی پێکهێنەری هەر سیســـتمێکی تۆتالیتار قوت دەبێتەوە. ئەم نموونە فکریە جێگە و پێگەیەکی ناوەندی هەیە، چونکە نەک تەنیا لایەنگریی سیاسی بۆ ئەندامانی بزاڤی تەواویەتخواز هاسان دەکاتەوە، بەڵکو ســـتراتژیی «پاراستن» و «شوناسدۆزی»، بە شێوەیەکی باشتر، لە زەینی تاکدا جێگیر دەکات. ئاکامی ئەم وەجۆشوخرۆشهێنان، چوارچێوەسازی و وێنەکێشانی ڕەش و سپیە رادیکاڵیزەبوونی هەست و خواســـت و هزری تاکەکەســـە. بۆ گەیشـــتن بە ئامانجێکی لـــەم چەشـــنە، کەڵکوەرگرتن لە هەموو کەرەســـتە سیاســـی و ئایدیۆلۆژیەکان و تەنانەت دەســـتێوەردانی هەرێمی تاکەکەسی، بە کارێکی ڕەوا دەزانرێت. بەم پێیە دەتوانین جارێکی دیکەش وەبیری بێنینەوە کە نموونەی فکریی «دۆست دوژمن»، بە ئاشـــکرا، بە یەکێک لە تایبەتمەندیە پێکهاتەیی و ســـاماندەرەکانی دەسەڵاتداریەتیی تەواویەتخواز لەقەڵەم دەدرێت.

بـــە کورتی دەتوانین بڵێین کـــە، ئامانجی ئایدیۆلۆژیای تۆتالیتار تەنیا بەدواداچوون و ســـەرکوتی نەیـــاران نیە، بەڵکو دەخوازێت بە تەواوەتی ئـــەم نەیارە لەناو ببات. چونکە، نەیار تەنیا دوژمنێک نیە کە دەبێ بە ســـەریدا ســـەربکەویت، بەڵکو زیاتر «بنەمایەکی هەرەشـــەکەر»ە. پاساودانەوە و تەنانەت پێویستی بە تەواوەتیی لەناوبردنی نەیارەکان، لە لافێکەوە سەرچاوە دەگرێت کە نکۆڵی لە ڕەوتی بوون و بایەخی ژیانی دەکات. کەواتە ڕژیمی تەواویەتخواز تەنیا لە ســـەر بنەمای ئایدیۆلۆژیا ڕانەوەســـتاوە، بەڵکو ستوونەکەی تری ئەم ڕژیمە، تیرۆرە.

## ئاستەکانی تیرۆری سیاسی:

یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی تێکڕای سیســـتمە تۆتالیتـــارەکان، بەکارهێنانی بەربڵاوی توندوتیژیە. ئەم تایبەتمەندیانەی خوارەوە گوزارشت لە بەربڵاویی سامناکی سەرکوت و تیرۆری سیاسی لە سیستمە تۆتالیتارەکانـــدا دەکەن: پۆلیســـی نهێنی کە بە توندی کۆمەڵگە دەخاتـــە ژێر کۆنترۆڵەوە، گرتووخانە کاتیەکان، ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملی، قۆڵبەســـتکردنی بێبنەما، ئەشکەنجە و لەسێدارەدانی تاکەکان بێ ئەوەی تاوانێکیان کردبێت، بەدواداچوون، سەرکوت و کوشتنی گروپە گەورە کۆمەڵایەتیەکان، کەمینە

ئایینی و ئەتنیکیەکان و نەیاران و جیابیران، نەبوونی دادگەی ئاشکرا، نەبوونی مافی داکۆکی لەخۆکردن و دەرکردنی حوکمی قورس و نادادپەروەرانە بۆ تۆمەتباران. دەبێ ئەوەش بڵێین کە رەهەندە بەرینەکانی ئەم چەشنە تیرۆرە لە مێژوودا بێوێنەیە.

سەرەتا بزانین تیرۆری سیاسی چیە؟ تیرۆری سیاسی بریتیە لە بەکارهێنانی بەرفراوانی توندوتیژی بە دژی تاکەکەسەکان و گروپە کۆمەڵایەتیەکان لە لایەن ئۆرگانەکانی دەسەڵاتی سیاسیەوە. دیارە تیرۆر لە سیســـتمە ناتۆتالیتارەکانیشدا بەدی دەکرێت، سیســـتمگەلێکی نادێمۆکراتی، کە بە دەربڕینێک کە هانا ئارێنت سەبارەت بە دەسەڵاتداریەتیی تەواویەتخواز پێشکەشی دەکات، لە رێگای «لۆژیکی هزری ئایدیۆلۆژیایی»ەوە دەسنیشان ناکرێن. لە لایەکی دیکەوە، دەکرێت رژیمگەلێکی دیکەش وێنا بکەین کە خاوەن تایبەتمەندیەکانی رژیمێکی تەواویەتخواز بن و بەبێ ئەم چەشـــنە لە تیرۆری سیاســـی، بکەونە ریزی رژیمە هەیمەنەخوازەکان (ئاتۆریتەر)، نەک رژیمە تەواویەتخوازەکان (تۆتالیتار). دیارە مەبەستمان ئەوە نیە کە دەتوانین چاوەڕوانی ئەو ئازادیە سیاسیانە لەم رژیمانە بکەین کە شاریڤانێکی (هاوڵاتیەکی) کۆمەڵگەی دێمۆکراتی هەیەتی. بەڵام لە رژیمە هەیمەنەخوازەکاندا، ســـەرەڕای ئەوەی کە ســـنوورگەلێک بۆ دەسەڵاتی سەربەخۆیانەی پۆلیس دانراوە، کۆمەڵێک گارانتیی سنووررداری یاساییش لە ئارا دان. هەر ئەمەش ئاسایشـــێکی رێژەیی بۆ ئەو کەسانە دابین دەکات کە توشی یاساشکێنی نابن. بە دەربڕینێکی دیکـــە، لە سیســـتمە هەیمەنەخوازەکاندا مادام شـــاریڤانێک رژیمی نەبردبێتە ژێر پرســـیار، دەتوانێت بـــژی بەبێ ئەوەی کە لە بەدواداچوونی دەوڵەت بترســـێت. رژیمێک کە خـــاوەن ئەم تایبەتمەندیانەیە، دەتوانێت تەنانەت پێکهاتەگەلێکی دەسەڵاتی تاک سەروەرانە و باوەڕگەلێکی ئایدیۆلۆژیاییشی هەبێت. لە رەوشـــێکی لەم چەشنەدا دەتوانین لە «سیســـتمە تەواویەتخوازە بێ تیرۆرەکان» بدوێین. بۆ وێنە لە دەیەکانی کۆتایی تەمەنی رژیمی ســـۆڤیەتدا، ئاســـتەکانی تیرۆر لەم سیستمەدا بە رادەی سەردەمی دەســـەڵاتداریی ســـتالین نەبوو. بەم پێیە ئەم پرســـیارە دێتە ئارا کە، داخوا دەتوانین لە نێوان چەشنە جۆراوجۆرەکانی تیرۆردا جیاوازی دابنێین و ئایا تیرۆر قۆناخگەلێکی جۆراوجۆری هەیە؟

«خوان لینتس»، توێژەری ئاڵمانی ســـپانیایی، کە توێژینەوەگەلێکی بەربڵاوی لە بارەی شێوەکانی حکومەت و جۆرەکانی دەوڵەت کردوە، ئەم تایبەتمەندیانە بۆ پرسی توندوتیژی لە رژیمە تەواویەتخوازەکاندا دەسنیشان دەکات:

1ـ ئاستە بێ وێنەکانی تیرۆر لەم رژیمانەدا.

2ـ بەکارهێنانـــی تیـــرۆر بە دژی گروپە کۆمەڵایەتیەکان بەبێ ئەوەی لـــە بەر رەفتارێکی دیاریکراو تاوانێکیان بە سەردا سەپابێت.

3ـ تەنانەت گوێنەدان بە بەدواداچوونگەلێکی یاســـایی رووکەشـــیانە، دادگا رووکاریەکان و نەلوانی ئەوەی کە تۆمەتبار بە جۆرێک داکۆکی لە خۆی بکات.

4ـ هەڤانیەتی مۆراڵیی دامەزراوە دەسەڵاتدارەکان.

5ـ بەرفراوانبوونەوەی تیرۆر بۆ ئەندامانی گروپی ئیلیتەکان.

6ـ بەرفراوانبوونەوەی رادەی گوشار و بەدواداچوون بۆ ئەندمانی بنەماڵەی تۆمەتباران.

7ـ پێداگرتـــن لە ســـەر ویســـتە دەرونیەکان و تایبەتمەندیـــە کۆمەڵایەتیەکانـــی تۆمەتباران، نەک هەڵسوکەوتەکانیان.

8ـ بەکارهێنانی رێکخراوەکانی دەوڵەت یان حیزب لە جێی ئەو رەگەزانەی بە ناو کۆنترۆڵ ناکرێن و گەورەیی و پێچاوپێچی ئەم رێکخراوانە.

9ـ بەردەوامی و هەندێکجار زۆربوونی تیرۆر لە دوای سەقامگیرکردنی بنەماکانی هەیمەنەی رژێم.

10ـ و لە ئاکامیشـــدا ئەم راستیەی کە سیاسەتی سەرکوتکەرانە تەنانەت هەڕەشە لە رێبەریی هێزە چەکدارەکان دەکات.[٩]

رێژەی تیرۆر لە سیستمە تەواویەتخوازەکاندا لە ئاستێک دایە کە باوەڕی پێ ناکرێت. دیارە ناتوانین بـــاس لە رێژەیەکی دیاریکراو لەم بوارەدا بکەین، بەڵام مەزندەگەلێک لە لایەن توێژەرانەوە روو کراوە کە گومانێکـــی ئەوتـــۆ ناهێڵنەوە. بۆ وێنە بە گوێرەی لێکۆڵینەوەکانی کۆنکوســـت و مەدودف، رێژەی ئەو کەســـانەی تا کۆتایی سیەکان لە لایەن رژێمی ستالینەوە لەسێدارە دراون، لە دەوروبەری یەک میلیۆن کـــەس دایە. رێژەی ئەو کەســـانەی کە لە یەکیەتیی ســـۆڤیەتدا لە ئۆردوگاکانـــی کاری زۆرەملی دان، هەتا ســـاڵی ١٩٤٠، لە نێوان شـــەش تا دوازدە میلیۆن کەسدا مەزندە کراوە. ئەگەر بە پارێزەوە نێونجی ئـــەم ئەژمارە بگرێنە بەرچاو، رێژەی قوربانیانی ئۆردوگاکانی ســـتالینی، لە مەودای نێوان ســـاڵەکانی ١٩٣٦ ـ ٥٠دا، دوازدە میلیۆن کەس بووە. کۆنکوســـت بە زیادکردنی رێژەی لەسێدارەدراوان و قوربانیانی کۆچپێکردنـــی بەزۆرەملی و بەهاوبەشـــکردنی ئەم قوربانیانە، بە رێـــژەی نزیک بە ٢٠ میلیۆن قوربانی دەگات لە قۆناغی دەسەڵاتداریی ستالیندا.[١٠]

ئەم رێژەیە بۆ قۆناخی ســـەقامگیربوونی رژێمی کۆمۆنیستی لە چیندا زۆر کەمتر بوو. مایۆتسەدون لە فێڤریەی ســـاڵی ١٩٦٧دا رایگەیاند کە لە دەوروبەری هەشتســـەد هەزار کەس لە «دوژمنانی گەل» کوژراون. توێژینەوەکانی تر رێژەی قوربانیان لە چیندا لە نێوان یەک تا ســـێ میلیۆن کەســـدا مەزندە کردوە.

راتینگلەر تەنیا رێژەی قوربانیانی جووی رژێمی نازی بە پتر لە چوار میلیۆن کەس مەزندە دەکات. ئـــەم رێژەیە بـــۆ تێکڕای قوربانیانی جوو دەگاتە شـــەش میلیۆن کەس. لە ئاڵمانی نازیدا، ســـەرەڕای جووەکان و نەیارانی سیاســـی، کولیەکان، ئەندامانی فرقە ئایینیەکان، هۆمۆسێکســـواڵەکان و هەروەها کەمئەندامان و دواکەوتووانی مێشـــکی لە ریزی قوربانیانی تیرۆردا بوون. لە ئیتالیا، لەگەڵ ئەوەدا کە سیســـتمی تەواویەتخواز بە تەواوەتی بە ســـەر وڵاتدا زاڵ بوو، ئاستەکانی قوربانیانی تیرۆر زۆر بەرین نەبوون. دادگەکانی موسولینی بە گشتی پێنج هەزار و شەشسەد کەسیان رەوانەی گۆڕستان کرد.[١١]

یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی تیرۆر لە سیســـتمی تەواویەتخـــوازدا بێ¬مافی تەواوی تۆمەتباران و پێشـــێلکرانی دادپەروەری بوو. ویشینســـکی، دادوەری گشتیی یەکیەتیی ســـۆڤیەت، لە ساڵی ١٩٣٥دا نووسی: «یاسای دارێژراو پەیڕەوی لە یاسای شۆڕش دەکات. دەکرێت دژایەتی و نەیاریگەلێک لە نێوان برشتی یاسا و شۆڕشدا پێک بێت. لە رەوشێکی لەم چەشنەدا دەبێ سیاسەتی حیزب بکەینە جێنشینی لێکدانەوە یاساییە وێناکراوەکان.»[١٢]

یەکێکی دی لە تایبەتمەندیەکانی تیرۆری سیستمی تۆتالیتار ئەوەیە کە تیرۆر هەتا ئاستی ئیلیتە دەسەڵاتدارەکانیش پەل دەهاوێژێت. ستالین، جگە لە زۆرینەی هەرە زۆری رێبەرانی حیزبی بێلشویک، بە گشتی سی و پێنج هەزار ئەفسەری پایەبەرزی ئەرتەشی سووری لەسێدارە دا یان ئەوەی کە رەوانەی بەندیخانەی کردن. لە نێو ئەمانەدا چاومان بە ناوی سێ مارشال و چواردە ژنراڵ دەکەوێت.

هیتلەریش بیســـت ژنراڵی ئەرتەشـــەکەی خۆی لەنێو برد. دیارە دەبێ ئـــەم خاڵە رەچاو بکەین کە هیتلەر لە دوای ئەوەی کە دەسەڵاتی لە ئاڵماندا بەدەستەوە گرت، پاکسازیکردنی لە نێو گروپی زرەبەتی خۆیەوە (SA) دەست پێ کرد. لە ژوئەنی ١٩٣٤دا، لە هێرشێکی لەناکاوی شەوانەدا کە بە «شەوی ------ درێژ» ناسراوە، ٧٧ کەس لە رێبەرانی ئەم گروپە قۆڵبەست کران و لەسێدارە دران.

## هەڵسەنگاندنی تیۆری تەواویەتخوازی:

چەمکی تەواویەتخوازی، کە دەربڕی چەشـــنێکی تـــازە لە حکومەتە دیکتاتۆریەکانە لە مێژوودا، لە باسەکانی سیاسەتناسی لە دەیەی پەنجای سەدەی رابردوودا، چەمکێکی پەسندکراو بوو. بە دەسپێکردنی دەیەی شەست، روانگەگەلێکی پێکدژ سەبارەت بە رەخنەکاری و هەڵسەنگاندنی تیۆری تەواویەتخوازی هاتنە ئارا. ئەو روانگانە، بە گشتی، لەو گۆڕانکاریانەوە سەرچاوەیان دەگرت کە لە دوای مردنی ستالین و، لە ئاکامی چاکسازیەکانی خرۆشچۆف لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا روویان دا.

لە ئاماژەیەکی گشتیدا دەتوانین بڵێین کە دوو نموونەی بەڵگەمەندانە بە دژی تیۆری تەواویەتخوازی و کارایی زانستیی ئەم تیۆرە هاتوونە گۆڕ، کە دیارە لایەنگەلێکی هاوبەشیشیان پێکەوە هەبوو. یەکەم، بەڵگاندنێک کە کێشەگەلێکی مێتۆدیانەیان لەم تیۆرەدا بەدی کرد و ئەویتر، بەڵگاندنگەلێک کە قامکیان لە ســـەر دژایەتیە نێوەرۆکیەکان دادەنا، هەر لە ئاخێزگەی مێژوویییەوە هەتا دەرکەوتە جۆراوجۆرەکان و خەیاڵـــە ئارمانجیەکانی سیســـتمی تەواویەتخواز. تەنیا بە ئاماژەیەک دەبـــێ بڵێین کە رەخنەگرانی میتۆدیکـــی تیۆری تەواویەتخوازی، لە بنەمادا میتۆدی واتاســـازی بە گوێرەی چەشـــنە ئایدیالەکان لە زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا بە ناکارامە دەزانن و، تەنیا تیۆری تەواویەتخوازی رەخنەکاری ناکەن.[١٣]

رەخنەکانی تر ئاماژەیان بە کارایی راڤەی زانستیانەی گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتی سیاسیەکانی یەکیەتیی ســـۆڤیەت لە دوای مردنی ســـتالین دەکرد. لە پاش ئەم رووداوە ئەم پرسیار و گومانە هاتە ئارا کە ئایا چەمکـــی تەواویەتخوازی چەمکێکی داخراوو چەقبەســـتوو نیە کە لە گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکان خافڵ دەبێت؟

یەکێکی تر لە رەخنەکان گرنگی بە پێشمەرجە مێژووییەکان و بە تایبەتی بەراوردی تۆتالیتاریسمە جۆراوجـــۆرەکان لەگـــەڵ یەکتردا دەدات. تیـــۆری تەواویەتخوازی لەم روویەوە بـــە ناکارامە دەنرخا کە فاشیســـم لە ئیتالیای موســـولینیدا جیاوازیگەلێکی بەرچاوی لەگەڵ ناســـیۆنال سوسیالیزمی ئاڵمانی هیتلەری و کۆمۆنیســـمی ستالینیدا هەبوو. بەو شێوەیەی کە باسی دەکرا، فاشیزم لە ئیتالیا هیچکات بە کەماڵی ناسیۆنال سۆسیالیسم لە ئاڵماندا نەگەیشت. بۆ وێنە، ئەگەرچی بە هۆی هاندان و گوشاری هیتلەر، هەنگاوگەلێک بە دژی جووەکان لە ئیتالیادا پەرەیان ئەستاند، بەڵام کارەساتی هۆلۆکاست لەم وڵاتەدا رووی نەدا.

## تێبینی کۆتایی:

بە پێی تیۆری تۆتالیتاریزم، کاتێک دەتوانین باس لە دیکتاتۆری یان دەسەڵاتداریەتیی تەواویەتخواز بکەیـــن کە بزاڤێکی شۆڕشـــگێڕانە یاخود شێوەشۆڕشـــگێڕانە، بە رێبەریی تاک یـــان کەمینەیەک، بە شـــێوەیەکی تەواویەتخوازانە دەســـت بە سەر دەوڵەتدا بگرێت و دەســـەڵاتێکی سیاسیی بێ¬سنوور و کۆنترۆڵ نەکراوی هەبێت. ئیلیتەکانی ئەم بزاڤە لە حیزبێکی بە توندی سانترالیزەکراو، شێوەسەربازی و تۆتالیتاردا رێک خراون و پلە ســـەرەکیەکانی دەزگا دەوڵەتیەکان، لە بۆرۆکراســـیەوە هەتا ئەرتەش و دەزگای دادوەری و ئابووریان لە ئەستۆیە.

دەســـەڵاتداریەتیی تۆتالیتار دەسەڵاتەکان لێک جیا ناکاتەوە و جەستەی دەوڵەت دەکاتە دەزگایەکی چڕکراوەی بۆرۆکراتی، کە رێنوێنیکردنی سیســـتمی تۆتالیتاری لە ئەســـتۆیە، بەبێ هیچ ئاستەنگێک دەست لە هەموو رووبەرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و تەنانەت هەرێمی تاکەکەسی، چ بنەماڵە، شوێنی کار،

ئەنجومەنەکان و چ ناوەندەکانی کاتی و پشوو و پشووی هاوینی و ... وەردەدات. ئەم دەزگایە تێکڕای ئەم بیاڤانە دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی پلانبۆدانراوی خۆیەوە، درزە دەکاتە نێو هەموویان و هیچ بۆشگایەکی کراوە ناهێڵێتەوە. بەم چەشنە، دەوڵەت و ڕێکخراو (تەکووزی، نەزم)ی سیاسی لە کۆمەڵگەدا بە تەواوەتی تێکەل بە یەکتر دەبن و دەبنە یەک. ئازادیی حیزبەکان، ڕاگەیاندن و دەربڕین بە تەواوەتی لەنێو دەبرێن، ڕاگەیەنە گشتیەکان پاوان دەکرێن و پڕوپاگەندە و پەرەپێدانی ئایدیۆلۆژیا باڵ بە سەر هەموو شوێنێکدا دەکێشێت و بۆشگاکان دەخاتە ژێر زاڵیەتیی خۆیەوە. هەموو ئەنجومەن و ناوەندە کۆمەڵایەتیەکان، تەنانەت ئەوانەی کە سیاسی نین، دەبنە کاناڵگەلێک کە بە دەوری دەسەڵاتی سیاسیدا دەسوڕێنەوە. کارکردی ئەم کاناڵانە بریتیە لە دەسڕۆیشتوویی سیاسیی بەتەواومانا لە کۆمەڵگەدا، یەکسانسازیی تاکەکان و کردنی کۆمەڵگە بە کۆیەکی پێکهاتوو لە یەکسانەکان. ئەم یەکسانسازیە بە یارمەتیی ئایدیۆلۆژیایەکی داڕێژراو بەڕێوە دەچێت کە خاوەن توخمگەلێکی یوتوپیاییە و بەڵێنی داهاتوویەکی ڕووناک دەدات.

تیرۆری بەرفراوان و سامناک یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندیەکانی سیستمی تۆتالیتارە. ئەرکی پۆلیسی نهێنی و ڕێکخراوە ئەمنیەکان ئەوەیە کە کۆنترۆڵی تەواووەختی کۆمەڵگە بەدەستەوە بگرن، هەر دەنگێکی دژبەر لە گەرووەدا بخنکێنن و هەموو نەیارە سیاسیەکان بە تەواوەتی لەناو ببەن. قۆڵبەستکردنی بێ¬بنەما، ئازاردان، ئەشکەنجە و کوشتنی تاکەکان، گروپە کۆمەڵایەتیەکان و تەنانەت چینەکان، بەشێک لە بەرنامەیەکی ڕێکخراوی دەسەڵاتداریەتیی تەواویەتخوازن بۆ پێکهێنانی بۆشگایەکی پۆلیسی لە کۆمەڵگەدا و ترساندنی شاریڤانان. ئەو کارانەی کە لە سەر بنەمای تیرۆر راوەستاون ئاستێکی بەرین و ئێجگار بەرفراوان بەخۆیانەوە دەگرن.

## ژێدەرەکان:


1-Giovanni Amendola، zitiert nach: Eckhard Jesse: Die Totalitarismusforschung im Streit der Meinungen، Bonn 1996، S. 12.

2-Carl Schmitt: Der Begriff des Politischen، Munchen 1963، S. 26 ff.

3-Hans Kohn: Dictatorship in the Modern World، zitiert nach: Uwe Bacjes: Totalitarismus- Ein Phanomen des 20. Jahrhunderts?، Bonn 1996، S.309.

4-Zitiert nach: Uwe Backes، a.a.O.، S. 310.

5-Hanna Arendt: Elemente und Ursprunge totaler Herrschaft، Munchen 2006، S. 944 ff.

6-C. J. Friedrich/Z. Brzenzinsi: Die allgemeine Merkmale der totalitaren Diktatur، Bonn 1996، S. 230-231.

7-Hannah Arendt، a.a.O.، S. 792 ff.

8-Manes Sperber Zur Analyse der Tyrannis، Garz 2006، S. 16.

9-Juhan J. Linz: Typen politischer Regime und die Achtung der Menschenrechte، Bonn 1996، S. 517.

10-Juan J. Linz، a.a.O.، S. 518.

11-Juan J. Linz، a.a.O.، S. 518.

12-Juan J. Linz، a.a.O.، S. 519.

13-Hans-Joachim Lieber: Zur Theorie totalitarer Herrschaft، Bonn 1993، S. 888 ff.

## یەکەم/ ژیانی «کارل مارکس»:

کارل مارکس» ساڵی ١٨١٨ لە شاری (تریفز)ی ئەڵەمانی و لە بنەماڵەیەکی بۆرژوازی جولەکە هاتۆتە دنیاوە. باپیری یەکێک بووە لە حاخاماتە جولەکەکانی ناو ئەڵەمانیا. باوکیشی پارێزەر بووە، بەڵام ناچار بووە دەستبەرداری ئایینی جولەکە بێت و بچێتە سەر ئایینزای پرۆتستانتی، تا بتوانێت لەناو ئەڵەمانیادا مومارەسەی پیشەکەی بکات، چونکە ئەڵەمانیەکان ڕقێکی زۆریان لە جولەکە بوو، متمانەیان پێنەدەکردن و هاوکات ڕێگەی ئەوەشیان نەدەدان دەست بۆ هەندێ کارو پیشەبەرن.

«مارکس» دوای ئەوەی لە شاری «تریفز»ی زێدی خۆیدا و لە ژێر چاودێری باوکیدا خوێندنی ئامادەیی تەواو کرد، دەستی بە خوێندنی باڵا کرد لە زانکۆکانی (بۆن و بەرلین و ئیینا). لەوێشدا بە خوێندنی فەلسەفە و مێژووەوە سەرقاڵ بوو. لەم قۆناغەدا کەوتە ژێر کاریگەری دید و بۆچونەکانی «هیگڵ» و لە زانکۆی بەرلین دا پەیوەندی بە ڕێکخراوی خوێندکارانی ڕادیکالەوە کرد کە ناویان لە خۆیان نابوو (هیگڵیە چەپڕەوەکان). ساڵی ١٨٤١ بڕوانامەی دکتۆرای لە زانکۆی (ئیینا) وەرگرت. ئەم زانکۆیە لە ژێر چاودێری ڕاستەوخۆی دەوڵەتدا نەبوو. هەر لەو ساڵەدا «مارکس» ڕوی لە دنیای ڕۆژنامەنوسی کرد و لە ماوەیەکی کەمدا، بوو بە سەرنوسەری ڕۆژنامەیەکی تازە کە گروپێک لە لیبرالیزمەکانی شاری کولن دایان مەزراندبوو، بەڵام زۆری نەبرد ڕۆژنامەکە لە دەرچوون وەستا. دوای ئەوە ڕویکردە پاریس تا بەشداری لە دەرچواندنی ڕۆژنامەیەکی تازەدا بکات، بە دوور لە سانسۆری دەسەڵاتدارانی ئەڵەمانیا.

ساڵی ١٩٤٣ و دوای عەشقێکی قووڵ، کچی گەورە فەرمانبەرێکی حکومی دەخوازێت و دەچێتە ژیانی هاوسەریەوە. لە پاریس ئاشنایەتی لەگەڵ «برۆدۆن» و ڕابەرانی سۆسیالیزمی فەرەنسیدا پەیدا دەکات، ئەمەش بواری ئەوەی بۆ ڕەخساند تا لە نزیکەوە شارەزای ڕێچکا جیاجیاکانی سوسیالیزمی فەرەنسی بێت، هاوکات هەر لەوێشدا ئاشنایەتی لەگەڵ «فردریک ئەنگلز»ی هاوڕێی تەمەنیدا پەیدا دەکات. بەڵام مانەوەی لە پاریس زۆر درێژە ناکێشێت و هەر زوو لە ساڵی ١٨٤٥ لە فەرەنساوە دوور دەخرێتەوە بۆ بەلجیکا، ساڵی ١٨٤٨ سەرلەنوێ لە بەلجیکاش دەردەکرێت، بەهۆی بەشداریکردنی لە شۆڕشەکانی ئەڵەمانیاو فەرەنسای ساڵی ١٨٤٨دا. دوای ئەوەی لە بەلجیکا دەردەکرێت، دەگەڕێتەوە بۆ ئەڵەمانیا، بەڵام لەوێش ڕێی مانەوەی پێنادەن و دەریدەکەن . دواجار و دوای داوایەکی زۆری «ئەنگلز»ی هاوڕێی ڕودەکاتە لەندەن و لەوێدا دەمێنێتەوە، تا ساتەوەختی مردنی لە ساڵی ١٨٨٣ دا.

«مارکس» ژیانێکی هەژارانە و پڕ چەرمەسەری ژیاوە، گەر «ئەنگلز»ی هاوڕێی و یارمەتی ئەو نەبوایە، نەیدەتوانی ببێتە ئەوەی کە پێی گەیشت، چونکە دەبوو هەر خەریکی پەیدا کردنی بژێوی ژیان بوایە. «ئەنگلز»ی هاوڕێی پارەو پولی پێویستی بەردەست دەخست، بۆ ئەوەی ژیانی مسۆگەر بێت و خۆی تەرخان کات بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمە مێژوویی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانی، کە تێکڕا هەموویان بونە بنەمای فیکریی سوسیالیزمی زانستی.

## دووەم/ بەرەوپێشچونی فیکری «مارکس»:

"ئەنگلز» لە ئاشناکردنی «مارکس» بە فیکری ئابوری، ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو، چونکە ئەو پێشتر تەنها سەرقاڵی فیکری فەلسەفی و کۆمەڵایەتی بوو. لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین «مارکس» سەرەتای ژیانی فیکری خۆی وەک کۆمۆنیستێک دەست پێنەکرد، بەڵکو ژیانی فیکری ئەو بە سێ قۆناغدا

تێدەپەڕێت، لە هەر یەکێک لەو قۆناغانەشـــدا «مارکس» تەعبیری لە فەلسەفەیەکی دیاریکراو کردووە.
قۆناغی یەکەم، لە سەردەمی لاوێتیەوە دەست پێدەکات و تا ساڵی ١٨٤٥ دەخایەنێت. لێرەدا «مارکس» باوەڕی بە ڕێبازی دیموکراســی فەردانی هەبوو، داکۆکیشــی لێدەکرد. لەم قۆناغەدا کتێبی (ڕەخنە لە فەلسـەفەی یاسای لای هیگڵ) و (پرســی جولەکە)ی بڵاوکردەوەو هەردوو کتێبەکەش لە ساڵی ١٨٤٤دا چاپکران. (پرســی جولەکە) بە گرنگترین کتێبی ئەم قۆناغەی «مارکس» ئەژمار دەکرێت، تیایدا باس لەو هۆکارانە دەکات کە پرســی جولەکەیان کردۆتە پرسـێکی نێو دەوڵەتی. دواجار لە ســاڵی ١٨٤٥ و پێکەوە لەگەڵ «ئەنگلز»دا (خانەوادەی پیرۆز) دەنوسـێت و ئەمەش ئامادەی دەکات بۆ ئەوەی هەنگاو بەرەو دووەم قۆناغی گەشەسەندنی فیکریی بنێت.

قۆناغی دووەم، بە کتێبی (خانەوادەی پیرۆز) دەست پێدەکات و لەگەڵ بڵاوکردنەوەی (مانیفێست)یشدا لە ساڵی ١٨٤٨ کۆتایی دێت. (مانیفێست) هێڵە گشتیەکانی تێنۆڕینی ئەو بۆ کۆمۆنیزم لەخۆ دەگرێت. تایبەتمەندی ئەم قۆناغە لە بەرەو پێشـچونی فیکری «مارکس»دا، ئەوەیە کە بەشێوەیەکی شێلگیرانە لە سوسـیالیزمی میانڕەوەوە بەرەو سوســیالیزمی زانســتی دەچوو، واتە لە قۆناغی سەرسامبوون بە بیروبۆچوونی سوسیالیزمی ئایدیالیســتانەوە دەچووبەرەو پەلاماردانی و هەڵتەکاندنی بنەماکانی، ئەم پرۆسەیەش بە ئاشکرا لە کتێبەکەیدا (بؤس الفلسفة)دا دیارە کە چۆن هێرش دەکاتە سەر «برۆدۆن» و سوسیالیزمی فەرەنسی.

هەرچی قۆناغی سێهەمیشە، ئەوا لە بەرواری بڵاوکردنەوەی (مانیفێست)ەوە لە ساڵی ١٨٤٨ دەست پێدەکات تا کاتی لە دنیا دەرچونی. لەم قۆناغەدا «مارکس» لە ســاڵی ١٨٦٧ بەشــی یەکەمی کتێبی (کەپیتاڵ)ی بڵاوکردەوە، پاشان «ئەنگلز» لە دوای مردنی و لە ساڵانی ١٨٨٥ و ١٨٩٥ دا، بەرگی دووەم و ســێیەمی بڵاوکردەوە. هەر لەم قۆناغەدا «مارکس» هەســتا بەدامەزراندنی بزاوتێک کە بوو بە چەقی کاری کۆمۆنســتی، ئەویش ئەنتەرناسیۆنالیزمی یەکەمین بوو لە ژێر ناوی (فیدراسیۆنی نێو دەوڵەتی کرێکاران) و ئەمەش لە ساڵی ١٨٦٤ دا بوو.

## سێیەم/ بنەماکانی فیکری مارکسی:

گرنگترین شــتێک کە «مارکس» لــە بیریارانی دیکە جیا دەکاتەوە، ئەوەیە ئەو یەکەمین کەســە لــە هەموو ڕووەکانەوە لە ژیانی مرۆڤایەتی کۆڵیوەتەوە. بەلای بیریارانی ســەردەمەکەیەوە، «مارکس» فەیلەســوف و مێژوونــوس و کۆمەڵناس و توێژەری ئابوری بووە. ســەرەڕای ئەوەی لــە دیبەیتەکاندا قســەکەرێکی بە توانا و لێهاتوو بووە. هاوکات توانی ســتایلێکی نوێ بۆ شــرۆڤەکردنی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی بێنێتە ئارا، هەروەها چوارچێوەیەکی گشتیشــی بۆ ئەو پەرەســەندن و بەرەو پێشچونەش دەســت نیشانکرد لە داهاتودا. ســەرەڕای ئەوە، ئەو پلانی جوڵە و دەســت پێکردنەشی تاوتوێکرد کە پێویســتە لەلایەن ئەوانەوە لەبەرچاو بگیرێت کە دەیانەوێت گۆڕان لە بونیادی سیاســی و ئابووری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگادا بکەن.

بەم پێیەلێکۆڵینەوەکەی ئێمە دەربارەی فیکری مارکسی، گرنگی بە تەوەرە سەرەکیەکانی ئەو فیکرە دەدات کە دەکرێت لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کۆیان بکەینەوە:

١-ماتریالیزمی دیالەکتیکی.

٢-ماتریالیزمی مێژویی و ململانێی چینایەتی.

٣-تیۆرەی زێدەبایی و کەڵەکەبوونی سەرمایە.

٤-حەتمیەتی شۆڕش و هەرەسهێنانی سستمی سەرمایەداری.
لێرەدا کەم تا کورتێک باس لە یەک بەیەکی ئەم خاڵانە دەکەین.

## ١-ماتریالیزمی دیالەکتیکی[1]:

ڕەگ و ڕیشـــەی دیالەکتیـــک دەگەڕێتەوە بۆ ســـەردەمی گریک و بە تایبەتیـــش بۆ «هیراکلیتس». «هیراکلیتـــس» دەیوت: (مرۆڤ ناتوانێـــت دوجار لە ئاوی ڕوبارێکدا مەلە بـــکات، لەبەرئەوەی مرۆڤ گۆڕانی بەســـەردا دێت و ئاوی ڕوبارەکەش دەگۆڕێت). لە ڕێی ئەم وێنەیەوە دەکرێت یەکەمین پرانسیپ لە پرانســـیپەکانی دیالەکتیک ئاشـــکرا بکەین کە ئەویش پرانسیپی پەرەســـەندن و بەرەو پێشچوونە. هەرچەندە ڕەگوڕیشـــەی دیالەکتیک دەگەڕێتەوە بۆ ســـەردەمی گریک، بەڵام هەر بە نادیاری و پەنهانی مایەوە، تا «هیگڵ»ی فەیلەسوفی ئەڵەمانی پەی پێبرد و هێنایەوە ئارا.

«هێگڵ» لەســـەر بنەمای پێگەیەکی فەلســـەفی هەمەلایەن، واتە لەســـەر بنەمای پێشینەتی فیکر بەســـەر واقیعدا، گرنگی بە ڕێســـاکانی دیالەکتیک دا. لەبەرئەوە دەکرێت بڵێین دیالەکتیکی «هیگڵ» خەســـڵەتێکی فیکریی ئەبســـتراکتی هەبوو، لەبەرئەوەی بە تەنها فیکری کردبووە کایەی ئیشکردنی. دیالەکتیکی «هیگڵ»یش بەم شـــێوە ئایدیالیەی مایەوە، تا ئەو کاتەی «کارل مارکس» هات و توانی جەوهەری پەیوەندی دیالەکتیکی لێبە دەست بێنێت و هەروەها بیرو بۆچونەکانی لەسەر دابڕێژرێت بۆ شروڤەکردنی پرۆسەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی.

واتـــە «مارکس» لە بری ئەوەی دیالەکتیک لە فەلســـەفەی هیگڵیـــدا وەک خۆی وەربگرێت، هەوڵی دا گۆڕانـــکاری تێدا بکات و پرانســـیپی تازەی بۆ دابنێت. ئەو پرانســـیپە نوێیەش بریتی بوو لە مادە کـــە «مارکس» لە ماتریالیزمی دیالەکتیکدا بە خاڵی دەســـپێکی دەدایە قەڵـــەم. هەروەها کۆمەڵگەو پەیوەندیـــە کۆمەڵایەتیەکانـــی بە کایەی کارکردنی دیالەکتیک دەزانی. بەمجۆرە «مارکس» هەســـتا بە ژێرەو ژورکردنی ئەو بونیادەی «هیگڵ» دایمەزراندبوو، واتە دیالەکتیکی خستەوە سەرپێ پاش ئەوەی «هیگڵ» لەسەر سەرڕایگرتبوو.

بۆ شرۆڤەکردنی ماتریالیزمی دیالەکتیک، دەتوانین بڵێین «مارکس» لەگەڵ پرانسیپی گەشەسەندن و بەرەو پێشـــچوندا، پشـــتی بە پرانســـیپی ناکۆکیش بەستبوو، پرانســـیپێک کە باس لە حەتمیەتی ململانێی نێوان شتە ناکۆکەکان دەکات. ئەم ململانێیە کە دۆخەکەو دژەکەشی تێدەپەڕێنێت تا بگات بە یەکەیەکی کۆکەرەوە واتە بو نگۆڕین. هاوکات پشت ئەستوور بوو بە پرانسیپی قەڵەمبازی چۆنایەتی کە دەڵێت هەموو زیادبونێکی چەندایەتی دەبێتە مایەی گۆڕانی چۆنایەتی. لێرەوە دیالەکتیکی «مارکس» پێیوایە، گەردون بریتیە لە مادە و بەم پێیەش دەکرێت شرۆڤە بکرێت و لێی تێبگەین.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەو رۆڵەی «مارکس» دەیبەخشێتە بەرەو پێشەوە چونی ئامرازەکانی بەرهەم هێنان لە دروستکردنی مێژودا، وایان لێکرد تا وێنەیەک بۆ جوڵە و بزاوتی مێژویی بکێشـــێت. «مارکس» پێیوایە پەرەسەندنی ئامرازەکانی بەرهەم هێنان داینامۆی مێژووە، جگە لەوەش هەرچی هەیە لە دیاردەی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کلتوری و ئایینی و.. هتد، لە ڕاستیدا جگە لە ڕوکاری دەرەوەی پەرەسەندنی مادی شتێکی تر نییە.

لێرەوە «مارکس» پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دەکات بە دوو بەشەوە:

-ژێرخان INFRA-STRUCTURE كه‌ بریتیه‌ له‌ ئامرازی به‌رهه‌م هێنان و داینامۆی مێژووه‌.
-سه‌رخان SUPER-STRUCTURE بریتیه‌ له‌ ته‌واوی دامه‌زراوه‌ كۆمه‌ڵایه‌تیه‌كان، هه‌ر له‌ سیاسی و كلتوری و هونه‌ری و ئایینیه‌وه‌ بۆ دیارده‌ ده‌ره‌كیه‌كانی دیكه‌. له‌ ڕاستیشدا سه‌رخان پێبه‌ پێی ژێرخان په‌ره‌ده‌سه‌نێت و به‌ره‌و پێش ده‌چێت. كه‌واته‌ په‌یوه‌ندیه‌كی ئۆرگانی و حه‌تمی له‌ نێوان سه‌رخان و ژێرخاندا هه‌یه‌، هه‌روه‌ها په‌یوه‌ندیه‌كی دیاله‌كتیكیش له‌ نێوان هه‌ردووكیاندا هه‌یه‌.

## ٢-ماتریالیزمی مێژویی و ململانێی چینایه‌تی[٢] :

وه‌ك بینیمان لای «ماركس» ماده‌ هۆكاری سه‌ره‌كی پێشكه‌وتن و په‌ره‌سه‌ندنه‌ نه‌ك ئایدیا، وه‌كو ئه‌وه‌ی «هیگڵ» پێی وا بوو. «ماركس» له‌و باوه‌ڕه‌دابوو ئایدیا و سیاسه‌ت و ئایین و مۆراڵ له‌ گۆڕان و په‌ره‌سه‌ندنیاندا ده‌رگیری ماده‌ن، چونكه‌ ماده‌ بزوێنه‌ری سه‌ره‌كی مێژووه‌.

هۆكاری مادی و ئابوری كه‌ كاریگه‌ری له‌سه‌ر هه‌موو كایه‌كان و له‌سه‌ر چاره‌نوسی مێژویی داده‌نێت، به‌پێی ئاستی هونه‌ری به‌رهه‌م هێنان دیاریده‌كرێت. ئه‌وه‌ ئامراز و په‌یوه‌ندیه‌كانی به‌رهه‌م هێنانه‌ كه‌ فۆرم و سیستمی كۆمه‌ڵگه‌ دیاری ده‌كه‌ن. له‌به‌رئه‌وه‌ ئه‌وه‌ هه‌لومه‌رجی ئابوریه‌ كه‌ ئاستی كۆمه‌ڵایه‌تی و سیاسی و فیكری هه‌ر میلله‌تێك دیاری ده‌كات. كه‌واته‌ ماتریالیزمی مێژویی بریتیه‌ له‌ پراكتیزه‌كردنی ماتریالیزمی دیاله‌كتیكی، به‌سه‌ر ژیانی كۆمه‌ڵایه‌تی و سیاسیدا.

لێره‌دا «ماركس» له‌ به‌ر ڕۆشنایی په‌ره‌سه‌ندنی مێژوویدا ده‌گاته‌ ئه‌و ده‌ره‌نجامه‌ی، هه‌موو سستمێكی كۆمه‌ڵایه‌تی له‌ ناخی خۆیدا تۆوی فه‌ناوبوون و له‌ناوچونی خۆی هه‌ڵگرتووه‌. له‌ ناو هه‌ر سستمێكی كۆمه‌ڵایه‌تیدا هێزگه‌لی نه‌یار دروست ده‌بن كه‌ دژایه‌تی ده‌كه‌ن و ململانێی له‌گه‌ڵدا ده‌كه‌ن، تا ڕای ده‌ماڵن و له‌ شوێنیدا سستمێكی نوێ دێننه‌ ئارا. له‌ ناو ئه‌م سستمه‌ تازه‌یه‌شدا هێزگه‌لێكی تازه‌ی دیكه‌ سه‌رهه‌ڵده‌ده‌ن كه‌ ده‌كه‌ونه‌ دژایه‌تیكردنی ئه‌و سستمه‌ تازه‌یه‌ تا له‌ ناوی ده‌به‌ن و له‌ جێگه‌یدا سستمێكی نوێ داده‌مه‌زرێنن.

به‌مجۆره‌ مێژوو له‌سه‌ر هێنانه‌ ئاراو خستنه‌ ڕوی سستمی نوێی كۆمه‌ڵایه‌تی به‌رده‌وام ده‌بێت، ئه‌م پرۆسه‌یه‌ش به‌رهه‌می ناكۆكی و ململانێی چینایه‌تی ناو كۆمه‌ڵگه‌یه‌[٣]. لێره‌دا ده‌توانین بڵێین قۆناغێك نییه‌ له‌ قۆناغه‌كانی به‌ره‌و پێشچونی كۆمه‌ڵایه‌تی، ململانێی چینایه‌تی به‌خۆیه‌وه‌ نه‌بینیبێت. ململانێیه‌ك كه‌ له‌ ئه‌نجامی بوونی دوو چینی كۆمه‌ڵایه‌تی جیاواز له‌ توانا و خاوه‌ندارێتیدا دروست ده‌بێت.

به‌ جۆرێك یه‌كه‌میان ده‌وڵه‌مه‌ند و ده‌سه‌ڵاتدار و چه‌وسێنه‌ر ده‌بێت و دووه‌میشیان هه‌ژار و بێده‌سه‌ڵات و چه‌وساوه‌. ئه‌م ململانێیه‌ له‌و كاته‌وه‌ ده‌ستی پێكرد كه‌ سستمی موڵكایه‌تی هاوبه‌ش نه‌ماو سستمی موڵكایه‌تی تاكه‌كه‌سی شوێنی گرته‌وه‌، سستمێك كه‌ له‌سه‌ر چه‌وسانه‌وه‌ی مرۆڤ له‌لایه‌ن مرۆڤه‌وه‌ دامه‌زراوه‌. هه‌ر به‌ فیعلی له‌و كاته‌وه‌ی سستمی موڵكایه‌تی هاوبه‌ش نه‌ماو موڵكایه‌تی تایبه‌ت جێگه‌ی گرته‌وه‌، ئیتر كۆمه‌ڵگه‌كان به‌سه‌ر دوو چیندا دابه‌ش بوون و ململانێی چینایه‌تی له‌ نێوانیاندا ده‌ستی پێكرد. ئه‌م ململانێ چینایه‌تیه‌ش له‌ناو كۆمه‌ڵگه‌دا به‌رده‌وام ده‌بێت تا هه‌ر دوو چینه‌ به‌شه‌ڕهاتووه‌كه‌ له‌ناو ده‌چن و له‌ جێگه‌یاندا گروپێكی نوێ دێته‌ ئارا، ئه‌م گروپه‌ش لای خۆیه‌وه‌ به‌سه‌ر چه‌ند چینێكی تازه‌دا دابه‌ش ده‌بێت و پرۆسه‌كه‌ش به‌مجۆره‌ درێژه‌ی ده‌بێت.

گه‌ر سه‌رنجێكی خێرا له‌ په‌ره‌سه‌ندنی مێژوی كۆمه‌ڵایه‌تی بده‌ین، ده‌بینین له‌ ساته‌وه‌ختی نه‌مانی سستمی موڵكایه‌تی هاوبه‌ش و دروستبونی هه‌ردوو چینی ئازاد و كۆیله‌كان، مرۆڤایه‌تی له‌ ململانێ و

کێشـــەیەکی بەردەوام و تولانیدایە. ئەم ململانێیەش بەردەوام بوو تا سستمی فیودالّی جێگەی گرتەوە، ئەو سســـتمەی کە ململانێی چینایەتی لە نێوان دەرەبەگەکان و جوتیاراندا بوو. پاشـــان کە سســـتمی فیودالّی نەماو سستمی سەرمایەداری هاتە ئارا، ئیدی کۆمەڵگە بە ئاشکرا بەسەر دوو چینی ڕکابەر و دژ بە یەکدا دابەش بوو، بە جۆرێک ململانێی نێوانیان زۆر بەزەقی خۆی بەیانکرد. ئەم دوو چینە بریتین لە چینی سەرمایەداری و چینی کرێکاران کە یەکەمیان دووەمیان دەچەوسێنێتەوە.

لە درێژەی شرۆڤەکاری «مارکس» بۆ ململانێی چینایەتی، باس لەوە دەکات کە سستمی سەرمایەداری هەرەس دێنێ تا سستمی کۆمۆنستی شوێنی بگرێتەوە، لە سایەی ئەم سستمەشدا یەکسانی بەر قەرار دەبێت و ململانێی چینایەتیش کۆتایی دێت و نامێنێت، چونکە لەم سســـتمی کۆمۆنســـتیدا جیاوازی چینایەتـــی نامێنێت و ئـــەوەی دەمێنێتەوە تەنها یەک چینە کە کار دەکات لـــە پێناو خزمەتکردن بە تەواوی کۆمەڵگە.

لەم سەروبەندەدا و لە کۆمەڵگەی کۆمۆنستیدا دەوڵەت پاساوی مانەوەی نامێنێت، لەبەرئەوەی بونی دەرگیـــری جیاوازی و ململانێی چینایەتیەوەهەر کاتێکیش ئەم ململانێ و ناکۆکیە کۆتایی هات، دەوڵەت پاســـاوی مانەوەی نامێنێت وەک دەسەلاَتێکی سیاسی زۆرە ملێ بە دەست چینێکەوە بۆ سەرکوتکردن و چەوســـانەوەی چینێکی تر. بۆ گەیشـــتن بەو سســـتمی کۆمۆنیزمە بە بۆچونی «مارکس»، پێویستە شۆڕشێکی پرۆلیتاری بەرپا بکرێت، تا دەسەلاَتی سیاسی لە چینی سەرمایەداری بسەندرێتەوەو بدرێتە دەســـت چینی کرێکار، بۆ ئەوەی ئەم چینە بتوانێت بە هۆی ئەوەوە زەبر لە موڵکایەتی ســـەرمایەداری تاکە کەسی بدات و بیگۆڕێت بۆ موڵکایەتی دەستەجەمعی.

## ٣- *تیۆریای زێدەبایی و کەڵەکەبونی سەرمایە:*

ســـەروەختێک «مارکس» جەختی لە حەتمیەتی لەناوچونی سستمی سەرمایەداری دەکردەوە، پشت ئەســـتوربوو بە لێکۆڵینەوە ئابوریەکانی کە ناکۆکیەکانی ناو سســـتمی سەرمایەداری ئاشکرا کرد، ئەو ناکۆکیانەی سستمەکەیان بە ناچاری بەرەو لەناوچون دەبرد.

سستمی سەرمایەداری کە لەسەر دار و پەردوی سستمی فیودالّی هاتبووە ئارا، لە دوای ئەو دۆزینەوە زانستیە نوێیانەی زەمینەیان خۆشکرد بۆ بەرفراوانبونی بازاڕ و هەروەها ئامێر و ئامڕازە تەکنۆلۆژیەکانیش شـــوێنی ئامرازە ســـادە و کارەکانی بەرهەم هێنانیان گرتەوە. ئەمە بواری بە دروستبونی چینێکی تازە لە ســـەرمایەدارە پیشەسازیەکاندا کە توانیان بەهۆی پێشکەوتنی هونەری بەرهەم هێنانەوە، کۆنترۆڵی بونیادی ئابوری و سیاسی کۆمەڵگە بکەن.

کەواتە بەرەو پێشـــچونی هونەری بەرهەم هێنان و ئامرازەکانی گواســـتنەوەو گەیاندن، بوونەمایەی گۆرانی چینی ســـەرمایەداری بۆرژوازی و توانای ئەوەی پێبەخشـــی تا چینی کرێکاران بچەوسێنێتەوە. دروستبونی ســـەرمایەداری و چەوساندنەوەی چینی کرێکاران، بە بۆچونی «مارکس» مەیسەر نەدەبوو گەر ســـەرمایەگوزاری لای چینی وردە بۆرژوا کە لە پیشـــەوەرە بچوکەکان پێکهاتبوو، کەڵەکە نەبوایە و چینی بەرفراوانی کرێکارانیشـــی لێبێبەش نەکرایە. دروســـتبونی ئەم چینە ســـەروەختێک دەســـتی پێکرد کە پیشـــەوەرە گچکەکان، پرکێشـــی زیاتریانکرد لە پشت بەســـتن بە کرێکاران لە کارەکانیاندا، ئەویش لە پای دەرکەوتنی سســـتمی دابەشـــکردنی کار، تا لە قۆناغێکی دیاریکراودا گەیشـــتنە ئەوەی واز لە ئیشـــی دەســـت بێنن و خۆیان تەرخانکەن بۆ چاودێریکردنی کرێکاران و مسۆگەر کردنی بازاڕ، لە

پێناو کڕینی کەرەستەی خاو و دۆزینەوەی بازاڕ بۆ ساخکردنەوەی بەرهەمەکانیان. بۆ ڕونکردنەوەی چۆنیەتی کەڵەکەبونی سەرمایە لای چینی بۆرژوا، «مارکس» لە تیۆریا ئابوریەکەی «ڕیکاردۆ»ەوە دەست پێدەکات کە بە تیۆریای بەهای کار ناسراوە. ئەم تیۆریایەش دەڵێت: (دیاریکردنی بەهای هەر شمەکێک بە ڕێژەی ئەو ڕەنجی کارە دەپێورێت کە لە پێناو بەرهەم هێنانیدا بە خەرج دەدرێت). لێرەوە «ڕیکاردۆ» پێیوایە هەر شمەکێکی بەرهەم هێنراو بریتیە لە بەرهەمی بەخەرجدانی ڕەنجی کارێک بۆ بەرهەم هێنانی ئەو شمەکە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، هەروەها بەرهەمی کارێکی ناڕاستەوخۆی ئامێر و ئامراز و کەرەستەی خاوە.

بە پشت بەستن بەم تیۆریایە، «مارکس» دەستی پێکرد و لەم سەروبەندەشدا دەڵێت: (نرخی هەر شمەکێک تەنها بە ژمارەی ئەو کاتژمێری کارکردنە دیاری دەکرێت کە لە پێناو بەرهەم هێنانیدا بە خەرج دراوە و کاریش لە سستمی سەرمایەداریدا شمەکێکە وەک شمەکەکانی دی، هەر بۆیە نرخ و بەهای بە پێی تیۆریای گشتی دیاریکردنی نرخ، واتە بە پێی تیۆریای خواست و خستنە ڕوو دیاری دەکرێت. کرێکار لەگەڵ خاوەن پرۆژەیەکدا ڕێکدەکەوێت تا شمەکەکەی، واتە هێزی کاری خۆی پێبفرۆشێت، نرخی ئەم شمەکەش واتە هێزی کار بەپێی ئەو ژمارەی سەعاتانە دیاری دەکرێت کە پێویستە بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستیەکانی ئەو کرێکارە لە خواردن و پۆشاک و شوێنی نیشتەجێبوون، واتە پێویستە بۆ تازەکردنەوەی ئەو هێز و توانایەی کرێکارەکە لە ڕاپەڕاندنی کارەکەیدا بە خەرجی داوە. بەم پێیە هەر قازانجێک خاوەن کار بیکات، لە ڕاستیدا لە نرخی هێزی کاری ئەو کرێکارەی لاداوە کە کارەکەی بۆ کردووە، واتە کرێیەکی کەمتر لە هەقی خۆی پێداوە یان زیاد لە سەعاتی دیاریکراو کاری پێکردووە. بەمجۆرە ئەو قازانجەی خاوەن کار دەیکات، بەرهەمی جیاوازی نێوان کرێی ڕاستەقینەی کرێکارەکەیە لەگەڵ نرخی ڕاستەقینەی هێزی ئەو کارەی لە ئیشێکدا بە خەرجی داوەو ئەم جیاوازیەشە کە پێی دەڵێن زێدەبایی. ئەمەش مانای وایە هەر قازانجێک خاوەن کار بیکات، لە ڕاستیدا جگە لەو دزیەی ئەوان لە هەقدەستی کرێکارانی دەکەن شتێکی تر نییە، لە کاتێکدا دەبوو ئەو قازانجە بدرێتە ئەو کرێکارانەی بەشداربوون لە بەرهەمهێنانی شمەکێکدا کە ئەو قازانجەی مسۆگەر کردووە).

لەگەڵ گەشەکردنی زیاتری سستمی سەرمایەداریدا، سەرمایەداران هەموو ڕێگایەک دەگرنە بەر بۆ بەدەستهێنانی سود و قازانج، واتە بۆ زێدەبایی. بەو پێیەشی کێبڕکێی ئابوری ئازاد بەشێکە لە سروشتی سستمی سەرمایەداری، ئەوا خاوەن کار و پرۆژەکان وا دەکەن شمەکەکانیان بە کەمتر لە نرخی ئەوانی تر بفرۆشن. بۆ ئەوەی ئەم کارەش بکەن خاوەن کارەکان پەنا دەبەنە بەر ئەوەی بەرهەم هێنانیان فراوان بکەن، ئەمەش پێویست بەوە دەکات سەرمایەگوزاری زیاتر لە پرۆژەکانیاندا بکەن، تا تێچونی بەرهەمەکانیان کەمتر بێت. چاکترین ڕێگایەکیش بۆ ئەمە زیادکردنی ئامێر و ئامرازەکانی بەرهەم هێنانە. ئەم ڕەوتەش بۆ قازانجکردن و کەڵەکەکردنی سەرمایە، «مارکس» ناوی دەنێت کەڵەکەبوونی سەرمایە و بە یەکێک لە سەرەکیترین خەسڵەتەکانی سستمی سەرمایەداری دادەنرێت.

هەر دەرهەق بەم مەسەلەیە «مارکس» پێیوایە سەرەنجام کەڵەکەبونی سەرمایە دەکەوێتە دەست ژمارەیەکی کەم و دیاری کراوی سەرمایەداران. ئەو پرۆژەگەورانەی لەسەر کەڵەکەبونی سەرمایە دروست بوون، سود لە بەرهەم هێنانێکی زۆر و گەورەدەبینن، ئەمەش یارمەتیان دەدات تا تێچونی بەرهەمکانیان کەم بکەنەوەو کەمبونەوەی تێچونی بەرهەمەکانیشیان ڕێگەیان پێدەدات، بۆ ئەوەی شمەکانیان بە کەمتر لە نرخی پرۆژە بچوکەکان بفرۆشن. بەمجۆرەو بە تێپەڕبونی کات پرۆژە گەورەکان دەتوانن پرۆژە بچوکەکان ڕابماڵن و لە هەمان کاتدا دەتوانن سەرمایەی زیاتر لای خۆیان کەڵەکە بکەن. واتە

ڕەوتی سستمی سەرمایەداری خزمەت بە خاوەنی پرۆژە گەورەکان دەکات و ئەمەش یارمەتیان دەدات بۆ ئەوەی پرۆژە بچوکەکان لەناوبەرن، کارێک کە دەبێتە مایەی کەمبونەوەی ژمارەی ئەوانەی سەرمایەیان لە دەستدایە و ئەمەش وا دەکات بەرهەم هێنەرە بچوکەکان ببنە کرێکار و لەسەر فرۆشتنی هێزی کاری خۆیان بژین.

لێرەوە ژمارەی ئەندامانی چینی کرێکاران قەبە دەبێت، وەک ئەوەی «مارکس» ئەم پرۆسەیە بە یاسای گۆڕانی زۆرینە بۆ کرێکار یان بە یاسای کەڵەکەبونی سەرمایە ناوزەد دەکات. ئەم قەبەبونەی چینی کرێکاران ڕەنگە ببێتە مایەی دروستبونی کێشەی بێکاری و ململانێ و کێبرکێی کرێکاران لە پێناو دۆزینەوەی هەلی کاردا زیاتر بکات.

## ٤- حەتمیەتی شۆڕش و هەرەسهێنانی سستمی سەرمایەداری:

لەگەڵ سەرهەڵدان و هاتنە ئارای سستمی سەرمایەداریدا، گەشەکردنی ماتریالیزمیانەی مێژوو لاپەڕەی سستمی فیوداڵی دەپێچێتەوەو قۆناغێکی تازە دەست پێدەکات کە پەیوەندی بەرهەم هێنانی نوێ دێنێتە ئارا، بە جۆرێک لەگەڵ پێداویستیەکانی سستمی کۆمەڵایەتی تازەدا بگونجێت. بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کە ئەم پەرەسەندن و بەرەو پێشچونە لەم ئاستەدا ناوەستێت، بە پێچەوانەوە، بگرە بە پێی چەمکی ماتریالیزمی مێژویی، پەرەسەندنی مێژویی سوڕی خۆی لەناو سستمی سەرمایەداری نوێدا تەواو دەکات، ئەم سستمە نوێیەش لە هەناوی خۆیدا هۆکارەکانی لەناوچونی هەڵدەگرێت. ئەم هۆکارانەش ئەو هێزە کۆمەڵایەتیانەن کە بەرهەمی سستمی سەرمایەدارین و بەشێکی ئۆرگانیکین بۆ گەشەکردن و بەرەو پێشچونی.

ئەم هێزە کۆمەڵایەتیانە هەر ئەو چینەی کرێکارانن کە لەلایەن خاوەن کارەکانی سستمی سەرمایەداریەوە دەچەوسێنرێنەوەو هەر ئەویشە کە بەرەنگاری چینی بۆرژوازی باڵادەست دەبێتەوەو لەناوی دەبات. بەڵام چۆن؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە «مارکس» پێیوایە سستمی سەرمایەداری تا چەند بە ئاراستەی زیادکردنی هێزی چینی بۆرژوا پەرەبستێنێ و سەرمایەش لای چەند کەسێکی دیاریکراو کەڵەکەبێت، ئەوەندەش هێزی چینی کرێکار زیاد دەکات و یەکیەتی نێوان ئەندامانی پتەوتر دەبێت و هۆشیاری چینایەتیشیان زیاد دەکات. ئەم هۆشیاریەش پاڵی پێوە دەنێت تا خۆی ڕێکبخات بۆ بەرگریکردن لە بەرژەوەندیە چینایەتیەکانی. لە میانەی پرۆسەی بەرگریکردن لە بەرژەوەندیەکانی، ململانێی چینایەتی لە نێوان ئەووچینی بۆرژوازیدا تاودەسێنێ، تا شۆڕشی کرێکاری بەرپادەبێت و سستمی سەرمایەداری ڕادەماڵێ. یاسای زێدەبایی ئەو یاسایەی هانی چەوساندنەوەی چینی کرێکار دەدات، لەگەڵ یاسای کەڵەکەبونی سەرمایەو کۆبونەوەی لە دەستی کەسانێکی بە ژمارە کەمی کۆمەڵگەدا، زۆربەی زۆری خەڵک والێدەکات تا ببنە کرێکار و لە ڕێی فرۆشتنی هێزی کاری خۆیانەوە بژێوی ژیانیان دابین بکەن، بە تایبەت دوای ئەوەی چینی ناوەڕاست ڕادەماڵێت و بەرهەم هێن و بازرگانە بچوکەکان لەناو دەبات و هێدی هێدی دەیانکاتە کرێکار.

ئەم گۆڕانکاریە خستنە ڕوی دەستی کار لە بازاڕی کاردا زیاتر دەکات، لەگەڵیشیدا کێشەی بێکاری و دابەزینی هەقدەست زیاد دەکات. شۆڕشی پیشەسازی بووە مایەی ئەوەی ئامێر و ئامرازەکانی تەکنۆلۆژیا شوێنی کرێکاران بگرنەوە، هەروەها کەڵەکەبونی سەرمایە وایکرد بەکارهێنانی ئامرازە تەکنۆلۆژیە مۆدێرن و ئاڵۆزەکان زیاد بکات. کۆبونەوەی سەرمایەش لە دەستی ژمارەیەکی کەمی سەرمایەداران و پاکتاوکردنی پرۆژە ئابوریە بچوکەکان، کێشەی بێکاریان زیاتر و زۆرتر کرد. لێرەوە

بـــازاڕی کار ژمارەیەکـــی زۆر لە بێکاران بەخۆیەوە دەبینێت، ئەو کرێـــکارە بێکارانەی وەک «مارکس» ناوی دەبردن دەبن بە لەشـــکری یەدەگی پیشەســـازی. ئەم لەشکرە یەدەگە دەبێتە چەکێک بە دەست سەرمایەدارانەوە بۆ سەپاندنی کرێ و هەقدەستی زۆرکەم، کە بەشی پێداویستیەکانی ژیان ناکات. هەر هەوڵێکیش لەلایەن کرێکارانەوە بدرێت بە مەبەستی زیادکردنی کرێکانیان، سەرمایەداران بەدەرکردنیان لە کارەکانیان و دانانی ئەو کرێکارانەی ســـەر بە لەشـــکری پیشەســـازی یەدەگن لە جێگەیان وەڵامیان دەدەنەوە. ئەو کرێکارە تازانە ڕازی دەبن بەوەی شـــوێنی هاوڕێی دەرکراوەکانیان بگرنەوە لەســـەر کارو بەهەقدەســـتێکی کەمتریش ڕازی دەبن، لەبەرئەوەی لە مردن قوتاریان دەکات. بەڵام ئەم چەوســـاندنەوە بەردەوامـــەی چینی کرێکاران، دەبێتە مایەی کەڵەکەبونی ســـەرمایە لەگـــەڵ ئەوەی وا دەکات کرێکاران بە واقعی ناهەمواری ژیانی خۆیان هۆشـــیاربن، ئەمەش وەک «مارکس» دەڵێت: (وا دەکات هۆشـــیاری چینایەتیان لا دروست بێت).

ئەم هۆشیاری چینایەتیە وا دەکات کرێکاران تێبگەن کە پەرتبون و یەکنەگرتویی ئەوان، چ خزمەتێک بەسەرمایەداران دەکات و وایان لێدەکات بە ئاگابن لەوەی کە سۆراخ و گەڕانیان بە دوای بژێوی ڕۆژانەیاندا، وا دەکات ببنە نێچیرێکی باش بۆ چەوساندنەوە. کەواتە ئەو هۆشیاری چینایەتیە وایان لێدەکات تێبگەن کە تەنها ڕێگایەک لەبەردەمیاندا بێت بۆ بەرەنگاربونەوەی هێزی ســـەرمایە، یەکگرتوییانە. لێرەوە پەنا دەبەنە بەرئەوەی خۆیان لەناو سەندیکا شۆڕشگێڕیەکاندا ڕێکبخەن، بۆ بەدەستهێنانی دەسکەوتی یەک لە دوایەک، ئەمەش دەیانکاتە هێزێکی ڕێکخراو بۆ کارکردن و لەبەرامبەر ئەمەشدا سەرمایە ناتوانێت ئەو لەشکرە پیشەسازیە یەدەگە بەکاربهێنێت، بۆ بەدەستهێنان و زیادکردنی بەردەوامی قازانج و زێدەبایی. لـــە ڕێی ئەزمـــون و تاقیکردنەوەوە ئەم ڕێکخـــراوە نێو دەوڵەتیە فێر دەبێـــت و کاتێکیش ڕێبەرایەتی زۆرینەی میللەت دەکات، دەزانێت چۆن خۆی ڕێک دەخات و چۆن ئەو هەستکردنە بە ناهەقی دەگۆڕێت بۆ شۆڕش کردن، شۆڕشێک کە سەرمایەداری ڕادەماڵێت و چینی زۆرداری بۆرژوازیش لەناو دەبات و لە شوێنی ئەوانیش دەسەڵاتی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا بەرقەرار دەکات.

«مارکس» پێیوایە ئەم ڕێکخراوە ئەنتەرناســـیۆنالیە، بە هۆی ئەو پەرەســـەندن و پێشـــکەوتنەوە دروســـت دەبێت کە بە ســـەر خودی سستمی سەرمایەداریدا دێت. ئەم پەرەسەندنەشە کاری تاکەکەسی (کە لە ڕابردودا باو بوو) دەگۆڕێت بۆ کاری دەســـتەجەمعی هاوبەش، ئەم گۆڕانە دۆخێکی کۆمەڵایەتی بـــە کرێکاران دەبەخشـــێت و وایان لێـــدەکات، بەرژەوەنـــدی تایبەتی خۆیـــان و بەرژەوەندی کۆمەڵگە پێکەوە بگونجێنن. ئەم بەرەو پێشـــچونە لە گۆڕینی کاری تاکە کەسی بۆ کاری دەستەجەمعی، لەگەڵ ئەوەی وا دەکات لە نێوان بەرژەوەندی تایبەتی و بەرژەوەندی گشـــتیدا هاوسەنگیەک دروست بکەن، بە بۆچونی «مارکس» دەشـــبێتە مایەی ئەوەی کرێکاران کار بۆ ئەوە بکەن بە شێوەیەکی دەستە جەمعی سەرپەرشـــتی پرۆســـەی بەرهەم هێنان بکەن، لەبەرئەوەی لە حەقیقەتی ئەو سســـتمی بەرهەم هێنانە باڵادەستە تێدەگەن کە چ زوڵم و ستەمێک دەرهەق بە زۆرینەی خەڵک دەکات. سەروەختێک پرۆلیتاریا دەســـت بە شۆڕش دەکات و دەسەڵاتی سیاسی دەگرێتە دەست، ئەوا تەواوی موڵک و ماڵاتەکان دەکاتە موڵکـــی دەوڵەت و دەیانخاتە خزمەتی هەموانەوە، چونکە لە ڕاســـتیدا بزواتـــی کرێکاران نوێنەرایەتی زۆرینەی کۆمەڵگە دەکات. بەم پێیەش لەگەڵ تەواوی بزاوت و سستمەکانی پێشوتردا جیاواز دەبێت کە تەنها نوێنەرایەتی کەمینەیان دەکرد و بۆبەرژەوەندی ئەو کەمینەیەش حوکمڕانیان دەکرد، بەڵام بزاوتی کرێکاران و دەســـەڵاتە دیکتاتۆریەکەی، بزاوتێکی مێژویـــی و میللیە و لە پێناو بەرژەوەندی زۆرینەدا حوکم دەکات. بۆ یەکەم جاریش لە مێژودا ئەم دەسەڵاتە نوێنەرایەتی تەواوی میللەت دەکات[٤].

"مارکس» کە داوای دەکرد پرۆسەی بەرهەمهێنان بەشێوەیەیکی دەستەجەمعی سەرپەرشتی بکرێت، ئەوەی ڕەتدەکردەوە ئەم پرۆسەیە بە شێوەیەکی شێلگیرانە بگاتە ئەنجام، بەڵکو بڕاوی بەوە هەبوو کە ململانێی چینایەتی خەسڵەتێکی توندوتیژانەی هەیە. لەبەر ئەوە کۆتایی ململانێکە خوێناوی دەبێت و چارەسەری یەکجاریش کاتێک دەبێت کە ناکۆکیەکان بگەنە ئەوپەڕی. سروشتی سستمی سەرمایەداری ئەوە دەخوازێت کە لە گەشــەو بەرەو پێشــچونێکی بەردەوامدا بێت، لێرەشـــەوە لە هەوڵی بەردەوامی پاوانکردنی دەســـەڵاتی سیاسیدا دەبێت[٥]. بەو پێیەی سستم و دەسەڵاتی سەرمایەداری بۆتە فۆرمێکی جیهانی، ئەوا پێویستە بزوتنەوەی کرێکارانیش خۆی لە چوارچێوەی فۆرمێکی نێودەوڵەتیدا ڕێکبخات، تـــا بتوانێت بەرەنگاری ســـەرمایەداری بێتەوە. لێرەوە «مارکس» ڕێکخـــراوە نێو دەوڵەتیەکەی کرد بە یەکەم ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی کرێکاران.

«مارکـــس» کە بڕوای بە توندوتیژی هەبوو، لەبەر ئەوە بوو دەیزانی ســـەرمایەداری وا بە ئاســـانی لـــە بەردەم هەڕەشـــەکانی ئەو ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەدا چۆک دانـــادات و هەرچی ئامرازە لە دژی هێزی کار بەکاری دێنێت. «مارکس» پێیوابوو گرنگترین چەکێک کە لەبەردەســـت سەرمایەداریدا بێت چەکی نەتەوایەتیە، ئەم چەکەش وەک ئامرازێک بەکاردەهێنرێت بۆ ڕێگرتن لە یەکگرتنی کرێکارانی جیهان لە ڕێکخراوێکی جیهانی سەرتاســـەریدا، ئەمەش بەو مەبەستە دەکات تا کرێکاران پەرت پەرت بن و بەسەر چەنـــد یەکەیەکی ناسیۆنالســـتی ناکۆک و دژبەیەک دابەش ببن. هـــاوارە بەناوبانگەکەی «مارکس»یش (کرێکارانی جیهان یەکگرن) لێرەوە دێت.

لێرەدا دەکرێت بڵێین ســـەرهەڵدانی ئایدیا سۆسیالســـتیەکان بە گشتی و مارکسیزم بە تایبەتی لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا، هیچ نەبوو جگە لە پەرچەکردارێکی حەتمی بەرامبەر بەو شتانەی شۆڕشی پیشەسازی لەگەڵ خۆیدا هێنانی، وەک: (ناکۆکی و ململانێی چینایەتی و کۆمەڵایەتی، لە هەناوی ئەو کۆمەڵگە ئەوروپیانەی بەرەو ئاقاری فەردگەرایی ڕێیان دەکرد).

لەکاتێکدا ئایدیا سوســـیالیزمیەکانی بەر لە «مارکس» بە میســـالیەت و هەســـتی هیومانیستیانە ناســـرابون، بێئەوەی خۆیان وەک ڕێبازێک نیشـــان بدەن کە توانای چارەســـەرکردن و ڕاســـتکردنەوەی واقیعیان هەبێت، ئەوا مارکسیزم بەو دیدگا هەمە لایەنەی هەیبوو بۆ سەرجەم لایەنەکانی ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاســـی، بە پشـــت بەســـتن بە ماتریالیزمی دیالەکتیکی، توانـــی خۆی وەک ڕێباز و ئایدیۆلۆژیایەکی کۆنکرێتی نیشان بدات کە بەشێوەیەکی کارا توانای مامەڵەکردنی لەگەڵ واقیعدا هەیە. لێرەوە «مارکس» زۆر دەترسا لەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان بیرو بۆچونەکانی فۆرمی فەلسەفە وەرگرن، ئەم ترسەشـــی لەسەر ئەم مەســـەلەیە پەیوەندی بە تێڕوانینی ئەوەوە هەیە بۆ ئەو فەلسەفانەی لە مێژودا هاتبونە ئارا، کەبە فەلســـەفەگەلێکی میسالی دەزانین و پێیوابوو ڕێ لە فیکر دەگرن تا پەی بە واقیع بەرێت، هاوکات سەرقاڵی شت گەلێکن کە دورن لە مرۆڤ و بارودۆخی ژیانی ئینسانەکان.

"مارکس» پێیوابوو ڕۆڵی فەلسەفەی ئەبستراکت کۆتایی هات و لێرە بە دواوە ئەوەی لە فەلسەفەداوا دەکرێت بەر لە هەر شـــت، پەیبردنە بە واقیع و پاشـــان دوای ئەم پەی پێبردنە هەوڵدانە بۆ گۆڕینی. بەمجـــۆرە «مارکس» هەر لە ناو چواردیواری فیکردا نەمایـــەوە، بەڵکو پەنای بۆ چەکی عەمەلیش برد کـــە بریتی بوو لە دامەزراندنـــی ڕێکخراوێکی نێو دەوڵەتی پرۆلیتاری، بۆ ئـــەوەی کار بۆ بەدیهێنانی بیروباوەڕە کۆمۆنیستانەکەی بکات.

شـــایەنی باسە «مارکس» بەشداری زۆربەی زۆری ئەو شۆڕشانەی ئەوروپای کرد کە لە سەردەمانی خۆیدا بەرپابون، بە مەبەستی گرتنە دەستی دەسەڵاتی سیاسی، بەڵام بێئاکام بوون و سەرکەوتوونەبون.

لەگەڵ ئەوەشدا ئایدیا و بانگەشەکانی بۆ کاری ڕێکخراوەیی، بوون بە سەرچاوەی تەواوی بزاوتە ڕادیکالی و کۆمەڵایەتیەکانی زۆربەی گەلانی دنیا، تا دروســـتبونی یەکەم کۆمەڵگەی سوسیالســـتی لە یەکیەتی سۆڤیەتی جاراندا بە ڕابەرایەتی «لینین». دوای ئەوەو لە ماوەیەکی زۆر کەمدا پارتە کۆمۆنستیەکان بە وڵاتی دنیادا بڵاو بوونەوەو ڕۆڵێکی گەورەیان گێڕا، لە بەرەو پێشبردنی گەلاندا و لەم پرۆسەیەشدا وزەو تواناییان لە هێز و ئەزمونی پارتی کۆمۆنستی سۆڤیەتیەوە وەردەگرت.

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

*دەربارەی ژیانی کارل مارکس، بڕوانە: ج.د.ه. کول: رواد الفكر الاشتراكي – ترجمة: منير بعلبكي – الفصل الثالث و العشرون – دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٧٨.

١-موريس كورتفورت: مدخل الى المادية الجدلية- ترجمة: محمد مســتجير مصطفى – دار الفارابي، بيروت، ١٩٨٠ و شروح في المادية التاريخية – دار ابن خلدون، بيروت، ١٩٧٥.

٢-شروح في المادية التاريخية – دار ابن خلدون، بيروت، ١٩٧٥.

٣-پەرەگرافە ســـەرەتاییەکانی (مانیفێســـت) بەمجۆرە دەســـت پێدەکات: (مێژوی تەواوی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی تا ئەمـــڕۆ، بریتـــی بووە لە مێژوی ململانێـــی چینایەتی. ئازاد و کۆیلـــە، خانەدان و عەوام، ســـەردار و ئاغا و کۆیلە، بە کورتیەکەی چەوســـێنەر و چەوســـاوەکان، بەردەوام لە ململانێ و ناکۆکی و شەڕێکی بەردەوامدا بوون، جارێک بە نهێنی و جارێک بە ئاشکرا، شەڕێک هەمیشە یان بە کۆدێتایەکی شۆڕشگێڕانە کۆتایی هاتووە کە تەواوی کۆمەڵگای گرتۆتەوە یاخود بە تێکشکانی هەردوو چینە بەشەڕ هاتووەکە تەواوبووە).

٤-جورج سباين: تطور الفكر السياسي، الكتاب الخامس – ترجمه: د. راشد البراوي، ص ١٠٦.

5-MARCEL PRELOT ET GEORGES LESCURYER- IBID – P.P. 623، 624.

## سەرچاوە:

الدكتور مهدى محفوظ: اتجاهات الفكر السياســي فى العصر الحديث – المؤسســة الجامعية للدراســات و النشــر و التوزيع، بيروت- الطبعة الثالثة، ٢٠٠٧.

# دابڕانی ئەپستمۆلۆژی لە خۆرئاوا

هاشم ساڵح
لە عەرەبییەوە: سەردەم

### دەربارەی چەمکی دابڕانی ئەپســتمۆلۆژی لە فیکر و لە ژیاندا:

چەند ساڵێک لەمەوبەر و لە ماوەی خەریک بونم بە فیکری «میشێل فۆکۆ»وە، چەمکی دابڕان لە کایەی زانست و مەعریفە و لە کایەکانی دیکەشدا، سەرنجی ڕاکێشام و سەرســامی کردم. ئەو شتەشی زیاتر لای «فۆکۆ» سەرنجی ڕاکێشام (بە تایبەت لە وشــەکان و شتەکاندا)[1]، ئەوە بوو هیچ شرۆڤە و لێکدانەوەیەکی بۆ ئەو چەمکە نەکردبــوو. واتە بە بڕوای ئەو دابڕان ڕوداوێکە لە پڕێکدا و بە ڕێکەوت و لە ناکاودا ڕودەدات. بەمجۆرە «فۆکۆ» مێژوی فیکری لە خۆرئاوا لە شــێوەی دابڕانی کتوپڕو لە ناکاو وێنا دەکرد، دابڕانێک کە بەبێ هۆ و بەبێ هیچ زەمینەســازیەک ڕودەدات. لەم ڕووەوە بیریارگەلێک ڕەخنەیان ئاڕاستەی کتێبەکەی کرد و بە خاڵی لاوازی ئەو شاکارە گەورەیەی ئەویان دایە قەڵەم. «فۆکۆ»ش بۆ وەڵامدانەوەی ئەو ڕەخنانە و بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە، لە کتێبی داهاتویدا (ئارکیۆلۆژیای مەعریفە)[2]،هەوڵێکی زۆری بەخەرجداو کەوتە هەوڵی ڕاســتکردنەوەی چەمکی ئەپســتیم یان سســتمی بیر، لەم پێناوەشــدا دەستیکرد بە دروستکردنی پردی پەیوەندی لە نێوان سستمی بیرکردنەوەی پاش و پێشــودا، بە جۆرێک کە دابڕان نەبێتە پرۆسەیەکی هەرەمەکی لە ناکاو و بێ هۆ و بێ هیچ پێشەکیەک ڕوبدات. شایەنی باسە بیریاری ئەمریکایی «تۆماس کوهن»، بەر لە «فۆکۆ» کتێبی (ســتراکتۆری شۆڕشە زانستیەکان)[3]ی نوسی و تیایدا باس لە شتگەلێک دەکات، هاوشێوەی ئەوانەی «فۆکۆ» لە (وشەکان

و شتەکان)دا تاوتوێی کردبوون. «کوهن» لەو کتێبەدا تێرمی پارادایم دێنێتە ئارا کە تاڕادەیەکی زۆر بە چەمکی ئەپستیم دەچێت لای «فۆکۆ». پارادایم بە کورتیەکەی، بریتیە لەو تیۆریا زانستیەی لە ژینگەیەک و لە قۆناغێکی دیاریکراودا باڵا دەستە، بەڵام ئەو پارادایمە پاش ماوەیەک لەبەریەک هەڵدەوەشێت و دەپوکێتەوە، دوای ئەوەی چەند کۆسپێک دێتە ڕێگای. لێرەوە قەیرانێک دروست دەبێت کە دواجار دەبێتە مایەی داڕمانی پارادایمی پێشوو، لەگەڵ هاتنە ئارای پارادیمێکی نوێ کە دەبێتە ئەلتەرناتیڤی ئەوی دیکە..

کەواتە لێکچون لەگەڵ تیۆریاکەی «فۆکۆ»دا ئاشکرایە و تەنانەت هەندێک پێیان وایە، لە ڕووی ئەپستمۆلۆژیەوە «فۆکۆ» لە ژێر کاریگەری «تۆماس کوهن»دا بووە. زۆر جار ئەو دوو بیریارە لە ڕیزی (ئەپستمۆلۆژیستە نائەقڵانیەکان)دا پۆلێن دەکرێن. ئەمەش مانای وایە کە ئەپستمۆلۆژیایەک هەیە ئەقڵانیە و یەکێکی دیکەش نا ئەقڵانیە. بەو پێیەی «فۆکۆ» لە ڕووی فەلسەفیەوە لە ژێر کاریگەری «نیچە»دا بووە، بۆیە شتێکی ئاساییە تۆمەتی نائەقڵانیەتی بدرێتە پاڵ.. لەو بڕوایەدام «جیڵ گاستۆن گرانجێ»ش لەگەڵ ئەم بۆچونەدایە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە ماتماتیک ناسێکی مەزنی وەک «ڕینیە تۆم» کە کەس گومان لە ئەقڵانیەتی ناکات، (تیۆریای کارەسات) لەگەڵ خۆیدا دێنێت کە پێناچێت لە ڕوی فەلسەفیەوە، زۆر لە تیۆریایەکەی «تۆماس کوهن»ەوە دوور بێت. بگرە دوو دڵ نیە لەوەش سەرسامی خۆی بە چەمکی (پارادایم) پیشان بدات، سەرەڕای ڕەخنە و سەرنجەکانیشی لەسەری.

ئەمە بۆ خۆی قەیرانێک بۆ ئەوانە دروست دەکات کە لەسەر ئاقاری (ئەپستمۆلۆژیای ئەقڵانی) ماڵن. ئەمەش زۆر بە ڕونی بە ژمارە دووی گۆڤارەکەی «گرانجێ» (چاخی زانست)[٤] وە دیارە و تەواوی ژمارەکەش بۆ ئەپستمۆلۆژیا تەرخانکراوە. ئەم ژمارە گرنگەی ئەو گۆڤارە، چەندین وتاری تێدایە کە تایبەتن بە تاوتوێکردنی چەمکی کارەسات لای «ڕینیە تۆم». لێرەوە ئەو وتارانە خۆیان لە قەرەی پرسی ئەقڵانیەت و نائەقڵانیەت دەدەن لە بواری زانستدا (لەمبارەیە دەمەوێت ئاماژە بۆ وتاری — ئەقڵانیەت و پێشکەوتن — بکەم)، هەروەها سەرنج بۆ لای وتارێکی دی ڕادەکێشم کە «گرانجێ» خۆی نوسیویەتی، وەک قسەکردنێک لەسەر کتێبەکەی «ڕینیە تۆم» و ئەمەش دوای کەمێکی دی ئاماژەی پێدەدەم و دەچمەوە سەری. ناونیشانی وتارەکەش ئەمەیە: (گرنگی و سنورەکانی تیۆریای کارەسات). تیایدا «گرانجێ» باس لە چەندین پرس دەکات، لەوانە پرسی دابڕان و چۆنیەتی ڕودانی، وەک ئەوەی ئایا دابڕان کە ڕوودەدات هۆکاری خۆی هەیە یان بێ هۆیە (واتە بەشێوەیەکی ئەقڵانی یان نا ئەقڵانی ڕودەدات).

ئاشکرایە ئەم کێشەیە جێ بایەخی «گرانجێ» و بەشێکی زۆری بیریارانی بواری ئەپستمۆلۆژیای هاوچەرخە، لەبەر ئەوەی پرسی ئەقڵانیەت و نا ئەقڵانیەت پەیوەندی بەو کایەوە هەیە. ئەقڵانیەکان لە هەموو ئەو شتانە سڵ دەکەنەوە کە پەیوەندیان بە (دابڕان و ڕێکەوت و شتی کتوپڕو لە ناکاوەوە) هەبێت، لە بەرامبەر ئەمەشدا هۆگری ئەو حاڵەتانەن کە بۆنی (بەردەوامێتی و پەیوەندی و بەرەو پێشچونی شێلگیرانەو لەسەر خۆی) لێدێت. ئەمانە وا سەیری گۆڕان دەکەن کە بریتیە لە گواستنەوەیەکی هێمن و نەبینراو، لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی دیکە. هەندێک لەوانەی لە ئەقڵانیەتەکەیاندا پڕکێشی دەکەن، خوازیارن گۆڕان هەر ڕوینەدایە! ئەوانە ئاواتەخوازن مێژوو بریتی بوایە لە هێڵێکی ڕاست و ڕەوانی بەردەوام، لە ئەزەلەوە تا هەتا هەتایە کە نە بگۆڕێت و نە لە ڕاستە ڕێگەی خۆشی لا بدات.

«جیڵ گاستۆن گرانجێ» دەربارەی کتێبەکەی «ڕینیە تۆم» کە (کۆمەڵە گفتوگۆیەکە دەربارەی ماتماتیک و زانست و فەلسەفە)، دەڵێت: (گرنگترین خاڵێک کە لە چەندین بابەتی ئەم کتێبەدا بەرچاومان بکەوێت، دەتوانین لەم پرسیارەدا کورتی بکەینەوە، ئەویش ئەوەیە: خەسڵەتی بەرەوپێشچونی

زانست چیە؟).

وەک سەرنج دەدەین «ڕینیە تۆم» چەند جارێک ستایشی تیۆریای (پارادایم) دەکات لای «تۆماس کوهن»، بەڵام خۆشبەختانە لە ڕادیکالیەت و لە پەڕگیری کەم دەکاتەوە، چونکە ئەو باوەڕی بە دابڕانی تەواوەتی نێوان پارادیمەکان نییە، واتە دابڕانێکی سەر لەبەر لە نێوان سستم و تیۆریا زانستیە یەک بە دوایەکەکاندا هەبێت. ئەو باس لەوە دەکات کە دەشێت تیۆریای تازە، بە جۆرێک لە جۆرەکان هەندێ شتی لە تیۆریای پێشوتر لە خۆ گرتبێت، واتە هیچ دابڕانێکی ڕەها لە نێوان کۆن و نوێدا نییە (ل ١٢٥). تەنها نمونەیەکی هەڵاوێردیش لەم مەسەلەیەدا کە باسی دەکات (نمونەی گالیلۆیە)، لە ڕاستیدا ئەمەش تەنها نمونە نییە، لەبەرئەوەی وەکو دەڵێت: (ئەگەر شۆڕشی گالیلۆ توانیبێتی سەر لەبەری ئەو ئیشکالیەتە فەرامۆش بکات کە تیۆریای ئەرستۆیی لەسەر وەستا بوو، ئەوا بە بۆچونی من پەیوەندی بەوەوە هەیە میکانیکی گالیلۆ بریتیە لە پارادایمێک کە شوێنی دنیا بینی ئەرستۆیی گرتۆتەوە، بەشێوەیەکی جیاوازتر لەوەی کە نیوتن شوێنی گالیلۆی گرتەوە، یاخود ئەنشتاین پێی بوو بە ئەلتەرناتیڤی نیوتن). (بڕوانە: چاخی زانست، ژمارەی تایبەت بە ئەپستمۆلۆژیا، ل ٢٤٦).

بەمجۆرە دەبینین «گرانجێ» دان بەیەک دابڕانی مەزن لە مێژوی زانستدا دەنێت، ئەویش ئەو دابڕانەیە کە لە چرکە ساتی «گالیلۆ»دا ڕویداو «دیکارت»یش لە ڕوی فەلسەفیەوە تیۆریزەی بۆ کرد. هەرچی دابڕانەکانی دیکەیە، جگە لە وردە دابڕان لە چوارچێوەی دابڕانە مەزنەکەی زانستی نوێدا، شتێکی دیکە نەبووە. «گرانجێ» لەو دیدارەی لەگەڵیدا ئەنجامم دا، ئەمەی بۆ دوپات کردمەوە. کەواتە ئەو بۆچونەی خۆی نەگۆڕیوەو لێی لانەداوە: هەرچۆنێک بێت، مەبەستم لە تەواوی ئەم وتارە ئەوەیە باس لە گرنگی پرسی دابڕان/ بەردەوامێتی بکەم، نەک تەنها لە مێژوی زانستە سروشتیەکان و ئەپستمۆلۆژیادا، بەڵکو لە کایەی فیکر و زانستە مرۆڤایەتیەکانیشدا. چونکە ئێمە دەمانەوێت بۆ یەکەمین جار لە مێژوی فیکری ئیسلامیدا، باس لە پرسی دابڕانی ئەپستمۆلۆژی یاخود مەعریفی بکەین. دەمانەوێت نیشانی بدەین مرۆڤەکان بە درێژایی سەدان ساڵ وەک خۆیان نامێننەوە، بەڵکو لە ساتەوەختێکدا گۆڕانی تازەیان بەسەردا دێت، گۆڕانێک ناچاریان دەکات بە جۆرێک لە جۆرەکان لە ڕابردویان داببڕێن و فۆرمێکی نوێ بۆ ژیانکردن و بون بێننە ئارا، سەرەڕای ئەو خواستە زۆرەش کە بۆ هەتا هەتایی ئامێزاندنی ڕابردوو لە ئارەدایە. ئەم دابڕانەش وەک ئەوەی هەندێ پێیان وایە، خیانەتکردن و ناپاکی نییە دەرهەق بە ڕابردوو[٥]. ئەوە ڕاستە کە مێژوو هەر مێژووە و چەمکی دابڕانیش بەشێکە لە دیاردە سەرەکیەکانی مێژوو. لێرەوە پێویستە ڕۆژێک بێت فیکری ئیسلامی دان بەو حەقیقەتەدا بنێت. شایەنی باسە ئێستا لەسەر ئاستی واقیع گۆڕانێک لە ئارەدایە، بە تایبەت لە بواری (ئابوری و شارستانی و بەرخۆری مادی و پیشەسازی و تازەکردنەوەی کەرتی کشتوکاڵ و ژێرەو ژورکردنی زەمینەی جیهانی کۆن)، بەڵام تا هەنوکە ئەم مەسەلەیە لەسەر ئاستی فیکری هاوچەرخی ئیسلامی، هیچ تیۆریزە کاریەکی بۆ نەکراوە[٦]. واتە دەکرێت بڵێین زمانی واقیع لە زمانی ڕوناکبیرانی ئێمە زۆر لە پێشترە. تۆ بڵێی ئەوانە کەی بە واقیع ڕابگەن و کەی قسەی لە بارەوە بکەن، باس لە واقیع بکەن نەک خۆیان خەریکی کێشە گەلێکی میتۆلۆژی و وەهمی بکەن کە بونی نییە؟.

زانای بەناوبانگی ماتماتیک «ڕینیە تۆم»، کۆ لەپراکتیزەکردنی (تیۆریای کارەسات) ناکات بەسەر کایەکانی تردا کە لە دەرەوەی زانستە سروشتیەکان و ماتماتیک دان. لەو کتێبەیدا کە باسمانکرد بەتایبەتیش لەونەسکەیدا کە باس لە پەیوەندی ئەپستمۆلۆژیا بە فەلسەفەوە دەکات، دەربارەی تیۆریای پارادایم لای «تۆماس کوهن» دەڵێت: (ئەمە بیرۆکەیەکی تەواو ڕاست و دروستە، چونکە

پارادایم- واتە ئەو تیۆریا زانستیەی لە قۆناغێکدا زاڵ دەبێت-، ماوەیەکی زۆر بەردەوام دەبێت، تەنانەت دوای کاڵبونەوەو لە دەســتدانی ڕاستگۆیی زانستی بونی، ئەویش بەهۆی هۆکارگەلێکی سۆسیۆلۆژیەوە کە لە دەرەوەی کایەی زانستدایە).

پەککەوتنی پارادایم دەگەڕێتەوە بۆ کوێربوونی ئەو توێژەرانەی لە ناویدا کار دەکەن و وەکی «کوهن» دەڵێت: (تەواوی توانای خۆیان لە چارەســەرکردنی شــتی پوچ ووەهمیدا بە خەرج دەن). لەبەرئەوەیە دەتوانین بڵێین پارادیم بەردەوام لە بەردەم مەترسی ڕوداوێکدایە کە لە دەرەوە ڕا دێت، بەبێ ئەوەی ئەو توێژەرانەی لە ناوەوە کار دەکەن ئاگایان لێی بێت یاخود درک بە بونی بکەن.

«ڕینیــە تۆم» ئەم دۆخــە بەوە دەچوێنێت کە لە بواری کۆمەڵگە و سیاســەت و بە تایبەتیش لە ســاتەوەختی شۆڕشــەکاندا ڕودەدات. زۆربەی کات ڕژێمە سیاســیەکان ئارام و دڵنیــان، لە بەرئەوەی سەرکردەکانیان بێئاگان لەوەی لە دەرەوەی بازنەی حوکمڕانیاندا چی دەگوزەرێت و لە هەناوی کۆمەڵگەدا چ جوڵە و بزاوتێک هەیە، بە تایبەتیش ئەمە لەو سستمانەدا ڕودەدات کە دەسەڵاتدارانی لە بازنەیەکی داخــراودان و دوور و نزیــک ئاگایان لــە حەقیقەتی واقیــع و میللەت نییە، بــەڵام لەپڕێکدا دۆخەکە دەتەقێتەوە و ڕژێمەکەش توشــی پشــێوی و لێکترازان دەبێت. گەر ڕژێمی سیاسیش نەیزانی لە کاتی گونجاودا دەســت بوەشــێنێت، ئەوا پرۆســەی شــۆڕش لە هەڵکشــاندا دەبێت و دەتوانێت ئەو ڕژێمە ســەرەو نگوم بکات و بە ڕژێمێکی تازە جێگەی بگرێتــەوە، تەواو وەک چۆن پارادایمێکی نوێ (یاخود تیۆریایەکی زانســتی تازە)، شــوێنی پارادایمە کۆنەکە دەگرێتەوە لە کایەی زانستی و لای توێژەران و لەلابورەکاندا. ڕاماڵینی تیۆریایەکی کۆن کە بۆ ماوەیەکی زۆر باڵا دەست بو بێت و دانانی تیۆریایەکی تازە لە شــوێنی، کارێکی هێندە ئاســان نییە، لەبەرئەوەی مانەوەی بۆ ماوەیەکی دورو درێژ، وا دەکات شەرعیەت بۆ خۆی پەیدا بکات.

لێــرەدا دەتوانیــن باس لە بزاوتە مێژوییــە مەزنەکان بکەین، بۆ نمونە وەک ســەرهەڵدانی ئاینی ئیســلام. «محەمەد» پێغەمبەر دەســت بەجێ نەیتوانی بیروباوەڕە تازەکەی خۆی فەرز بکات، بەڵکو زەحمەتی زۆری چەشــت تا توانی پایەکانی سســتمی خێڵەکی و جاهیلی سەردەمی پێشوو بە هەموو بەهاو قەناعەتەکانیەوە لەق بکات و لە شوێنی ئەوانەش سستمێکی ئیسلامی نوێ بسەپێنێت: دەکرێت هەمان شــتیش دەرهەق بە شۆڕشــگێڕە فەرەنسیەکان و شەڕ و ململانێکانیان لەگەڵ سستمی تیۆلۆژی کۆنی فەرەنسیدا بڵێین.

لەمڕۆدا ئێمە پێمان وایە جیهانی ئیســلامی بە گشــتی دوچاری قەیرانێکی قوڵ بووە، بەو قەیرانە بەناوبانگــەی هۆشــیاری ئەوروپی دەچێــت کە بووە مایــەی لەدایکبونی جیهانی مۆدێــرن. قەیرانی مەســیحیەت لەگەڵ ئەقڵی زانســتی تازەدا، تا ڕادەیەک لەو قەیرانەی ئێمــە دەچێت لەگەڵ مۆدێرنەی هاوچەرخدا. نیشــانەکانی نەخۆشــیش لێرەو لــەوێ وەک یەکن و بەیەک دەچن. ئەگــەر نەزانین چۆن ڕوبەڕوی ئەم کێشــە چارەنوس ســازە دەبینەوە (واتە کێشەی دابڕان و گواســتنەوە لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر)، ئەوا زیاتر ســەرگەردان دەبین و کێشەکانیشــمان زیاتر قوڵتر دەبن. ئەم دابڕانە قۆناغ بە قۆناغ و بەشــێوەیەکی لەسەرخۆ دەبێت، پرۆســەی تازەکردنەوەی واقیعیش سەرکەوتوو نابێت، گەر لە هەناوی کۆمەڵگاکانی خۆمانەوە ســەرچاوە نەگرێت. بەڵام ئەم کارە بەوە ناکرێت ڕۆشــنبیرەکانمان بێن و بڵێن: (پێویســتە زانستە سروشــتیەکان و تەکنۆلۆژیا لە خۆرئاوا بخوازین و زانستە مرۆڤایەتیەکان و بەهــاو بیروبۆچونەکانی مۆدێرنــە فەرامۆش بکەین)، چونکە ئەمە لە چاکترین حاڵەتدا خۆ فریودانە. تەکنۆلۆژیا یان دەبێت لەگەڵ ئەو میتۆدە ئەقڵانیانەدا بخوازرێت کە لەسەری دروست بووە، یان دەست

بـــەرداری بیـــن و وازی لێ بێنین. چونکە خواســـتن و کرینی تەکنۆلۆژیا بە تەنیـــا، لە پراکتیزەکردندا شکســـت دێنێت و (شکستیشـــی هێنا). دابڕان لەگەڵ دنیای کۆن تەنها لەسەر ئاستی مادی و ئابوری و ســـەرزەمینی واقیع ڕونادات، بەبێ دەســـتکاریکردنی لایەنی دەرونی و ویژدانی و فیکری[٧]. قەیرانی ئێستای هۆشیاری ئیسلامی و عەرەبیش ئەمەیە!!

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

1-MICHEL FOUCAULT، LES MOSTS ET LES CHOSES، PARIS، GALLIMARD، 1996.

2-MICHEL FOUCAULT، LARCHEOOLOGIE DU SAVOIR، PARIS، GALLIMARD، 1969.

3-THOMAS KUHN، THE STRUCTURE OF SCIENTIFIC REVOLUTIONS، UNIVERSITY OF CHICAGO PRESS، 3RD EDITION، 1996.

4-LAGE DE LA SCIENCE، LE CTURES PHILOSOPHIQUES: EPISTEMOLOGIE. SOUS LA DIRECTION DE PIERRE JACOB (GILLES – GASTON GRANGER) PARIS، EDITIONS ODILE JACOB، 1989.

چاخی زانست: چەند خوێندنەوەیەکی فەلسەفی، ئەپستمۆلۆژیا (واتە فەلسەفەی زانست)، لە بڵاو کراوەکانی ئۆدێل جاکۆب – پاریس. بە سەرپەرشتی: پییر جاکۆب و ئەندامێتی جیڵ گاستۆن گرانجێ.

5-کـــە باس لەمە دەکەم، بێگومان بیر لە فێندەمێنتالیزم و تێگەیشـــتنی فێندەمێنتالیزمی تەقلیدی دەکەمەوە بۆ ئاینی ئیســـلام. ئاشـــکرایە ئێمە گەر بمانەوێت ژیانێکی نوێ بونیاد بنێین کە لەگەڵ مۆدێرنەدا بگونجێت، ئەوا ناچار دەبین لەو تێگەیشتنە دەرباز بین.

6-مەبەســـتم لەوەیە کە نوێگەری لە ئاســـتی مەدەنـــی و مادیدا، خەریکە لە کۆمەڵگەی ئێمەشـــدا ڕودەدات، بەڵام لەسەر ئاستی فیکری و ئەقڵانی زۆر خاوو خلیچکە. نوێگەریش دەبێت هەمە لایەن بێت، واتە فکری و مادیش بێت یان نابێت.

7-لەم کتێبەدا باســـم لە (تیۆریای کارەســـات)ی زانای بەناوبانگی ماتماتیکی فەرەنسایی «ڕینیە تۆم» نەکردووە، ئەویش لەبەر ئەوەی زۆر دەستم بەسەر ئەو بابەتەدا ناشکێت و هەروەها پێشم وایە کە جیاوازی زۆری لەگەڵ (تیۆریای دابڕانی ئەپستمۆلۆژی)شـــدا نییە لای «گاســـتۆن باشلار»، یان لەگەڵ (تیۆریای ئەبستیم) لای «میشێل فۆکۆ»، یاخود لەگەڵ (تیۆریای پارادایم و شۆڕشی زانستی) لای «تۆماس کوهن».

## سەرچاوە:

د.هاشم صالح: مفهوم القطيعة الابستمولوجية في الفكر و الحياة – دار الطليعة، بيروت – الطبعة الاولى، ٢٠٠٨.

# زڕە هونەرمەند

غوڵامحسەین ساعدی
لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار

زڕە هونەرمەند: یەکێ لەو شتە گرنگانەی ئەمڕۆ وەکو شێرپەنجە لە هەر بزاوێکی فەرهەنگی و هونەریدا ریشەی داکوتاوە، هونەری درۆ و فەرهەنگی دەسکرد و ساختە و درۆیینە. بەڕێوەبەران و خاوەنەکانی زیاد لە ژمارەی ئەم چەشنە هونەرەیە لە هەر بوارێکی هونەریدا بە فێڵ و درۆ و کلکە سوتێ، گەورەترین مەبەست و ئاواتیان ئەمەیە کە بە تەپوتۆزێک کە ئەیکەن، هونەر و هونەرمەندی راستەقینەی ئەم وڵاتە لە بەرچاو ون و بزر بکەن. ئەگەر بڕیار وابێ ناوێک بۆ ئەم تاقمە بدۆزینەوە، ئەوە پێم وایە وەکو «شێوە پەتا» ناوی شێوە هونەرمەند یان زڕە نووسەر، زڕە شاعیر، زڕە نەقاش و.. جوانترین ناو بێ، چونکا هەروا کە شێوە پەتا، نیشانەکان و مەترسیەکانی پەتای پێوەیە ئەم تاقمەش بەو جۆرەن. هەرچەند ئەبێ ئەوەش بڵێم کە زڕە هونەرمەند لەبەرئەوەی لە هەرچەشنە هونەرێک بێ بەرییە لەگەڵ هونەرمەندی راستەقینەدا هیچ پێوەندیەکیان نیە، بەڵام پەتاو شێوە پەتا تاڕادەیەک لە یەک ئەچن. یەکێ لە هۆکارەکانی سەرهەڵدان و پەرەسەندنی ئەم دیاردە ئەگەڕێتەوە بۆ باری کۆمەڵایەتی، هەروەها کە شوێنێکی پیس نەتوانێ ببێتە هۆی سەرهەڵدان و بڵاوبونەوەی هەر چەشنە میکرۆبێک، کۆمەڵگای نەخۆشیش هەلومەرجێکی وا ئەرەخسێنێ کە ئەم تاقمە زاوزێ بکەن. سەرهەڵدانی زڕە هونەرمەند سەرهەڵدانێکی نوێ نیە و دەیان ساڵە وەکو پەتا لە هەموو شوێنێک بڵاوبۆتەوە، بە تێپەڕبوونی زەمان هەموو لقەکانی هونەری گرتۆتەوە و ڕێی نەداوە چرۆیەکی تازە و ساخ سەرهەڵبداو بپشکوێ.

زڕە هونەرمەند دەعبایەکی بێ فەرهەنگە کە بەرگی فەرهەنگی لەبەرئەکا. یەک دوو زمانی ڕۆژئاوایی فێر ئەبێ و ناوی هەندێ لە قوتابخانەکانی هونەری ڕۆژئاوایی کە هیچ فرێکیان بە ئێمەوە نیە فێر ئەبێ و لە هەر سات و کاتێکا و لە هەر هەل و مەرجێکدا کە بێتە پێش، بە شێوەیەکی سەیر، وشەگەلی قەڵەمی ریز ئەکاو بە هەڵڕشتنی دێڕی سەیرتر فەزڵ فرۆشی ئەکا و بە کاوێژکردنی ناوی چەند کۆلکە هونەرمەند و زڕە نووسەری نەناسراوی ڕۆژئاوایی، خۆڕائەدا و بە شانازیەوە باسی ئەوە ئەکەن کە چەند ساڵێ لە دەرەوەی وڵات ژیاون و بە فیزێکەوە و بە چاوێکی سووک لەو خەڵکە ئەڕوانن کە تەنیا گوناحیان ئەوەیە دەرفەتی ئەویان نەبووە وەکو ئەوان سەرێکی ئەو وڵاتانە بدەن. زڕە هونەرمەند فەرهەنگ و کەلەپوری نەتەوایەتی خۆی ناناسێ و ریشەی لە دەرەوەی وڵاتەکەیدایە. میراتی هونەری سەدان ساڵەی باوباپیرانی خۆی خۆش ناوێ، بەڵام هەندێ جار بۆ خۆنواندن و فەزڵ فرۆشی و بۆ بەشداری کردن لە ڤێستیڤاڵەکاندا، ناخوونەکێ لە ئوستورە میللییەکان و دەقە هونەریەکان ئەدا و لای خۆی پێی وایە کارەکەی ئەوەندە جوانە کە خەڵک سەریان سووڕ ئەمێنێ، بەڵام لە ئاکامدا ئەوەندە ناشیانە کارەکە بەڕێوە ئەبەن کە خۆیان ئەکەن بە پەنی خەڵک. زڕە هونەرمەندەکان هەرچەند پشت لە فەرهەنگی گەلەکەیان ئەکەن، بەڵام هەندێ جاریش ئاوڕێکی خێرا و ڕێبوارانە لە گۆرانی و حیکایەت و بیروباوەڕی خەڵک ئەدەنەوە، لەبەرئەوەی جار جار کەڵکی بۆیان هەیە. بەم جۆرە فەرهەنگی گەل لەبری ئەوەی بێتە سەرچاوەی باوەڕپێکراو بۆ کارەکەیان، ئەبێتە هۆی ڕازاندنەوەی کارەکەیان.

لەلای زڕە هونەرمەند ناوەرۆک و سوژە شتێکی بێ بایەخن، لەبەرئەوەی ئەم تاقمە قسەیەکیان بۆ وتن نیە. ئەوان بە هەڵیت و پڵیت بۆشاییەکانیان پڕئەکەنەوەو لە ئاکامدا رووئەکەنە فۆرمالیسم و لەم بوارەشدا بەوەی ئەگەن کە پرژاندنی رەنگەکان بەسەر بوومی نەقاشیداو یان کێشانی چەند وێنەیەکی رووت و قووت و یان لە بواری نوسیندا، بە نووسینی چەند قسەیەکی پڕوپووچ و ورێنەکردن، پێیان وایە کە لە لوتکەدان، هونەرمەندی راستەقینە لە هیچ شتێکی بەنرخ ئەخوڵقێنێ، بەڵام زڕە هونەرمەند هەموو شتێ لەناو ئەبا، ئەم لەناوبردن و فەوتانە تەنیا کارەکانی خۆی ناگرێتەوە، بەڵکو زڕە هونەرمەند بە کردەوە و بە قسە هەندێ جار زەحمەتی هونەرمەندانی راستەقینەش پێشێل ئەکا و بەم جۆرە ڕق و تووڕەیی خۆی بەرانبەر بە هونەری راستەقینە دەرئەبڕێ.

گوتمان ئەم تاقمە ناوەڕۆکیان بەلاوە گرنگ نیە، مەبەستمان لە ناوەرۆک ئەو شتانەن کە پەیوەندیان بە هەست و نەستی مرۆڤ و خەڵک و نیشتمانەوە هەیە. زڕە هونەرمەند چۆن خاوەنی خاک و نیشتمانێ نیە و هیچ بڕوایەکی بە خەڵک و دەسەڵاتی گەلەکەی نیە، بە ناچار جەهان وەتەنی بیرئەکاتەوە و بێ خەبەر لەوەی کە هونەرمەند هەتا خەڵک و خاکەکەی خۆی نەناسێ و دەرد و ئازارەکانی گەلەکەی نەنووسێتەوە و عەشقی ئەوان نەبێتە هەوێنی کارەکانی، ناتوانێ جیهانی بیر بکاتەوە و ببێتە سیمایەکی جیهانی. زڕە هونەرمەند ئاواتی ئەوەیە کە کارەکانی لە پیشانگایەک لە دەرەوەی وڵات نیشان بدرێ، هەرچەند ئەگەر ئەم کارەش بکرێ و بە سووکایەتیەوە بەڕێی بکەن و بە سەرشۆڕیەوە بگەڕێنەوە بۆی گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە کە چۆن کەسێکی ڕۆژئاوایی و ئەمریکایی کارەکانی ئەو ببینن و بەلای ئەوەوە ئەمە یانی جیهانی بوون. ئیتر نازانێ هونەرێ کە لە زێد و نیشتمانەکەی خۆیدا کەس تێینەگات نامۆیە و هونەرمەندێ کە هاونیشتمانیەکانی خۆی ئامێزی بۆ نەگرنەوە چۆن لە هەندەران بە پیریەوە ئەچن؟ زڕە هونەرمەند سەنگی مەحەکی بەلاوە بێ نرخە، نە لەبەرئەوەی دڵداری بێ غەل و غەشە، بەڵکو لەبەرئەوەی کە باوەڕی بە میللەتەکەی خۆی نیە، ئەگەر کتێبەکەی نەفرۆشرا یان پێشانگای تابلۆکانی پێشوازی لێنەکرا، ئەوا هۆی ئەم کارە نەفامی و تێنەگەیشتووی خەڵکەکەیەتی، تەنانەت ئەگەر خەڵک

ئاورێکیان لە شانۆنامە و فیلمەکەی نەدایەوەو بە تووڕەیەوە بەرەنگاری بوونەوە، هەم دیسان تاوانباری ئەو خەڵکەن کە وردەکاری و ناسک کاریەکان و جوانکاریەکانی رۆحی هونەرمەندەکەو بەرهەمەکەی نابینن. بەم جۆرە چەکی «نەفامی خەڵک» هەمیشە بە شانی هونەرمەندەوەیە، بە مەبەستی پاراستنی خۆ لە هێرشی رەخنە و رەخنەگران. زڕە هونەرمەند بەبێ ئەوەی زەوقی خەڵکەکەی بە تاک و تەرا و بە گشتی هەڵسەنگێنێ و بەراوردی بکا، رێگە بە خۆی ئەدا ئەم سووکایەتیە بە خەڵک بکا، لە کاتێکدا هەر ئەم خەڵکە بەناو نەفامەن کە بەو زەوقە کوێرەوەبووەی خۆیان پاشەکشە بەوان ئەکەن و بە مشتی خۆیان سەرو گوێلاکی ئەم شێرە بەفرینانە ئەهێننە خوارەوە. زڕە هونەرمەند لە باری زەینی و فکریەوە رۆح قورس و بێ جووڵەیەو لە ئاکامیشدا وەک «ئۆبلۆمۆفی» قارەمانی رۆمانەکەی «گەنجارۆف» بەم نەخۆشیەوە ئەمرێ. زڕە هونەرمەند نەخۆشی و رووداوەکانی کۆمەڵگای بەلاوە گرنگ نیە، هیچ رووداوێکی کۆمەڵایەتی نایجووڵێنێت بەڵام وەک تانجی راوەستانی بۆ نیە و لەمپەڕی دنیا بۆ ئەوپەڕی دنیا، لەم شارەوە بۆ ئەو شارەو لەم مێهرەجانەوە بۆ ئەو مێهرەجان و لەم کۆبوونەوەوە بۆ ئەو کۆبوونەوە، دایم وەکو مەکۆی جۆلا لەگەڕدایە، تەنیا لەبەرئەوەی کە بیبینن و لەبەرئەوەی بزانێ با لە کوێوە دێ. لە قنگەلاشکیان پرسی بۆ کوێ ئەچی؟ گوتی با ئەزانێ. زڕە هونەرمەند هەلپەرستە و بۆ گواستنەوەی هەلەکان بە قازانجی خۆی بێ شەرمانە هەوڵ ئەدا و خەڵات وەرئەگرێ و پارەی پێ ئەدەن و وەک تووتکە سەگ نەوازشی ئەکەن. زڕە هونەرمەند دەلالْ و جامبازە و قازانجی خۆی لەبەرچاوە. لە بەرانبەری زۆرداراندا قوڕ بەسەرو زەلیلە و کلکەسووتێیان بۆ ئەکا و لە بەرانبەری خەڵکدا زۆر وێژو و لە خۆڕازی و خۆ بە زل زان و لەخۆبایی و تەوزەلە. هەر رۆژێ بە دە جۆر رەنگ ئەگۆڕێ، هەمیشە بەرێی جەژن و ڤستیڤالەوەیە. لەڕاستیشدا میهرەجان رێخستنکاری ئەم زڕە هونەرمەندانەیە و بەم جۆرە سامان و ماڵی نیشتمانەکەیان بە فیڕۆ ئەدەن. لە هەر کوێ ئاشە، زڕە هونەرمەند فەڕاشە، زڕە هونەرمەندەکان لە هەموو کۆبوونەوە و دانیشتنێکدا هەن، بۆ ئەوەی کارێ بکەن دەس ئەدەنە هەزار فێل و تەڵەکە. پیاوی یەکەمی خەلات وەرگرتنن، ئەو نیشان و شانازی و گەورەییانەی کە پێیان دراوە لەگەڵ خۆیان بۆ هەموو شوێنێکی ئەبەن. ماڵ و دوکانەکانیان بەو وێنانە ئەڕازێننەوە کە لە کات و ساتی تایبەتدا گرتوویانە. نێوانیان لەگەڵ رۆژنامەکان و رادیۆ و تەلەفزیۆندا هەتا بڵێی خۆشە، وێنەکەیان رازێنەرەوەی لاپەڕەی گۆڤارەکان و شاشەی تەلەفزیۆنە، هەتا بڵێی لە کاری وتووێژدا گورج و چالاکن. چ ئەرکێ بەڕێوەببەن یا نەیبەن و چ بەرهەمێ بخوڵقێنن و یان نەیخوڵقێنن، گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە سەریان بچێ و نوێژیان بچێ، بەڵام وتووێژەکەیان نەفەوتێ. لە وتووێژەکانیشیاندا ئەرکی سەرشانیان وڕێنەکردن و جنێودان بە خەڵک و داشۆردنی حەریف و ژێرپێنانی ماف و ناوی هونەرمەندانی راستەقینەیەو سەروبنی باسەکەیان ئەوەیە کە لە داهاتوودا ئەیانەوێ هێلکەی دووزەردێنە بۆ خەڵک بکەن و شتی لەم بابەتانە. زڕە هونەرمەند راوچیە کۆنەکارە و بۆ مانەوەو هەڵکێشانی خۆی ئەبێ چەند کەسێ لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، ئەکەوێتە راوکردن و لە داوخستنی ئەو لاو و گەنجانەی کە توانای کاریان هەیە و ئاشقی هونەرو بیرو باوەڕن. ئەو لاوانەی کە خونچەی هونەریان خەریکە ئەپشکوێ و ئەبێتە گوڵ. زڕە هونەرمەند بە سیحر و ئەفسوون و بە بیانوی رێنوێنی (ڕاو) تەماڵێکی مەعسوم هەڵئەبژێرێ و چاوو دڵ و گوێی ئەبەستێو بەبێ ئەوەی تەماڵەکە هەست بە ئێش و ژانێ بکا، سەری ئەکا و پاشان ژاری دەرخوارد ئەداو نەخۆشی ئەخا و بەرەو هونەری موتڵەق و شیعرو نەقاشی موتڵەق کەمەندکێشی ئەکا و ئەبێتە رێ پیشاندەری. جا ئەگەر تەماڵەکە وریا نەبێ و لەم داوە خۆی دەرباز نەکا یا توانای دەربازبوونی نەبێ، ئەوا بۆ ئەبەد زڕە هونەرمەند مرداری ئەکاتەوە ئەڵێن چۆن

بەم جۆرە: خێرا میدالیای گەورەیی و نبووغ لە بەرۆکی ئەدەن و لە بیروباوەڕی ئینسـانی و نیشتمانی دووری ئەخەنەوە و ئەیکەن بە تربچەیەکی بەڕواڵەت گەش و سور و لە دەرونەوە پفەڵ و ئەیخەنە گیانی خەڵک. بۆیە ئەتوانین بڵێین هونەری فێڵاوی و درۆ و ساختە وەک نەخۆشی موسری وایە. پەتا، شێوە پەتای بەشـوێندادێ و زڕە هونەرمەند، زڕە هونەرمەندی لێ ئەبێ. زڕە هونەرمەند دژی سانسـۆر نیەو هەسـتی پێ ناکات. نە لەبەرئەوەی کە ئەم دوانە فریان بە یەکەوە نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە سانسـۆر و زڕە هونەرمەند دوانەی لەیەکچوون. لەڕاستیشـدا زڕە هونەرمەند بەرهەمی زاوزێی سانسۆرە. سانسۆر هونەرمەندی راسـتەقینە سـەرکوت ئەکا و تۆوی زڕە هونەرمەند لە هەموو شـوێنێکدا بڵاوئەکاتەوە و ئەچێنێ.. هەرچەند کە پێویستە بۆئەوەی خەڵک ترسیان برەوێتەوە و ئەرخایەن بن ئەبێ بڵێم بە هۆی تێگەیشـتوی خەڵک و روون بونەوەیان و وردبینی نیشتمانانەوە، زڕە هونەرمەند ناتوانێ وەک نەخۆشی تەشەنە بکا و ئەم باسەش بۆ ئەوەیە کە ناسینی هەر شتێ رێگە خۆشکەرە بۆ فەوتاندنی ئەو شتە بە لەناوچوونی سانسۆر، ئەم غوولە بێ جووڵەیە هەناسەی سوار ئەبێ و لەلایەکی تریشەوە کاری بەردەوام و شـەرافەتمەندانەی هونەرمەندانی راسـتەقینە، تەنگ بەم غوولە هەڵئەچنێ و رێی خۆ پیشاندانی لێ ئەگرێ. هەرچەند لە رواڵەتدا بە ژمارە زڕە هونەرمەند زۆرترن، بەڵام دەسـەڵاتی راسـتەقینە لە دەست هونەری ئەمروو هونەرمەندانی راستەقینەدایە. بۆیە ئەڵێین:

«هونەرمەند لە سەروو دەسەڵاتەوەیە نەک لەگەڵ دەسەڵاتدا» «م. ثالث»

## فەرهەنگۆک:

زڕ: (پێشگر)-: نائەسڵ داری بێبەر، خۆ هەڵکێشانی بە درۆ

(زڕ دارێک — زڕبرا — زڕکەو... ) هەنبانە بۆرینە.

## سەرچاوە:

کتێبی دە شەو: چاپ امیر کبیر. تهران ١٣٥٧

# ڕۆژێکی دوای کریسمس

م. ستانلی بوبین
لە ئینگلیزیەوە: پشتیوان مبارەك كریم

ڕۆژێکی دوای کریســـمس بوو، سەری سوڕدەما کە چ شتێک هانی دا ئەمڕۆ بێت بـــۆ ئەو قەیســـەرییە . خەڵکی گرژو مۆن بە هەمـــوو لایەکدا دەهاتن و دەچون، لەسەر نوکی پێی وەستابوو بە شوێن مێردەکەیدا دەگەڕا کە ڕۆشتبوو جوتێک پێڵاو بگەڕێنێتەوە لـەپێش چاوی وون بووبوو. ســـەرێکی ڕاوەشاند و ئەویش نێوچەوانی گرژ کرد. لەناو قەرەباڵغیەکەدا تەواو قەتیس مابوو، ڕێگای تێپەڕینی ســـەخـــت و دژوار بـوو، هەرزەکارێکیش بە پانتۆڵێکی دەڵپی دەرقاچە شـــۆڕو زنجیرێکەوە کە بە گیرفانی کراســـەکەیدا هەڵیواســـیبوو، بە خێرایی بە لایدا تـێپەڕی و خۆی پێدا کێشا، زنجیرەکەی لە جانتاکەی شانی گیر بوو، خستیە خوارەوە . تێی خوڕی: « هێی « بەڵام هەرزەکارەکە گوێی پێنەداو بە نـــــاو قەرەباڵغیەدا ڕۆشت و بزر بوو. بەڵام دیســـانەوە لە دوایەوە بانگی لێکرد «نالەبار!» هەر لەو کاتەدا چەندین کەس بـــە نێوچەوانێکی گرژو مۆنەوە ئاوڕیان لێدایە و تەماشـــایەکیان کرد. دانەوییەوەو جانتاکەی هەڵگرتەوەو بە هەوەسی خۆی جنێوی پێدا تەنها لەبەرئەوە جنێوی پێ دەدا چونکە دەیزانی کە هیچ کەس بە ڕاستی گوێی لێ نییە، لە هەمانکاتدا حەزی دەکرد هەموو کەس گوێی لێبێت. جانتاکەی کردەوە شانی و دەنگێکی خۆشی هاتە بەر گوێ . گوێی گرت جاڕدەرێک گۆرانیەکی خۆش و بە سۆزی دەچڕی ...

گوێبگرە، فریشتە مژدەبەرەکان گۆرانی دەڵێن.

حەشـــاماتەکە ئاوڕیان دایەوە بەرەو لای دەنگەکە ڕۆیشتن، بەڵام بە پێچەوانەی ئەو ئاڕاستەیە بوو کە ئەم دەیویست بڕوات. هەر کە هەوڵی دەدا بە ناو خەڵکەکەدا

تێپەڕێت دەیوت: « نــا ، نــا ، ئەو ڕێگا نــا ، بوەســـتن ، چاوەڕێ کەن، ڕێگەی من بدەن با تێپەڕم. دەبێت ئەو بلوزانە بهێنمەوە. بەڵام بێ سود بوو. فشاری قەرەباڵغیەکە کاتێک هێور بوویەوە کە ئەمیان بە پاڵەپەســـتۆ ڕاستەو ڕاســـت بردە بـــــــــەردەم گۆرانیبێژەکان. ســــەربەرزی بۆ پاشای تازە لەدایک بوو ...

ئەمیش لە ژێر لێوەوە بە مینجەمینج بە پیرەمێردێک کە غەبغەبەیەکی پڕ لە چرچ و لۆچ بە خوارەوەی ڕوخســـاریەوە بوو، وتی « نازانن دوێنـــــــێ کریســـمس بوو نەک ئەمڕۆ «. پیرەمێردەکەش سەیرێکی کرد تاکو وەڵامی بداتەوە، بەڵام ئاوازی گۆرانیەکە هێندە بەرزبویەوە کە ســـەرنجی سەرجەم حەشامەتی ناو قەیسەریەکەی بەرەو لای خۆی ڕاکێشا و ناچار بە گوێگرتنی کردن، هەر بۆیە پیرەمێردەکە نەیتوانی وەڵامی بداتـــــــــــــەوە.

شادی و کامەرانی بۆ ئێوە ئەی نەتەوە سەرکەوتووەکان ...

بەپێش چاویەوە، پیرەمێردەکە بزەیەک گرتی و لێوەکانی بەرەو سەرەوە کرانەوە، ڕوخساری هیچ چرچ و لۆچیەکی تێدانەما، بەڵام تەنیا ئەو نەبوو بەڵکو هەســـتی کرد کە ئەم گۆڕانە ســـەرتاپای خەڵکەکەی گرتەوە بە جۆرێک گرژی و مۆنی بە سەریدا زاڵببوو، یەک لە دوای یـــــەک سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، کەمێک چاوی گێڕا بەناو خەڵکەکەدا، ڕوخساریان نوقمی شادی و کامەرانی ببوو. بەسەرسوڕمانەوە، سەری بـەرز کردەوە و گوێ قوڵاخ بوو.

بەشداری ئاهەنگی سەرکەوتن بکەن ...

هەرچەنـــدە هەموو گۆرانیەکە زووبەزوو گەشـــتە کۆتایی و بێدەنگ بـــوو، بەڵام هەر دەنگێک کە لە گوێیدا دەزرنگایەوە، مووچرکەیەک بە هەمـــــوو گیانیدا تێپەڕ دەبوو. هەناســـەیەکی ساردی هەڵکێشاو بەڕێ کەوت، بڕیاری دا، ئەو بلوزانەی کە لە دووی دەگەڕا و لای خەڵکی پەسەند نەبوون لـە بیری خۆی بردەوە و دڕی بە ئاپۆرەی خەڵکەکە داو بەرەو پێشـــەوە ڕۆیشـــت و ووتی: «ببورن» بە ناو خەڵکەکەدا تێپەڕ دەبوو، هەوڵیشی دەدا خـۆی نەکێشێت بە جانتاو شتومەکی خەڵکیدا.

بەردەوام دەیووت: «ببورن، ببورن».

خەڵکەکەش بە زەردەخەنەو ســـەربۆلەقاندنەوە وەڵامیان دەدایـــەوە، تەنانەت یەکێکیان قاوەیەک بە دەستیەوە ڕژا چونکە بە قایمی خۆی بە باڵیدا کێشا بوو. ڕێگاکە چۆڵ بوو، هەرکە دیتی ئەو ڕێگایەی بەرەو کۆگای پێڵاوەکان دەچێت چۆڵە، هەناسەیەکی وەبەر هاتەوەو کەمێک ئاسودە بـوو. بەخۆی ووت: «دواهەمیـــن جێگا کە بینیم ئێرە بوو، هەر لێرەشـــەوە بەدوایدا دەگەڕێم. «هەرکە وەڕس بوو لە گەڕان بەدوای مێردەکەیدا، گۆرانیەکی تـر لە پشـــتیەوە دەســـتی پێکرد، ئەمیـــش لەبەر خۆیەوە بە تەنیا و لەسەرەخۆ، بێ ئەوەی بزانێت چی دەڵێت، دەستی کرد بە گۆرانی وتـــــــــن.

شادی و کامەرانی بۆ جیهان، پاشا لەدایک دەبێت، با ئاسمان و زەمین گۆرانی بڵێـــــــــــــــــن..

کتوپڕ مێردەکەی کەوتە بەرچاو، لەســـەر کورســـیەک دانیشـــتبوو، ناوچەوانی لـــە هەمووکەس گرژ دەکرد کە بە لایدا تێپەڕ دەبوون. بە زەردەخەنەیەکی هێندە زۆرەوە کە ددانەکانی وەدەرکەوتن ڕۆشـــت بەدەم مێردەکەیەوە، دەســـتی ڕاکێشـــا و بردی بـــەرەو ناو ئەو کۆمەڵەی کە گۆرانیـــان بۆ یـــــــــادی کریسمـــــــس دەچـــــــڕی.

## سەرچاوە:

سایتی WWW. TORYBYTES.COM

# دوو نامەی نێوان شاعیری ناسراو ( میسباح دیوان - ئەدیب) و دۆستێکی

لە فارسییەوە: محەمەد حەمە باقی

## ڕونکردنەوەیەکی پێویست:

ساڵی (٢٠٠٥ ز)، دوای گەڕان و ماندووبوونێکی پشوو درێژ و هاوکاریی دڵسۆزانەی چەندان هاوڕێی نووسەر لە خۆرهەڵاتی کوردستان، توانیم دیوانی شیعری شاعیری ناوداری موکریان: عەبدوڵڵا بەگی میسـباح دیـوان — ئەدەب (؟- ١٩١٦/٥/٢٢ ز)، بە لێکدانەوە و بەراورد و پەراوێزەوە ساغ بکەمەوە و لە دەزگای (ئاراس) بە چاپی بگەیەنم.. سەیر لەوەدا بوو هەندێ لە نەوەو نزیکەکانی میسباح دیوان (ئەدەب)، بەر لەوەی چاپی دیوانەکە، بەو شێوە جوان و قەوارە (٩٢٠) لاپەڕەییە چاپ بێت، زۆر سەخت و بە چەڵەمە، شیعر و نامە و نووسینەکانی ئەم شاعیرەیان لە چنگ دەردەهێنرا. بەتایبەتیش (وەک لە پێشەکی دیوانە چاپکراوەکەدا ئاماژەم پێ کردووە، ل ١٩)، مەلایەک بە ناوی مەلا قادر (١٩٤١ز)ی کوڕی میرزا ساڵح، لە گوندی (ئەرمەنی بڵاغی — گوندەکەی ئەدەب)، شیعر و نامە و نووسراوێکی زۆری (ئەدەب)ی بەلاوەیە. چۆنیش ئەم شوێنەوارە بەنرخانەی (ئەدەب)ی کەوتۆتە لا، بەسەرهاتەکەی ئاوایە: باوکی ئەم مەلایە، واتە: میرزا ساڵح (؟- ١٩٧٨ ز)ی کوڕی محەمەد ئەمین کوڕی عەبدوڕەحمانی کیانی، هەر بە لاوێتیی لەبەردەستی (ئەدەب)دا پەروەردە بووەو بەو هۆیەوە کە زیرەک و خەتخۆش بووە، زۆری خۆش ویستووە و برازایەکی خۆیشی لێ مارە کردووە. ئەم میرزا ساڵحە، کاری نووسیاریی — میرزایی لەبەردەستی (ئەدەب)دا کردووە و زۆرینەی شیعر و نامەی تایبەتی و شوێنەواری ئەدەبیی و هونەریی و کتێبخانەکەی (ئەدەب)ی بەلاوە بووە و دوای

مەرگی (ئەدەب)یش، هەموو ئەو شیعر و نامە و شوێنەوار و بەرهەمانەی (ئەدەب)، هەر لای ئەم میرزا ساڵحە ماونەتەوەو بە شێوەیەکی زۆر جوان و بە ئەمانەتەوە لای خۆی پاراستوونی و وەک سەرمایەیەکی پیرۆز و بەهادار، نرخیانی زانیوەو نەیهێشتووە تەنانەت لەتە کاغەزێکیشی لێ بفەوتێ.. بەڵام مخابن! دوای مەرگی میرزا ساڵح، هەموو ئەو شوێنەوارانە کەوتوونەتە لای ئەم (مەلا قادر)ە نەخوێندەوارەی کوڕی و هەندێ لە خزم و نزیکانی هاوشێوەی ئەم مەلا قادرە.

ئەم مەلا قادرە، کە نرخی ئەم شوێنەوارانە نازانێ، لە بەرامبەر هەندێ دەستکەوتی زۆر کەمدا، بەم و بەویان دەفرۆشێ و لەناویان دەبات و جۆری لەناوبردنەکانیشیان ئەوەندە دڵتەزێنانەیە، هیچ کەڵکێکیان بۆ فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی و تەنانەت بۆ کڕیارەکەش نامێنێ، چونکە (بۆ وێنە) ئەگەر شیعر، یان نامەیەکی (ئەدەب)، بریتی بن لە چەند لاپەڕەیەک، ئەوا هەر تاکە لاپەڕەیەکیان بە کەسێک دەفرۆشێ و تەنانەت ڕوودەدات، هەر لەناو تەنیا لاپەڕەیەکدا، کە نامەیەک، یان شیعرێکی لاپەڕەی پێشووتری تێدا تەواو دەبێت، بە دوایدا چەند دێڕ لە نامەیەک، یان چەند بەیتێکی سەرەتای شیعرێکی تری تێدا نووسرابێ و هەر بەم شێوەیەش کاک یونس ئەمین پوور-ی گوندی (ڕەحیم خان)ی هاوسێی گوندی (ئەرمەنی بڵاغی)، توانیبووی هەندێ شیعر و نامە و تابلۆی نیگارکێشی (کاری خودی — ئەدەب)، لە مەلا قادر وەربگرێ و بە لوتفەوە هەندێکیانی بۆ من هێناو منیش چەند جارێک لەگەڵ ناوبراوو هاوڕێیدا چیرۆکنووس: کاکە ناسری وەحیدی و یونس ڕەزایی شاعیردا، بۆ لای مەلاقادر لە ئەرمەنی بڵاغی چووین و بەهەر شێوەیەک بووبێ، هەندێ شیعری بڵاونەکراوەو چەند نامەیەکی تایبەتی (ئەدەب)مان لە چنگ دەرهێنا، کە دیسان هەر بە شێوەی پچڕ پچڕ و نیوەو ناچڵ بوون.

بەڵام دوای چاپی دیوانەکە و لەو قەوارە جوان و شایانەدا (کە وتمان)، زۆر لەو کەسانەی دڵخۆش و سەراسیمە کرد، کە هێشتا شوێنەواری نووسینی (ئەدەب)یان لای خۆیان گل دابووە و خۆیان لێ نەبان دەکرد. کە خۆشبەختانە بە دنە و هاندانی هەمان هاوڕێیانی دڵسۆز، کەوتنە دەرخستنی چەندان نامە و شیعری نەدیتراوی (ئەدەب) و بەڵگەنامەی گرنگ و لە ناویاندا بەڵگەنامەی مێژووی ڕاستەقینەی ڕۆژ و سەعاتی مەرگی (ئەدەب)، کە (ئەحمەد)ی کوڕی خودی (ئەدەب)، بە شێوەی شیعر نووسیبووی و پێش ماوەیەک کردمانە وتارێک و لە گۆڤاری (ئایندە)ی ژمارە (٨٢)دا بڵاومان کردەوە.

لەم نامەیەدا لەلایەکەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە (ئەدەب)یش پێش ساڵی (١٩١٤ ز) سەردانی تورکیای بەتێر و تەسەلیی کردووەو لە لایەکی تریشەوە، زانیاریی ئەوەشمان دەست دەکەوێ، کە (ئەدەب) لە سەروبەندی نووسینی ئەم نامەیەدا (مانگی مایسی ١٩١٤ ز)، نیشتەجێی گوندی (ئەرمەنی بڵاغی)یە.. لە سەروو ئەمانەشەوە، گیان و هۆشی کوردپەروەرانەی (ئەدەب)مان بە زەقیی و بە ئاشکرا لە ڕۆژگارێکدا بۆ دەردەکەوێ، کە هێشتا جەنگی یەکەمی جیهان رووی نەداوەو هێشتا ئەو جۆرە هۆشیاریی و بیروباوەڕانە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بڵاونەبوونەتەوە، کە دواتر بوونە هۆی زەمینە خۆشکردن بۆ کرانەوەو گەشانەوەی بیروباوەڕی زۆرینەی خەڵک، بۆ ئازادی و ژیانی سەربەستانە.. کە (ئەدەب) ئەم هەستەی بەر لە (٩٥) نەوەد و پێنج ساڵ دەربڕیوە.

بە مانایەکی تر: لە ڕێگەی ئەم نامەیەوە بۆمان روون دەبێتەوە، کە (ئەدەب) هەر بە تەنیا خەریکی (شیعر) و خەیاڵ کردنەوە لە وێنەی شیعریی نەبووە، بەڵکو هاوکات ڕووناکبیرێکی هۆشیاری ڕۆژگاری پێش یەکەمین جەنگی جیهانەو پێش مێژووی ئەم نامەیەی(ئەدەب)یش، نامەی شاعیرێکی تری کلاسیکی کوردمان لەبەردەستدا نییە، تا بەمجۆرە و لە ڕێگەی (نامە — پەخشان)ەوە، هەستی کوردانەی خۆیمان بۆ دەربڕێ.

## نامەی یەکەم:

نامەی میرزا ساڵح کیانی — بۆ:

عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان (ئەدەب)

بۆ: ئەرمەنی بلاغی — هەرێمی موکری

مێژوو: ١٨ی مانگی جەمادی یەکەمی ١٣٣٢ کۆچی

( ١٩١٤/٤/١٤ ز)

ژمرە: ٢

لە دەوری دەرکەوتن و درەوشانەوەی پڕ سۆزتان گەڕێم

دوای پێشکەشــکردنی دوعای تەمەنی درێژو بەرزیی و شکۆمەندیی و دەسەڵاتداریی، ئەم بەندەیەی حەزرەتی هێژا و پایەبەرز و رەســەنتان، دەست پێشکەریی و پڕکێشیی دەکات و ئەم پوختەنامەیەتان پێشکەش دەکات.

هەرچەندە هەفتەی پێشــوو، هەر کە گەیشتمە کۆشــکی بەختەوەریی: ئیسلامبول، باسێکی تێرو تەســەلم ســەبارەت بە داروبــاری خۆم و چۆنێتی رێگەو بان بۆ نووســین و هاوپێــچ لەگەڵ نامەکەی جەنابــی حاجی میرزا عەبدوللەتیفدا ناردمە خزمەتتان و بە پشــتیوانی خوا تا ئێســتا گەیشــتووەو ئێوەی پرشــنگداری رازی کردووەو دیســانەوەش بەپێی بەجێهێنانی نوێکردنەوەی ئەرکی نۆکەرایەتیی، ئەگەر لوتف بفەرموون، ســەرنجێک بە دەنگوباسی نۆکەردا دەگێڕن، چونکە هەروەک پێشتریش عەرزم کردبوون، بەو هۆیەوە کە بەدەم رێوە، ســەرمام ببوو و جلوبەرگیشــم گۆڕیبــوو، ئەم یەک دوو رۆژە، هەلامەتێکــی درێژخایانم تــووش هاتووەو بەکەڵکی چوونە دەرەوەو دەرچوون نەهاتووم. بەلام ئێســتا لە ســایەی خوای گەورەو بەخشــندەوە، چاک بوومەتەوەو لەگەڵ جەنابی هێژا و قیبلەم: مەلا عەبدوڵڵا ئەفەندی برامدا، سەرقاڵی بەسەرکردنەوەی قسە و باسی ساڵانی رابووردووین و دوعاگۆی لەش ساغیی و سەلامەتیی، ئێوەی بەختەوەر و پیرۆزین. لە ڕاستیشدا ناوبراو لە باری پیاوەتیی و سۆز و میهرەبانیی خودا پێداویی جەنابتانەوە، کە بەرامبەر بەم نۆکەرەتان نواندوتانە، سوپاسگۆتانە و لە سایەی خواشەوە، پەژارەیەکمان نییە و لە هیچیشمان کەم نییە، جگە لە پەژارەی بێ تۆیی، کە لە تەکماندا نیت.

ئەگەر دەنگوباسی تری بەندەتان و جەنابی کاکی ناوبراوم، لوتف دەفەرموون، هەرچەندە روونکردنەوەی (...)[1]، یان لە سایەی نەفەسی پیران و لوتفی تایبەتی پایەبەرزتانەوە، لە هیچ روویەکەوە لە هیچمان کــەم نەبووەو نییە و لەوپــەڕی کامەرانیی و رابواردنی خۆشــداین. بەلام هۆگربوون بە نیشــتمانەوە، شــتێکی ترە. لە خوای گەورەم داوایە، ئەوەی بووە ســۆنگەی لەبەریەک هەڵتەکاندنی خێزانەکەمان و ئاوارەبوونی جەنابی براکەم[2] و کوژاندنەوەی چرای بنەماڵەی باوانم و پەکخستن و چۆڵکردنی ئەم هەموو کتێبخانەیەی کە پشتاوپشــت لە باپیرەوە بۆ باوک مابوونەوەو هەمووشــیان کتێبی زانایانی ناوداری رۆژگاری خۆیان بوون، هەر بە ڕاســتی سۆنگەی هەموو ئەمانەش: نا حاجی! (سەیید میرزا) بایەزیدی خاڵۆم بوو، خوا هەقی لێ بسێنێ.

رادەیەک لەوەم دڵنیاکردن، کە ســەفەری ئیســلامبول ناکەم و لای ئەوان هەر تەنیا باسی سەفەری ساوجبلاغ (سابلاخ) م کردووە و ئەم سەفەرەی بەندەتان، هەر بە تەنیا حەزرەتی پایەبەرزتان دەیزانێ،

لەبەر ئەوەیە دەزانم کاتێ بۆیان دەردەکەوێ بۆ ئێرەوە هاتووم، خوشکم و خێزانەکەم، زۆر پەژارەیان دەبێ، بەتایبەتیش خوشکم، کە دەزانم چ حاڵەتێکی بەسەردا دێت. لەبەرئەوە لەم ڕووەوە لە بەرامبەر پیاوەتیی جەنابی پایەبەرزتاندا تکاکارم، بەڵکو کەســێک لای ئێوەی دڵسۆزەوە، بچێتە لایان و دڵنەواییان بکات. چونکە ئافرەت بە دڵدانەوە ئارامی دەبنەوەو ســەلامەتیی بەندە و جەنابی هێژای کاکمیان بگەیەنێتێ و دڵنیایان بکات و وایان بێنێتە پێش چاو، چۆن چوار ساڵ لەمەوبەر، بۆ ماوەی چواردە مانگ، لە خزمەت پایەبەرزتاندا لە ســابلاخ، خەریکی خزمەتگوزاریی جەنابتان بووم، ئێستاش هەر وابزانن لە سابلاخم و لە بارەی منەوە پەژارە نەبن و لە ســایەی خواوە، بەندە، بە ســەلامەتیی، بە شەرەفی دیدەنی و دیداری جەنابی کاکی بەڕێزم گەیشتووم و پەناش بە خوا، لەمەودوا دڵئێشانێک ڕوو نادات.

لە بارەی خەرجیی ماڵەوەمان، هەرچەندە بەهۆی میهرەبانیی هەمەلایەنەی جەنابتانەوە، بێ خەرجیی نەبوون و نابن، بەڵام بۆ ئەوەی لە ڕووی پۆشاک و قەند و چایی و شتی ترەوە، کەموکوڕییەکیان نەبێ، با «محەمەد ئەمین»ی کوڕم، کە بەلای خوشــکەکەمەوەیە، ئەمــر بفەرموون بچێتە خزمەت ئاغازادەی مــەزن: جەنابــی محەمەد کەریم خان[٣] و لەو پارەیەی بەلایانەوەیە، بــە پەلە (٣ – ٤) تمەنێک بداتە خوشــکم و خودی جەنابی بەخشندەشــتان، پسووڵەیەکی لە بەرامبەر پارەکەدا لێ وەربگرن. دیسانیش ئەمر بفەرموون با ســوڵتان کوێخا ئیبراهیم، شــەوان بچێتە ماڵی ئێمە و لەوێ بخەوێ. ئیتر پێویست ناکات هیچی ترتان عەرز بکەم.

ســاڵی پاریش ماڵەوەمان نەخۆش کەوتبوو، هەتا دەهات لاواز و بێ هێز دەبوو. جەنابی خۆشــتان چەند جارێک لوتفتان فەرموو (دژەتاڵ) و هەندێ شــتی ترتان بۆ ڕاسپاردبوو. ئەو کاتەش کە بەندەتان بــەڕێ دەکەوتم، هەر باســی بێ هێزیی خــۆی دەکرد. منیش هەرچی جارێ بەخزمەتتان گەیشــتووم، نەخۆشییەکانیم بە وردیی عەرزکردوون و ئەو دەرمانانەش کە دەبوایە لەسەر ئەمری جەنابتان بەکاریان بهێنێ، نازانم تا ئێســتا ئامادەکراون، یا نا؟ داواکارم ئەو دەرمانانەی بۆ چارەی دەســت دەدەن، لوتف بفەرموون لە ڕێگەی (کاکەمەم) ەوە بیدەنێ.

هەرچەندە شایانیشــی نییە، بەڵام هەر بۆئەوەی نامەکەم تەنیا نەبێ، چواردە دانە کارت پۆســتاڵ-م لە پاکەتێکدا پێچایەوە و پێشــکەش حزووری موبارەکتانی دەکــەم. لەبەرئەوەش لەم پەلە پەلەدا، لە گەیشتنی ئەمانە دڵنیا نەبووم، بۆیە جارێ زیاترم پێشکەش نەکردن. بەڵام جەنابی هێژا: مەلا عەبدوڵڵا بڕیاری داوە لەمەودوا هەر جارەی چەپکێ وێنەی گەورە و کارتی چاک و نایاب، کە شایانی بەڕێزتان بن، بە ناوی دیارییەوە، بە پۆســتدا ڕەوانە فەرمووەو ئێســتاش کە هیچ یەکێک لەمانەتان پێنەگەیشتوون، ئەوا لەم بارەدا بەندەتان وای بە چاک زانی لەم پەلە پەلەشــدا شــتێک لەبارەی ئەم قســانەوە، لەگەڵ جەنابیاندا باس نەکراوەو جارێ پەناش بۆ شــتێک نەبراوە، تا بزانین لە داهاتوودا بە پشــتیوانی خوای مەزن، چ چارەنووســێکی لە پشتی پەردەی غەیبەوە، دیاری فەرمووەو گەڵاڵەی ئاییندەی ئێمە، لەلایەن هەڵســوڕێنەرانی قەزاو قەدەرەوە، بە چ جۆرێکیان داڕشتووە! هیوادارین بە پشتیوانی خوا، بەم زووانە ئــەم لەمپەری غەریبایەتییە بە یەکجاریی لابچێ و بە کامی دڵ و بە گوێرەی ئارەزوو، ئەم چەند ڕۆژەی تەمەن، بەدەم دوعاگۆکردن بۆ سەلامەتیی جەنابتان، بەبێ پەژارە بەسەر بەرین و بێگومانیش هەمیشە و هەموو کات، جەنابتان لە هەواڵی ئەم بەندەیەتان و دەنگوباسی کاکیشم بێبەش ناکەم و گەرەکیشمە لە هیچ کاتێکدا، درێغیم لە مەرج و ئەرکی نۆکەرایەتیمدا نەکردبێ.

لە پاڵ ئەمانەشدا، پێویست بوو پوختەیەکی دەنگوباسی دنیای شارستانیی و پێشکەوتووی ئیسلامیی ئێرەتان بەرچاو بخەم، تا لەگەڵ داروباری ئێستای خۆماندا سەرنجی بفەرموون، کە هەرێمەکەی ئێمە و

ئەم (کورد)ە نارێک و شپرزە و کڵۆڵەی ئێمە، چۆن لە چاڵی نەزانیندا گیری خواردووە و لە تاریکیدا، سەرلێشــێواو ماوەتەوە!. بەو هۆیەشەوە کە روونکردنەوەی ئەم شتانە، بە نووسین نەدەتوانرا، بۆیە بۆ ئەمە، ســێ رۆژنامەتان پێشــکەش دەکەم. هەرچەندە تورکی ئێرە، لەگەڵ تورکی[٤] ئەوێدا، جیاوازیی هەیە، بەڵام سوپاس بۆ خوا، بەهۆی سەلیقەی هەمیشە ئامادە و زیرەکیی زگماکیی خوداپێداویتانەوە، بەلاتانەوە گرنگ نابێ.

دوای ئەمانــەش، کە بێگومان خۆتان پێشــینەتان لــەم بارەیەوە هەیە و دڵنیــان، دەبێ لە بیری ئامادەکردنی جەنابی (ئاغازادەی چکۆلە)[٥]دا بن، تا بەڵکو بە پشتیوانی خوا، لە نێوان ئەو کرمانجانەدا ون نەبێ و هەرچۆنێک بێت، دەبێ لە تەورێز خوێندەوارییەک بەدەست بهێنێ، تا وەک ئێمە چاوبەستراو نەمێنێ و سوپاسیش بۆ خوا، کە سێبەرێکی وەک جەنابی موبارەکتانی بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانیان بەســەرەوە هەیــە و خواش پلەو پایەی پێ دەبەخشــێ. ئەی ئیتر بۆچی بــۆ خوێندن نەچێ و نەبێتە مرۆڤ!؟ کە ئەگەر ئێســتاکە نەچێ، لە دواییدا، واتە: لە نێوان ئەم یەک دوو ســاڵەدا، بۆی دەردەکەوێ کە دەبێ بەرد بە ئەژنۆیدا بدات[٦]. حەزرەتی پایەبەرزیشــتان بۆ دەبێ بە قســەی ئەو بکەن و گوێی لــێ بگرن؟!. لەبەرئەوە بە هەر شــێوەیەک بــێ، دەبێ هەتا زووە، چاکتر وایــە رەوانەی بفەرموون. لە راستیشدا من لاپەرەسەنیم کرد و داوای لێبووردن دەخوازم و لەبەر بەرژەوەندیی، پرکێشیم کرد و چاکەی مەملەکەتیش، خودی دەسەڵاتدارانی دەیزانن[٧].

ســەبارەت بە ماڵەوەی نۆکەریشتان، پێویســت بەوە ناکات لەم بارەیەوە شتێ روون بکەمەوە. بەڵام خــودی حەزرەتی پایەبەرزتان ئاگادارن، لــە کاتی بەرێکەتنمدا، بۆ ئەوەی ماڵەوەمان و خوشــکەکەم نەگرین و دڵتەنگ نەبن، تا ئەو کاتەی بۆم دەردەکەوێ کە ئەوانەی تر گەیشتوون، یا نا! لە ڕاستیشدا بەندەتان زۆرم خەمی نەگەیشتن و لەناوچوونی ئەوانە خواردووە.

یەکێکیش لەو کارتانە، کە بە ناوی جەنابی (ئاغا چکۆلە)وە پێشکەشــم کردووە، لوتف بفەرموون پێی بگەیەنن و بەمەش بەندەتان سوپاسگۆ و پێزان دەبێ.

لە پاڵ ئەمانەشدا داواکارم دەنگوباسی کێشەی گوندی گۆگتەپە، تا ئێستاکە بە کوێ گەیوە! پێمی بفەرموون، تا پەژارەم برەوێتەوە. بە پشتیوانی خوا تا ئێستا دەبێ مشتومڕی لەسەر دوایی پێهێندرابێ و گەڕابێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆتان. ئەگەر جەنابی بەڕێز (شەمسە)ش لەوێیە، رێز و بچوکیی و عەرزی ئەدەب لە خزمەتیاندا پێشــکەش دەکەم. خوا یاربێ مەســەلەی (کانی مەملی)ش خراوەتە بەر باس و دانوساندن.

هەر بەم ناونیشــانەش نامەم لە ســابلاخەوە بۆ (میاندواو) رەوانە بفەرموون. بە پشتیوانی خوا بە جەنابیان دەگات و ئەوانیش بۆمی رەوانە دەکەن. منیش کە نامە دەنووســم، دەیســپێرمە ئەوانەی لە سابلاخەوە دێن و دەیاننێرمەوە خزمەت قازی لەتیف و حاجی ساڵحیش بچێ وەریان بگرێ و بەخزمەت جەنابتانی بگەیەنن.

بەندەتان

محەمەد ساڵح

## نامەی دووەم:

نامەی عەبدولڵلابەگی میسباح دیوان (ئەدەب)

بۆ: میرزا محەمەد ساڵح

بۆ خزمەت حەزرەتی سەروەرم

میرزا محەمەد ساڵح – سەروەریی زیاتر بێت

١٨ی جەمادی دووەمی ١٣٣٢ هیجری

١٩١٤/٥/١٤ زایین

سەرەتا سوپاسی ئەم نیعمەتە بێ وێنەیەی خوای مەزن دەکەین، کە دەرفەت و کەڵکەڵە و ئارەزووی ئەم سەفەرە خێر و سەرکەوتووەی لا دروست کردین و جەنابتانیشی بۆ ئەمە رێنوێنیی کرد، کە دیارە بە هۆی دڵ و دەروون پاکیتانەوە بووە، تا ئەم سەفەرەتان بۆ کۆشکی بەختەوەریی: ئیسلامبول (ئەستەمووڵ) بۆ بڕەخسێنێ و بە دەمیشییەوە شەرەفی دیدار و دیدەنی جەنابی بن و بنەچە سوپاسکراو: حاجی مەلا عەبدوڵلا ئەفەندی براتان (خوا بیپارێزێ) بکەن، کە ساڵانێکە لە تاو ئارەزووی دیداری ئێوە، هەر بە تاسەتانەوە هەڵدەقرچێ و پێی شاد دەبێ و هاوکاتیش ئەوەندەی هەڵتان بۆ هەڵدەکەوێ، گەشت و گوزار و سەیرانی گیانبەخشی هەر سێ شاری (ئاستانە)، یان بە واتەیەکی تر: (قوستەنتەنیە) دەکەن، کە بریتین لە (ئیسلامبول) و (بەگ ئۆغڵی) و ئۆسکۆدار) و بەدیتنیشیان بەختەوەر و دڵشاد دەبیت.

لەوێشەوە کە سەردانی ئیسلامبول، لەو سەیران و گەشتانەیە، کە وەک مانگی مایەی رۆشنایی چاوو روناکایی گۆی زەوی دێتە ئەژمار، بێگومان خۆتان بەهای ئەم لایەنانە دەزانن و سەیران و دیتنی هەندێ لەو جوانییە پڕ لە شادی بەخشانە، لەوە بە چاکتر دەزانن، کە کاتەکانتان لە ماڵەوە بەسەر بەرن.

لە ناو ئەمانەشدا، سەردانی چەندان بارەی (بوغاز) لەدەست مەدەن و رۆژانەش هەر بە سەیری (بوسفۆر)ی تێپەڕێنە. (بۆسفۆر)یش واتە هەمان زەریاچەی گەردن و مل ئاسا، کە (زەریای رەش) بە زەریای (داردەنیل)، یان (زەریای مەرمەڕە)، یان (زەریای سپی) بەیەک دەگەیەنێ و هێڵی جیاکەرەوەی نێوان هەرسێ شاری (ئاستانە)یەو لە هەمان کاتیشدا، ئەو سنوورە ئاوییەی نێوان هەردوو بەشی (ئاسیا) و (ئەوروپا)[8]یەو دەبێ تێر لە سەیرکردنی نەخۆیت، چونکە ئەو رۆژەی کە رێبوار پێدەنێتە ئەمجۆرە جێگا تایبەتانە، ئاستی خوێندەوارییی، هەرچەند بالآبێ و سەرنجیشی چەند تیژ و ورد بێت، کەچی هێشتا وەک ئەو کەسە وایە، کە نابینا، یان چاوبەستە بێت.

بۆیە بۆ کەسێکی وەک جەنابتان، کە خۆتان خاوەن قەڵەم و نووسین و لێکدانەوەن، لە سەرتان ئەرک و پێویستە، کە ئەگەر هەر ڕۆژێک بۆت رێکەوت، بە (...)[9] بگەڕێیت، یان ئارەزووی گەشت و گەڕانت نەبوو، ئەوا هەر دوو، یان سێ ڕۆژ جارێک، دوو سەعات، یان دوو سەعات و نیو بەر لە خۆرئاوابوون، بە سواری ئەو ئامێرە بچووکانەی کە تایبەتن بە گەشت و گەڕان، لە خزمەت جەنابی حاجی مەلا عەبدوڵلا ئەفەندیدا، یان یەک دوو کەسی تری شارەزاو ئاگاداردا، کە جێی متمانە و بڕوای ناوبراوبن و لەم چەند ساڵەی مانەوەی خۆیدا لە ئیسلامبول بە دەستپاکیی و دیانەتەوە، تاقی کردبنەوەو هەڵیبژاردبن، بچنە سەردان و گەڕان و بە چاوی کراوەو سەرنجەوە، لەو هەموو کۆشک و تەلارە رەنگاو ڕەنگە ورد ببنەوە، کە

ســـەر لە ئاســـمان دەسوون و ئەو هەموو دارو درەختە بەردار و گوڵ و باخە لە ئەژمار نەهاتووە ببینن، کە بە درێژایی ڕۆخ و لێواری زەریادا نێژراون و چێژ لە دیتنیان وەربگرن و لە بەرامبەریاندا سوپاســـی پـــەروەردگار بکەن و بڵێن: ئەی ئەو پەروەردگارەی کە کەس نەیدیویت، ئێمەی (کورد)، لەگەڵ خەڵکی ئەم وڵاتە، هەردوولامان، کە دەستکردی خۆتین، ئەی بۆچی بەشی ئێمەی داماو، هەر کلۆڵیی و سزادان بێ و بەشـــی خەڵکی تریش، کە هەر دەســـتکردی خۆتن، چ ســـەیرانگەیەکت پێ بەخشـــیون؟. ئێمەت چـــۆن خولقانـــد و چیت بە ئێمە ڕەوا بینی و بە خەڵکانی تریش، چیت پێ ڕەوا بەخشـــین؟ چ داماویی و تەنگانەیەکت بە ئێمە بەخشـــی و چ ژیانێکی پڕ ســـەروەریی و شکۆمەندیت بە خەڵکی تر بەخشی؟. ئێمە خراینە بەر چ تەقەڵلایەکی دژوار و خەڵکانی تریش، لە چ ژیانێکی خۆش و ئاساندان؟ ئێمەت لە چ دواکەوتوویی و خەڵکانی تریشـــت لە چ ژیار و پێشکەوتندا ئەفراند؟ چ ئاکارێکی ڕەق و درێو، بەشی ئێمە و بەشـــی خەڵکانی تریش، چ نەرمیی و لێبووردەییەک؟. بەشـــی ئێمە، چ نزمیی و سووکایەتی و بەشـــی خەڵکی تریش، چ ســـەروەریی!. بەشی ئێمە، چ کەللە ڕەقییەکی زگماک و بەشی خەڵکی تر، چ خۆشەویســـتییەکی سروشتی؟! بەشـــی ئێمە ، چ ناکۆکی و بەشی ئەوانیش، چ تەباییەکی گشتیت پێ ڕەوا فەرموون؟! الحکم للە واحد القهار.

دەبێ ئەوەش بزانیت کە ئەم هەموو حەســـرەتە، بە دوای ســـامان و دەســـەڵاتدا، ڕووکەش و ڕواڵەت نییە، چونکە ئەمە لە هەموو دنیادا هەیە و زۆرە. بەڵام ئەم حەســـرەتە و مخابنە، کە ڕۆژ و شـــەو، لە قوڵایی دڵمدا دەکوڵێ، بۆ ئەو جیاوازیی و بەراوردەی نێوان دنیای پێشکەوتن و شارستانێتی هەمەجۆرەی میللەتانی ترە، لە چاو ئەم (کورد)ە کەمەدا[10]،کە لە دواوە ماوەتەوە و لە هەموو جۆرە پیشەســـازیی و داهێنانێکی نوێ چێژ و کام لە زانســـت و هونەر وەرگرتن بێبەشـــە، کـــە هەڵبەتە لەم ماوە کورتەی مانـــەوەی خۆتاندا، ئەمەتان بـــۆ تاقی بۆتەوەو کەم تا کورتێک، دنیای ئێرەتـــان لە چاو دنیای ئەوێدا بەراورد کردووە.

ئەگەرچی خۆشـــتان پێشتر شـــارەزاییتان لە دارو باری ئێرەش هەیە، بەڵام بە گوێرەی ئەو قسەیەی کە دەڵێ: (قسە، قسە دێنێ)، منیش هەر بەدەم نووسینەوە، ئەمەم بە یاددا هات، تا لایەنێکی ژیانی (کـــورد) بە یـــادی جەنابتان بهێنمەوە.. بۆ نمونـــەش: ئەگەر لای ئێمە، خێزانی یەکێکی ســـامانداری دەگمەن (جیاواز لەو خاوەن زەوی و زار و داراییە لە ڕادەبەدەرانە)، دوای یەک ســـاڵ ئازار چەشـــتن بە دەست نەخۆشییەوە، بیەوێ بچێتە لای پزیشک، یان بە ناوی میوانییەوە سەردانی جێگەیەک بکات، کە ماوەی نێوانیان نزیکەی پێنج — شـــەش فرسەخێک دەبێ، ئەوا لەگەڵ ئەوەشدا کە ئافرەتەکەی، لەسەر خواست و ئارەزووی خۆی، بەپێی پەتی لەگەڵ خۆیدا دەبات و دەبێ ئەو قۆناغە ڕێیەش هەر بە پیادە بڕوات، بەڵام ســـەرباری ئەوەش، دەبێ بەپێی داب و بەلای کەمەوە، هەندێ دیارییش بۆ خزم و خوێشان و دۆستانی، ببات، کە ئەمانەش هەر بە ئافرەتەکەی، وەک کارەکەرێک هەڵدەگرێ!.

## پەراوێزەکان:

١-شوێنی ئەو واژەیە دڕاوە.

٢-مەبەستی لە حاجی مەلا عەبدوڵڵای برایەتی، کە لەو کاتەدا سەری خۆی هەڵگرتووە و لە ئەستەموول دەژی.

٣-ئەمیش هەر کوڕی عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان-ە (دووەمین کوڕێتی)

٤-مەبەستی زمانی تورکی ناو قەڵەمڕەوی عوسمانی و ناوچەی موکریانە.

٥-ئاغاچکۆلـــە: مەبەســـت لـــە (ئەحمەد)ی کوڕی (ئـــەدەب)ە، کە (ئاغاچکۆلـــە)ی پێ وتراوە و ســـێیەمین کوڕی (ئەدەب)ە.

٦-لە کوردیدا دەڵێن: کاڵەک بە ئەژنۆ دەشکێنێ.

٧-ئەمە پەندێکی فارسییەو لە دەقەکەشدا ئاوایە: ×لاحی مملکت خویش خسروان دانند.

٨-لە دەقەکەدا ئەو شوێنانە لە کەوانەدا بوون.

٩-شوێنی ئەو واژەیە لە دەقەکەدا، دڕابوو.

١٠-لە دەقەکەدا (مشتێک کورد) نووسراوە.

# چەپکێ شیعری ئیسپانی

# خۆشویستنی تۆ دژوارە

فیدریکۆ گارسیا لۆرکا
لە فارسییەوە: سەروەر عومەر

## غەزەلی عەشقێکی نائومێد

شەو نیازی هاتنی نییە!
کەواتە نە تۆ توانای هاتنت هەیە،
نە من هێزی رۆیشتن
بەڵام من ئەڕۆم
سەرەڕای پێوەدانی دووپشکی خۆر بە نێوچەوانمەوە
بەڵام تۆ دێیت
بە زمانێکی گڕگرتوو بە دڵۆپە سوێرەکانی باران
رۆژ نیازی هاتنی نییە
کەواتە نە تۆ توانای هاتنت هەیە
نە من هێزی رۆیشتن
بەڵام من ئەڕۆم
تا مێخەکی هەڵپاچراوم بۆ بۆقەکان فڕێ بدەم!
شەوو رۆژ نیازی هاتنیان نییە
تا لە پێناوتا بمرم و
لە پێناوما بمریت!

## به راستی...

خۆشویستنی تۆ دژواره،
بەو شێوەیەی من خۆشم ئەوێی
ئارەزووم بۆ عەشقی تۆ ئازارم ئەدا!
دڵ و کڵاوەکەشم!
کەواتە کێ ئەم هەودایەم لێ ئەکڕێ؟
یان لۆکەی ئەم دڵتەنگییە سپییەم،
تا دەستەسڕێکی لێ دروست بکات!
جەخار!
دژوارە خۆشویستنی تۆ
بەوشێوەیەی من خۆشم ئەوێی!

## ئاوێنەی گەورە

ئێمە لەژێر ئاوێنەیەکی گەورەدا،
رۆژگار تێئەپەڕێنین!
مرۆڤ،
سەرتاپا شینە!
هۆزانا!

## گۆرانییە تازەکان

ئێوارە ئەڵێ: « تینووی سێبەرم!»
مانگ ئەڵێ: « تینووی ئەستێرەم!»
سەرچاوە لە حەسرەتی لێوارەکاندا دەسوتێت
ئاهەکان بەدوای باوەن!
من تینووی عەتری زەردەخەنەم!
تینووی گۆرانییە تازەکان،
بێ مانگ و سەوسەنە سپییەکان،
بێ عەشقە بێ گیانەکان!
گۆرانییەک بۆ سبەینێ کە گۆماوەکانی ئایندە بشێوێنێ و
لیتەو شەپۆلەکانیان پڕبکاتەوە لە ئومێد!
گۆرانییەکی درەوشاوە ناسکەکان، لێوانلێو لە ئەندێشە،
پاکیزە لە خەم و دڵتەنگی، پاکیزە لە خەونە پووچەکان!

گۆرانییەک کە باڵای غەزەل نەبێت
بێدەنگیی خۆی پڕنەکاتەوە لە پێکەنین!
وەک دوو کۆتری کوێری فڕیو بەرەو نادیار...
گۆرانییەک بگاتە رۆحی شتەکان، رۆحی بایەکان و
دواجار لە شادومانی هەمیشەیی دڵێکدا
ئارام بگرێت!

## گیتار

جامی سپێدە شکاوە!
هەنووکە دەستپێکی شیوەنی گیتارە!
شکۆی تیا نییە خامۆشکردنی
بێدەنگکردنی ئەستەمە!
بەردەوام ئەگری!
هەروەک چۆن ئاو ئەگری!
هەروەک چۆن با- بەسەر بەفری باریودا ئەگری!
بێدەنگکردنی ئەستەمە!
بە یادی شتە دوورەکان ئەگری
لمە گەرمەکانی باشوور،
کە تینووی گوڵە سپییەکانن!
ئێوارەی بێسبەینێ دەگری
تیری بێنیشان و
یەکەمین چۆلەکەی مردووی سەرچڵ...
ئاه، گیتار
ئەی دڵی زامدار تا مردن
بە پێنج شمشێر.

## سات

کاتێک مردم،
لەگەڵ گیتارەکەمدا بمنێژن لە گۆڕەپان!
کاتێک مردم،
لە بانوێنێکدا بە خاکم بسپێرن، ئەگەر ویستتان!
کاتێک مردم.

## ماڵئاوایی

ئەگەر مردم
باڵکۆنەکەم بە کراوەیی بهێڵەرەوە
کوڕەمنداڵەکە پرتەقاڵ ئەخوات
من لە باڵکۆنەکەمەوە ئەیبینم
جوتیارەکە بەداس گەنمەکەی ئەدوورێتەوە
لە باڵکۆنەکەمەوە گوێم لێیەتی
ئەگەر مردم...
باڵکۆنەکەم بە کراوەیی بهێڵەرەوە.

## دەستەکانم گەڵاکان ئەوەرێنن!

لەشەوێکی تاریکدا ناوت ئەهێنم
ئەستێرەکان
بۆ دیداری مانگ هەڵدێن و
سێبەرە پیوارەکان
دەخەنە خەو
خۆم بەتاڵ ئەبینمەوە لە سازو خۆشحاڵی
(سەعاتی شێت
کە زەنگی چرکەساتە مردووەکان لێئەدا...)
لەم شەوە تاریکەدا ناوت ئەهێنم!
ناوێک کە زایەڵەیەکی هەمیشەیی هەیە!
بڵندتر لە تەواوی ئەستێرەکان
پڕشکۆتر لە نمنمی باران!
ئایا تۆم وەک ئەو ڕۆژە پاکانە
هەروا خۆشدەوێت؟
کاتێک تەم و مژ نەمێنێت،
کام دۆزینەوەی تازە
لە چاوەڕوانی ئێمەدایە؟
ئایا لەمە بێئەندێشەتر ئەبم؟
دەستەکانم وردەگەڵاکانی مانگ
ئەوەرێنن...

## گۆڕان

خەرمانی ئاگر
لە کێڵگەی خۆرنشینداا
لە شاخی کەڵەکێوییەک ئەچێت
دەربەند بێ مەرج ئازاد ئەبێ
شنەباییش لەودیو گردەکانەوە
راکردنێکی دووبارە
دەستپێئەکاتەوە!
هەوای تەم و مژاوی ئەدرەوشێتەوە
وەک چاوە زەردەکانی پشیلەیەکی
غەمگین!
من بە نیگام
لە حەساری چڵ و رووبارەکان
تێئەپەڕم
شتێک لە ناخی مندا ئەگاتە جێ
دێڕێک لە دوای دێڕێکی دیکە
لە سەرەوژێری خۆرنشینی نێوان
قامیشەڵاندا
چەند نامۆیە
کە بە فیدریکۆ بانگم ئەکەن!

## سپێدە

دڵی من
لەگەڵ هەڵاتنی هەر سپێدەیەکدا
باس لە خەونە دوورو عەشقە تاڵەکان ئەکات!
رووناکی خۆر
پەیکی مەخابنە بێسنوورەکانە
خەمێکی کوێر لە قوڵایی رۆحدا!
شەو بەرگی رەشی لائەدات
تا رۆژ پانتایی پڕ لە ئەستێرە داپۆشێ!
چی لەم دەروونە شەوزەدەیە بکەم
لەم دەشتەو لە ئابڵوقەی سپێدەدا؟
ئەگەر فانۆسی چاوەکانی تۆ بکوژێتەوەو
جەستەم هەست بە گەرمایی نیگات نەکات

چی بکەم؟
بۆچی تۆم لەو شەوە رۆشنەدا لەدەستدا؟
ئەمڕۆ سینەم
وەک ئەستێرەیەکی مردوو وشکە!

## شەو

مۆم
فانۆس
گوڵەئەستێرەیەک!
کاکێشانێک لە تیرەکان
دەلاقە بچووکە زێڕینەکان ئەلەرزن و
لە سپێدەدا
خاچەکان
دەستە دەستە دائەکەون!
مۆم
فانۆس
گوڵەئەستێرە!

## غەرناتەی 1850

لە ژوورەکەمەوە
گوێ لە ئاوازی هەڵقوڵینی سەرچاوەکان ئەگرم!
سەری پەنجەی مێو
شەبەنگێ لە هەتاو
گۆشەکانی دڵم ئەلاوێننەوە!
شنەی جولای
هەورەکان ئەڕەوێنێتەوە
من خەون ئەبینم
لە نەغمەی سەرچاوەدا نەخەوتووم!

## مردن لە دەمەو بەیاندا

شەوێک بە چوار مانگەوە
درەختێک و
سێبەرو باڵندەیەکی تەنیا
لە جەستەو گیانی خۆمدا
بەشوێن مۆری لێوەکانی تۆدا ئەگەڕێم!
ئاوپڕژێن با- پڕێەکات لە ماچ

بێئەوەی لە باوەشی بگرێت
منیش
ئەو «نا» یەی تۆ پێشکەشت کردوم
لەسەر لەپی دەستم ئەیبەم
وەک لیمۆیەکی سپی!
شەوێک بە چوار مانگەوە
درەختێک و
سێبەرو باڵندەیەکی تەنیا...

## ئاوازی ماڵئاوایی

ئاوازی ماڵئاواییم لە چوار ریاندا ئەچڕم و
بە نێوان رۆحی خواوەندا تێئەپەڕم!
یادەوەرییەکان و
سەعاتی غەم زیندوو ئەکەمەوە!
لە ئاوازەکەمدا
-لە ئاوازە سپییەکەمدا-
ئەگەمە باغێک و
وەک ئەستێرەی بەرەبەیان
هەڵئەلەرزم!

## گەڕانەوە

لەبەر باڵەکانم ئەگەڕێمەوە!
بێڵە بگەڕێمەوە!
ئەمەوێ لەسەر زەویی سپێدە بمرم!
لەوڵاتی «دوێنێ»کاندا!
لەبەر باڵەکانم ئەگەڕێمەوە
بێڵە بگەڕێمەوە
ئەمەوێ دوور لە چاوی دەریا
لەسەرزەویە بێ سنوورەکان بمرم!

## گۆرانییەکی شیرینی شکۆمەند

مەهێڵە شکۆی چاوە پەیکەرئاساکانت
لەگەڵ عەتری ئەو گوڵە سوورەی شەوانە
لەگەڵ هەناسەتا بەسەر گۆنامەوە ئەنیشێتەوە لەدەست بدەم!
ئەترسم لە تەنیابوون لەم کەنارەدا،
وەک درەختێکی بێبەر

سووتاو لە حەسرەتی پەڕەی گوڵێک و چرۆیەکدا
تا گەرمایی پێببەخشێ!
ئەگەر گەنجی نادیاری منی،
ئەگەر زامی هەڵدڕاو یا خاچی گۆڕی منی،
ئەگەر من سەگێکم و تۆ خاوەنی منی،
مەهێڵە ئەو چڵەی لە رووباری تۆم وەرگرتووەو
گەڵاپاییزییەکانی خەمم پێوە نووساندووە،
لەدەست بدەم!

## رۆیشتن

هێندەی کە ئەڕۆی،
قوڕاوی ئەبی!
ئاوی رەوان ئەستێرەکان نابینێ!
لە رۆیشتنا بەتاڵ ئەبیتەوە
هێندەی کە رائەوەستی،
خەون ئەسازێنی!

## دوو مەلەوان لە کەناردا

1

ماسییەک لە دەریای چین لە دڵی ئەودایە
هەندێکجار ئەکرێ،
نوقوم بوونی
لەدەریای چاوەکانیدا ببینرێت!
مەلەوانە
میوەکانی لە یاد نەماوە!
چاوی لە دەریا بڕیوە...

2

زمانێکی هەیە لە سابون،
وشەکان ئەشواتەوە
بێدەنگە!
دەریایەکی بەردین،
چیایەک لە سەدەف،
سەد ئەستێرەو

کەشتییەکەی ئەو!
میندبەری پاپی بینیوەو
سینەی زێڕینی کچانی کوبا!
چاوی لە دەریا بڕیوە...

## عاشقانە

1

وشەکانت لە دڵی مندا
لە بازنەکانی سەر رووی ئاو ئەچن!
ماچت لەسەر لێوەکانم،
لە باڵندەیەکی دەم با- ئەچێت!
چاوە رەشەکانم لەسەر ئەندامەکانت،
ئاوپرژێنە هەڵقوڵیوەکانی دڵی شەو بەبیر دێننەوە!

2

وەک ئەستێرەی زوحەل
لەسەر خولگەی تۆ بەنێو بازنەکاندا ئەگەڕێم!
لەخەونەکانمدا
لەسەر خولگەیەک ئەسووڕێمەوە! عەشقی من!
نە ئەڕۆمە ناوەوە
نە ئەگەڕێمەوە!

## تێپەڕینی سیگۆئریا

کچە پرچ رەشەکە
لە دەوروبەری ماری سپی تەمتوماندا تێئەپەڕێ،
سووڕانەوەی پەپوولە رەشەکان!
زەوی لە نور ئاسمان لە زەوی!
پێ بە زنجیری ترپەترپێکی نادیار...
دڵێکی هەیە لە زیو
خەنجەرێک لە دەستی راستیدا!
زەوی لە نور ئاسمان لە زەوی!
ئاوا پەرێشان بۆکوێ ئەڕۆی؟
سیگۆئریا!
کام مانگ
بەسەر خەمی ژاڵەو نارنجتا ئەدرەوشێتەوە؟
زەوی لە نور ئاسمان لە زەوی!

## لایلایە بۆ خەونی ئاوێنە

بخەوە!

بخەوەو لە نیگا دەربەدەرەکان مەترسە

بخەوە!

نە پەپوولە ئازارت ئەدا

نە وشەو

نە ئەو رووناکییەی لە کونی کلیلەوە ئەدرەوشێتەوە!

بخەوە!

تۆ لەدڵی من ئەچی!

لە باغێک ئەچی کە دڵی من تیایدا چاوەڕوانە!

ئاسودە بخەوە...

تەنها ئەوکاتە کە دواهەمین ماچ لەسەر لێوەکانم ئەمرێت،

هەستە لەخەو!

## یەکەم

ئادەم و حەوا...

مار لەجیاتی بەرد،

بە سێوێک ئاوێنەی شکاند!

### سەرچاوەکان:

١- تمام کودکان جهان شاعرند!- دفتر چهارم- ، ٢- جهان در بوسه های ما زاده می شود - دفتر ششم-٣- نه، نمی خواهم ببینمش. برگردان/ یغما گلروئی

### تێبینی:

لە هەندێک جێگەدا لە وەرگێڕانی شیعرەکاندا پشتم بە وەرگێڕانە عەرەبییەکەی سەعدی یوسف و عودەی ئەلحەریش بەستوو.

# گوڵێکی سوور بۆ ئەمیلی

ویلیام فۆکنەر
لە فارسییەوە: جەبار سابیر

1

وەختــێ کــە خاتوو ئەمیلی گریرســن مــرد، هەموو خەڵکی شــارەکەی ئێمە دوای تەرمەکــەی کەوتن. پیاوەکان لەڕووی ڕێزو حورمەتــەوە کە گوایا لە داڕمانی بینایەکی یادگاری دێریندا لە خۆیاندا هەستیان پێدەکرد، ژنەکانیش زیاتر لەڕووی فزوڵییەتــەوە دەچوون بۆ ســەیری ناو ماڵەکەی کە جگە لــە خزمەتکارێکی پیر، کە هەم چێشــتلێنەرو هەم باخەوانیش بوو، لانیکەم دە ســاڵ زیاترە کەس ئەوێی نەدیبوو.

ئەم ماڵە، خانوویەکی چوارگۆشــەی گەورەبوو کە ســەردەمانێک سپی بوو، بە کەپرو منارەو باڵکۆنەکانییەوە کە وەک کاغەزی لولکراوبوو بەشــێوازی ســەنگینی ســەدەی حەڤدەم رازابۆوە، کەوتبووە سەر شــەقامێک کە سەردەمانێک گوڵی سەر سەبەتەی شار وابوو. بەڵام دەستدرێژییان کردبووە سەر گەراج و ئەنبارەکانی پەموو تەنانەت یادگارییەکان و میراتی تایبەتییە گرنگە بەناوبانگەکانیشی لەو ناوەدا پرژو بڵاوبووبوونەوە. تەنها خانووەکەی خاتوو ئەمیلی بوو کە پەرپوتی و داهێزراویەکی بە کەشــم و نازی خۆی لەنێو واگۆنی پەمــوو ترومپای نەوتیدا هەڵدابووەوە. پینەو پەڕۆیەکی ناجۆر، کە تێکەڵی پینەو پەڕۆیەکی تر بووبوو.

وائێســتا خاتــوو ئەمیلی چووبوو بۆ ئــەوەی پەیوەندی بەو مــردووە گرنگ و تواناداارانەوە بکات کە ئێســتا لە گۆڕســتانێکن کە بەبۆنی سەندەل مەستە، لەناو گۆڕی ناســراوو گومناوی ســەربازانی وڵاتەیەکگرتــووەکان و هاوپەیمانانی کە لە جەنگی جفرسۆندا مردوون و ئارامیان گرتووە.

لەناو ژیانی ئەم شارەدا خاتوو ئەمیلی وەکو نەریتێکی دێرینە، یا ئەرکێک، یا وەک خاڵێکی سەرنج، یا وەک جۆرێک ناچاری بۆماوەیی لێهاتووە، ئەمەیش لە ساڵی (١٨٨٤)، لەڕۆژێکدا دەستی پێکرد کە کۆلۆنیل سارتۆریس سەرۆکی شارەوانی، هەمان ئەو کەسەی کە قەدەغەی کردبوو نابێ هیچ ژنێکی رەش پێست بەبێ سەرپۆش بێتە سەر شەقامەکان، میس ئەمیلی لە مێژووی مردنی باوکی بەدواوە هەمیشە لەلایەن ئەوەوە لەماڵیات بەخشرابوو. لەبەرئەوە نا کە خاتوون خێر قبوڵکات، بەڵکو کۆلۆنێل سارتۆریس لە خۆیەوە چیرۆکێکی لق و پۆپداری بۆ دروستکردبوو، بەو مانایەی کە باوکی میس ئەمیلی پارەی زۆری داوەتە شارو شاریش لە چرکەی وەرگرتنییەوە ئاگای لەوەیە کە لەم رێگەیەوە قەرزەکەی بداتەوە. هەڵبەتە ئەم جۆرە چیرۆکانە تەنها مرۆڤی لە وەچەو شێوەی بیرکردنەوەی کۆلۆنێل سارتۆریس دەتوانن لەخۆیانەوە دروستی بکەن و تەنها ژنان دەتوانن باوەڕی پێبکەن.

کاتێک مرۆڤی وەچەی دواتر، بەشێوەی بیرکردنەوەی تازەی خۆی، بوونە سەرۆکی شارەوانی و ئەندامی ئەنجومەنی شار، ئەم بڕیارە هەندێک ناڕەزایی دروستکرد. یەکەم ساڵ بوو، لاپەڕەیەک ئاگاداریی ماڵیاتیان لەڕێگەی پۆستەوە بۆ میس ئەمیلی نارد.

مانگی فێبریوەی هات و خەبەرێک لە وەڵامەکەی نەبوو. ئەوسا نامەیەکی فەرمیان بۆ نووسی و داوایان لێکرد لە دەرفەتێکدا سەرێک لە بارەگای عومدە بدات. هەفتەیەک دواتر خودی ئەفسەر نامەیەکی بۆ نووسی و داوای کرد سەردانێکی بکات، یان ئەوەتا ئۆتومبێلەکەی بۆ بنێرێت. لە وەڵامدا لەسەر پەڕەکاغەزێکی کۆن و بەخەتێکی خۆش و ناسک و رەوان و بە مەرەکەبێکی کاڵ یاداشتێکی تێدانووسرابوو، ناوەرۆکەکەی ئەوەبوو کە ئیتر ئەمان لە ماڵ ناچنە دەر. لاپەڕەی ئاگادارییەکەی ماڵیاتیش هەر بەبێ شەرح و روونکردنەوە لەگەڵ یاداشتەکەدا رەوانەکرابۆوە.

ئەنجومەنی شار کۆبوونەوەیەکی تایبەتی رێکخست. دەستەیەک کارمەند راسپێران بۆ سەردانی. ئەندامانی دەستەکە رۆیشتن و لەدەرگاکەیان دا. دەرگایەک کە هەشت یاخود نۆ ساڵ زیاتریش دەبوو کەسێک پیایدا تێنەپەڕیوە، لەو سەردەمەوە کە خاتوو ئەمیلی وازی لە فێرکردنی شێوەکاری چینی هێنابوو. هەمان ئەو پیرەمێردە رەشەی خزمەتکاری ئەمیلی بوو ئەندامانی دەستەکەی بۆ هۆڵی تاریک و تنووک رێبەری کرد. لەم هۆڵەدا پلیکانەیەک بەناو تاریکاییەکی زیاتردا بەرەو سەر دەچوو. بۆنی گڵ و شێ دەهات. بۆنێکی ساردو شێداری بوو. پیرەمێردی رەش ئەوانی بۆ هۆڵی میوان رێبەری کرد.

هۆڵەکە بە قەنەفەی گران رووپۆشکراو بەچەرم رازابۆوە. کاتێ کە رەشەکە پەردەی یەکێ لە پەنجەرکانی لادا بینیان کە چەرمی قەنەفەکان رێ رێ بووە، کاتێ کە دانیشتن، تەپوتۆزێکی تەنک لەسەرخۆو خاوەخاو لەملاو لایانەوە بەرزبۆوەو لەگەڵ تۆزی خاوو لەسەرخۆ سستی خۆی، لەبەر تیشکی خۆرەکەدا کە لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورێ پێچی دەخوارد. وێنەیەکی قەڵەم کێشی خاتوو ئەمیلی لە چوارچێوەیەکی ئیکلیلی گیرابوو، لەسەر ستاندێکی شێوەکاری دانرابوو.

کاتێ کە خاتوو ئەمیلی هاتە ژوورەوە ئەوان لەبەری هەستان. خاتوو ئەمیلی ژنێکی چکۆلەی قەڵەو کە جلی رەشی لەبەرابوو. زنجیرێکی ئاڵتوونی ناسک تا کەمەری شۆڕبووبۆوەو لەژێر قایشەکەیدا وندەبوو. خۆی بەسەر گۆچانێکی دار ئەبەنووسی سەر خڕو لووس و ئاڵتوونیدا دابوو رەنگە هۆکەی ئەوە بێت ئەگەر قەڵەوی لە کەسێکی تر جوان بێت، بەڵام بۆ ئەم وەکو زلییەکی رووتی دەنواند، وادەهاتە بەرچاو کە جەستەی هەڵئاوسابێت، وەک جەستەیەک کە ماوەیەکی زۆر لە قوڵایی زەلکاوێکی پەنگ خواردودا مابێتەوە. بەهەمان شێوە رەنگیشی سپی و بێ خوێن بوو.

چاوەکانی لەنێوان چرچی گۆشتنی دەموچاویدا ون بووبوو. کاتێ کە ئەندامانی دەستەکە پەیامی

خۆیـــان بەیان کرد، چاوەکانی بەمـــلاو لادا دەجوولاند. وەک دوو پارچە خەڵـــووز وابوون کە خرابێتنە گونکێـــک هەویرەوە. میس ئەمیلی فەرمووی دانیشـــتنی لێنەکردن، هەروا لەناو دەرگاکەدا وەســـتابوو بەهێمنی گوێی گرتبوو، تا ئەو کەسەی کە قسەی دەکرد لەزمان کەوت و لاڵ بوو.

پاشـــان دەنگی تیک تیکـــی کاتژمێرێکی نادیار کە رەنگە بەســـەر بەزنجیـــرە ئاڵـتوونییەیەکەوە هەڵواسرابێت بەرگوێ کەوت. دەنگی خاتوو ئەمیلی وشک و ساردو سڕبوو: (من لە جفرسۆن لە ماڵیات بەخشـــراوم. ئەمە کۆڵۆنێڵ ســـارتۆریس پێی وتووم. رەنگە ئێوە بەگەڕانەوە بۆ دۆسێکانی بەردەستتان بتوانن خۆتان قانع کەن).

(بەڵام خاتوو ئەمیلی ئێمە ســـەیری دۆسێکانی رابردوومان کردووە. ئێمە بەرپرسی یاسایی و رێگە پێدراوی ئەم شارەین. مەگەر ئێوە ئاگادارییەک کە واژۆی عومدەی لەسەر بوو پێتان نەگەیشتووە؟)

خاتوو ئەمیلی وتی: (بەڵێ من کاغەزەکەم پێگەیشـــت. رەنگە ئەو لە خەیاڵی خۆیدا عومدە بێت... بەڵام من لە جفرسۆن لە ماڵیات بەخشراوم).

(بەڵام تۆمارەکان پێچەوانەی ئەمە نیشان دەدات. ئێمە دەبێ لە ڕێگەی...)

(لە کۆڵۆنێڵ سارتوریس بپرسن. من لە جفرسۆن لە ماڵیات بەخشراوم).

(بەڵام میس ئەمیلی).

(لە کۆڵۆنێل ساتوریس بپرسن.) «کۆڵۆنێڵ ساتوریسیش نزیکەی دە ساڵ بوو مردبوو».

(من لە جفرسۆن لە ماڵیات بەخشراوم. تەواو).

پیرەمێردێکی رەش دەرکەوت. (ئەم بەڕێزانە بۆ دەرەوە رێبەریکە).

## 2

بەم شـــێوەیە خاتوو ئەمیلی ئەوانی بە ســـوارو پیادەوە بۆڕدا، هەرچۆن سی ساڵ پێشتر باوکی ئەو کەســـانەی لەسەر کێشـــەی (بو) بۆڕدابوو. ئەم کێشەیە دوو ســـاڵ دوای مەرگی باوکی بوو. ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی مەعشـــوقەکەی، ئەو کەســـەی کە وامان دەزانی هاوسەرگیری لەگەڵ دەکات، ئەمیلی جێهێشتبوو. خاتوو ئەمیلی دوای مەرگی باوکی زۆر کەم لە ماڵ دەهاتە دەرەوە. دوای ئەوەی مەعشوقەکەی جێی هێشـــتبوو، ئیتر زۆر دەگمەن کەس ئەوی دەبینی. چەند کەســـێک لە ژنان ئازایەتیان پیشـــانداو چوونە ســـەردانی، بەڵام خاتوو ئەمیلی میوانداری نەکردن. تەنیا نیشانەی ژیان لە ماڵەکەیدا، ئەو رەش پێستە بوو، کە ئەوکاتە گەنج بوو بە سەبەتەیەکەوە هاتوچۆی بازاڕی دەکرد.

ژنەکان دەیانوت: (باشـــە پیاوێک، چەند باشـــیش بێـــت، دەتوانێ بەتەواوی بە چێشـــتخانەیەکدا رابگات؟)و کاتێک ماڵی خاتوو ئەمیلی بۆگەنی لێهات، ســـەریان نەسووڕما. ئیدی ئەمە نموونەیەکە لە کارەکانی رۆژگارو خێزانی پایە بڵندی گریرسن.

ســـەرەنجام یەکێ لە هاوسێکان، یەکێ لە ژنانی هاوسێ، لای ئێســـتیۆنیزی هەشتا ساڵەی سەرۆکی شارەوانی سکاڵای لە خاتوو ئەمیلی کرد.

سەرۆکی شارەوانی وتی: (ئێستا ئەفەرمووی چیبکەم؟)

خانمەکە وتی: (واباشە فەرمان بدەن بۆنەکە نەهێڵێ. ئەدی شار یاسای نییە؟)

سەرۆکی شارەوانی وتی: (لەو بڕوایەدام ئەو کارە پێویست ناکات. ئەگەری ئەوە هەیە بۆنی مارێ یا مشکێک بێت کە قولەرەشەکەی میس ئەمیلی لە باخچەکەدا کوشتبێتی. من لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ دەکەم).

رۆژی دواتریش دوو سکاڵای تر گەیشتن. یەکیان لەلایەن پیاوێکەوە بوو کە دوودڵ و رارا بۆ شکاتکردن هاتبوو، پیاوەکە وتی: (بەڕێز سەرۆکی شارەوانی بێگومان دەبێ ئێمە لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە بیرێک بکەینـــەوە. مـــن بەش بەحاڵی خۆم حەزناکەم خاتـــوو ئەمیلی ناڕەحەت بێت، بـــەڵام گومانی تێدانییە کە دەبێت لەبارەی ئەم مەســـەلەیەوە بیرێک بکەینەوە.) ئەو شـــەوە ئەنجومەنی شـــار کۆبوونەوەیەکی رێکخســـت. سێ لە ئەندامەکانی مرۆڤی بەتەمەنن و یەکێکیشیان لەوان گەنجتر بوو، لەو کەسە تازانەی کە تازە خەریکە پێدەگەن.

پیاوە گەنجەکە وتی: (زۆر ســـادەیە، ئاگاداری بکەنەوە کە ماڵەکەی خاوێن بکاتەوە، دوامۆڵەتی بۆ دیاری بکەن و ئەگەر نەیکرد...)

ســـەرۆکی شـــارەوانی وتی: (چ دەڵێی کاکە؟ مەگەر دەکرێ ژنێکی بەڕێز بەهۆی بۆگەنەوە تاوانبار بکەیت؟)

ســـەرەنجام شـــەوی دوایی، لەنیوە شـــەودا، چوار مەئمور وەک دز بەلۆژە لۆژ لە چیمەنەکەی ماڵی خاتـــوو ئەمیلییەوە تێپەڕیـــن و چوونە ماڵەکەیەوە. بۆنی ژێر ســـتوون و درزو کون و کەلەبەرەکانیان دەکرد. یەکێ لەوان وەک کەســـێک کە گەنمەشامی تۆوکات لە توورەکەکەی سەر شانی شتێکی ئەڕژاند. دەرگای ژێر زەمینەکەیان شکاندو لەوێ و لە بەشەکانی تری تەلارەکەدا قسڵیان دەڕشت. کاتێ دووبارە بـــە چیمەنەکەدا تێپەڕین یەکێ لـــە پەنجەرەی تەلارەکە کە تا ئەو کاتە تاریک بوو رووناک بۆوەو میس ئەمیلی لێوە دەرکەوت. لەپشـــت سەرییەوە رووناکی دەدرەوشـــایەوە. نیوەی لەشی راست و بێ جووڵە، وەک بتێک، وەســـتابوو. ئەوان وردە وردە بەچیمەنەکەدا تێپەڕین و لە سێبەری ئەو دارو درەختانەی کە بەدرێژایی شەقامەکە ریزبووبوون ون بوون. پاش یەک دوو هەفتەی دواتر ئیتر بۆنەکە نەما.

هەر ئەوکاتەبوو کە بەڕاستی خەڵکەکە کەوتبوونە ئەوەی کە خەفەتیان بۆ خاتوو ئەمیلی دەخوارد. خەڵکی شارەکەی ئێمە بیریان بوو کە چۆن خانم (یات) پوری گەورەی خاتوو ئەمیلی چۆن بەتەواوی شـــێت بوو. خەڵک هەســـتیان دەکرد کە گریرســـنەکان هەندێک خۆیان زۆرتر لەوەی کە بوون خۆیان دانابوو. بۆ نموونە وەک ئەوەی کە هیچ یەک لەو گەنجانە شایانی خاتوو ئەمیلی نەبوون. ئێمە هەمیشە وێنەیەکمان دەهێنایە بەرچاوی خۆمان کە خاتوو ئەمیلیش بە هەیکەلی باریک و سپی پۆش لە بەشی دواوەی ئەوان وەســـتابوو، باوکیشـــی بەشـــێوەی هەیکەلێکی پانی تاریک کە رێبەری فێربوونی ئەسپ ســـواری بوو بەدەســـتەوە بوو بەردەم و پشـــتی تابلۆکەیش هەر خاتوو ئەمیلی بوو، چوارچێوەی ئەو دەرگایە کە بۆ دواوە کرابۆوە ئەوانی وەک چوارچێوەی لەخۆگرتبوو. کاتێ خاتوو ئەمیلی بووە سی ساڵ، ناتوانین بەتەواوەتی بڵێین کە ئێمە رازیو خۆشحاڵبووین، بەڵکو بە دەربڕینێکی باشتر دەتوانین بڵێین ئاهێک بەدڵماندا هاتەوە. چونکە ســـەرەڕای ئەو شـــێتییە بۆماوەییەی کـــە دەمانزانی لە خێزانەکەیاندا هەیە. دەمانزانی ئەگەر بەڕاستی میس ئەمیلی بەختی هەبووبێت، میس ئەمیلی کەسێک نەبوو کە لەقە لە بەختی خۆی بدات.

کاتێ باوکی مرد، تەنها خانووەکەیان لە باوکییەوە بۆ خاتوو ئەمیلی بەجێمابوو. خەڵک خۆشحاڵبوون. چون ســـەرەنجام شـــوێنێکیان دۆزیبۆوە کە بۆ خاتوو ئەمیلی دڵسۆزی تێدا بکەن. تەنیایی و هەژاری ئـــەوی تەمبـــێ دەکرد. ئیتر ئەویش دەیتوانی کەم و زۆر جۆشـــوخرۆش و نائومێدی و بوون و نەبوونی چەند سەنتێک پارە درک بکات.

رۆژێـــک دوای مردنـــی باوکی هەمـــوو ژنەکان خۆیان ئامادەکرد کە بۆ سەرەخۆشـــی و پێشـــنیاز و هاوکاری بچنە ســـەردانی. بەڵام ئەو هەموویانی لەپێش دەرگای دەرەوەدا بینی. جلوبەرگی وەک هەمیشە

ئاســـایی بوو هیچ نیشـــانەیەکی خەفەت بەڕوویەوە نەدەبینرا. بەوانی وت کە باوکی نەمردووە، هەروەها بە ســـەرۆکەکان و دوکتۆرەکانیش کە بۆ ســـەردانی دەچوون و دەیانویست رازی بکەن کە تەرمی باوکی رادەســـتی ئەوان بکات، هەر ئەوەی وت و تەنها کاتێ کە ئیتر نزیک بوو بەیاســـاو بەزۆر لێیسەنن خۆی دا بەدەستەوەو ئەوان یەکسەر تەرمەکەیان بەخاک سپارد.

ئێمە لەو کاتەدا نەماندەوت کە خاتوو ئەمیلی شێتە. ئێمە دەمانزانی کە دەبێ ئەو کارە بکات. ئێمە تەواوی ئەو گەنجانەمان لەبیرە کە باوکی لە خاتوو ئەمیلی تاراندبوون، چونکە ئیتر کەسێک نەمابوو، باوکی دەری بکات. وتمان پێویستە زۆر بە توندی خۆی بەکەسێکدا بنووسێنێت کە تالانی کردوون.... هەر وەک ئەوەی کە هەموو کەس پیایدا دەنووسێت....

3

خاتوو ئەمیلی ماوەیەک نەخۆشبوو. کاتێ کە دووبارە ئەوم بینییەوە، قژی کورت کردبۆوەو شێوەی وەک کچی لەخۆگرتبوو، مرۆڤی دەخستە بیری ئەو فریشتانەی کە لەسەر پەنجەرەی رەنگینی کلێساکان دەیانکێشان، قیافەیەکی ئارام و غەمگینی هەبوو.

تازە لە شاردا قۆنتەراتی دروستکردنی شەقام و رێگاکان دەستی پێکردبوو، لە هاوینی دوای مەرگی باوکی میس ئەمیلییەوە کارەکە دەســـتی پێکردبوو. کۆمپانیای بیناســـازی بە رەش پێست و هێسترو ئۆتۆمبیلەکانییەوە هات. وەســـتایەکیان هەبوو بەناوی هۆمەر بارون، باکوورییەکی زلەی پشـــتێنێکی سەوزی لە پشتو دەنگێکی گڕی هەبوو، رەنگی چاوی لە رەنگی دەموچاوی رۆشنتربوو. منداڵە وردکەی گەڕەک دەســـتە دەستە شـــوێنی دەکەوتن تا بزانن چۆن جنێو بە ڕەشەکان دەدات و ڕەشەکان چۆن بە ئاوازی بەرزو نزم بوونەوەی خاکەنازەکانیان گۆرانی دەڵێن.

هۆمەر بارون بەخێرایی لەگەڵ هەموو خەڵکی شار ئاشنابوو. لەهەر جێیەک، نزیکی چوار رییانەکان، کە دەتبیست دەنگی قاقایەکی زۆر دێت، دەتزانی کە هۆمەر بارون لەناو کۆمەڵەکەدایە. هەر ئەو رۆژانە بـــوو کـــە ناوبەناو ئەومان لەگەڵ میس ئەمیلی لە عەرەبانەیەکی زەردی کرێدا دەبینی کە دوو ئەســـپی بۆر رایان دەکێشا.

ســـەرەتا، ئێمە لـــەوەی کە دواجار میس ئەمیلی دڵی داوە بەکەســـێک دڵمان خۆشـــبوو. بەتایبەت لەبەرئەوەی کە ژنان دەیانوت: (هەرگیز کەسێکی خێزانی گریرسن شوێنی سەگەکەیشی ناداتە کەسێکی باکـــووری، ئەویش بەکرێکارێکـــی رۆژانە کار.) بەڵام جگە لەمەیش، ژمارەیەکـــی تری، لەوان پیرتر کە دەیانوت تەنانەت خەم و خەفەتی زۆریش نابێ ببێتە هۆی ئەوەی کە ژنێکی راســـتەقینە ئەســـڵزادەیی خۆی بســـڕێتەوە. دەیانوت: (بێچارە ئەمیلی، بێگومان دەبێ خزم و خوێشی سۆراغێکی بکەن.) خاتوو ئەمیلی هەندێ کەســـوکاری نزیکی لە ئالاباما هەبوو. بەڵام ساڵانێک پێشتر، باوکی لەسەر بەخێوکردنی خانم یات، پیرێژنە شـــێتەکە، لەگەڵ ئەواندا تێکی دابوو، ئیتر پەیوەندیی نێوان ئەو دوو خێزانە نەماو ئەوان لە ناشتنی تەرمەکەیشدا بەشداریان نەکرد.

هەر ئەوەی کە خەڵک دەیانوت: (ئەمیلی بەسزمان،) چرپە چرپی تریش دەستی پێکرد. بە یەکتریان دەوت: (یەعنـــی پێتانوایـــە کە بەڕاســـتی وابێ؟ هەڵبەتـــە کە وایە.. جگە لەمە چی دی...)و لەپشـــت دەستیانەوە خشەخشی جلی ئاوریشمی و سەتان و بەخیلی و هەتاوی دوا نیوەڕۆی یەک شەممە، کاتێ کە ئەو دوو ئەســـپە بۆرە رەت دەبوون دەنگی ســـەنگین و ناسکی سمی ئەسپەکان دەبیسترا، بەگوێی یەکتردا دەیان چرپاند: (ئەمیلی بەستەزمان).

خاتوو ئەمیلی هەمیشە زۆر سەری بەرزدەکردەوە، تەنانەت کاتێک کە ئیتر لای ئێمە پشتی دابووی لە زەوی. وەک ئەوەی زیاتر لە هەمیشە چاوەڕوان بێت کە بەهۆی ئەسڵزادەیی و نەجابەتەکەیەوە وەک بە ناونیشانی دوا کەسی خێزانی گریرسن، سەری بۆ دانەوێنین. وەک بڵێیت هەر ئەوە مابوو کە پێداگری و خۆڕاگری بوونی تۆکمەی خۆی زێدەتر لە رابردوو بسەلمێنێت. وەک ئەو کاتەی کە رۆیشت زەهر بکڕێت. ئەمەیش زیاتر ساڵێک دوای ئەوە سەردەمێک بوو کە خەڵک راهاتبوون بڵێن: (بێچارە ئەمیلی)هەر لەو کاتەی دوو کچە مامی دەچوونە سەردانی.

خاتوو ئەمیلی بە دەرمان فرۆشـــەکەی وت: (بڕێک زەهرم پێویســـتە.) لەو کاتەدا زیاتر لە سی ساڵ بوو، هێشتا ژنێکی ئاسایی بوو. گوایا لەڕادەی ئاسایی کەمێک لاوازتر بوو. دوو چاوی وردو خۆبەشت زان کە سووکایەتیان بۆ کەسی دی لێدەباری، هەبوو. گۆشتی دەموچاوی و تەختی تەوێڵی و قەپیلکەکانی چاوی ئاوسابوون. مرۆڤ پێی وابوو کەسانێک کە لەناو منارەی چرای دەریایی دەژین دەبێ بەم شێوەیە بن. بە دەرمان فرۆشەکەی وت: (بڕێک زەهرم پێویستە).

(بەڵێ بەسەر چاو، میس ئەمیلی. چ جۆرە زەهرێک؟ وابزانم بۆ مشکو  شتی لەو شێوەی...)

(من باشترین زەهرێکم دەوێت کە هەتانە، کارم بە جۆرەکەیەوە نییە).

دەرمان فرۆشەکە ناوی چەند زەهرێکی وت.

(ئەوانەی کە پێم وتی تەنانەت فیلیش دەکوژن. بەڵام ئەوەی ئێوە پێویستتانە...)

میس ئەمیلی وتی: (ئارسنیکە. ئارسنیک زەهرێکی باشە؟)

(ئارسنیک؟... بەڵێ بەڵێ خانم. بەڵام ئەوەی ئێوە پێویستتانە ...)

(من ئارسنیکم دەوێ).

دەرمان فرۆشەکە لەسەرەوە سەیری دەموچاوی کرد. خاتوو ئەمیلیش، رێکو بێ شەرم چاوی لە چاوی ئەو بڕی. ســـیمای وەک ئاڵایەک بوو کە لە چوار لاوە رایکێشـــن. دەرمان فرۆشەکە وتی: بەڵێ بەسەرچاو گەر ئەمەت پێویستە.. بەڵام یاسا بە پێویستی دەزانێت کە بفەرمووی ئەمە بۆچی بەکاردەهێنی).

خاتوو ئەمیلی تەنها چاوی لەو بڕی. ســـەری بۆ دواوە قوتکردەوە کە راســـت چاوی لەچاوی بڕێت. دەرمان فرۆش نیگای گواســـتەوە شوێنێکی ترو چوو ئارســـنیکەکە بپێچێتەوە. بەڵام خۆی نەگەڕایەوە. پاکەتەکەی دایە دەســـت شاگردەکەی کە کوڕێکی رەش پێست بوو. ئەو پاکەتەکەی هێناو دای بە میس ئەمیلی. کاتێ میس ئەمیلی لەماڵەوە پاکەتەکەی هەڵپچڕی، لەسەر پاکەتەکە، لەژێر وێنەی کەللەسەرو دوو ئێسکە چەپ و راستەکەی نیشانەی ترسدا، نووسرابوو: (بۆ مشک).

## 4

رۆژی دواتر ئێمە هەموو دەمانوت: (خۆی دەکوژێت)و بیرمان کردەوە کە ئەمە باشترین کارە. سەرەتا کە میس ئەمیلییان لەگەڵ هۆمەر بارون دەبینی دەمانوت کە لەگەڵ ئەو هاوسەرگیری دەکات. دەمانوت: (هۆمـــەر بارون رادەهێنێت.) چونکە خودی هۆمەر بارون وتبووی کە حەزی لە پیاوە. خەڵک دەیانزانی کە لە کڵۆب ئالک لەگەڵ هەرزەکاراندا دەخواتەوە. بەکورتی پیاوی ژن هێنان نەبوو. دواتر، دوانیوەڕۆیانی یەک شـــەممە کە ئەوان لە ناو گالیسکە بریســـکەدارەکەدا دەگەڕان، ئێمە لەڕووی ئیرەییەوە دەمانوت: (ئەمیلی بەســـتەزمان) خاتوو ئەمیلی ســـەری بەرزو قوت دەکردەوە. هۆمەر بـــارون لێواری کڵاوەکەی بەرز کردبووەوەو جگەرەیەکی چروتی لەنێوان هەردوو لێویدا دانابوو لغاوی ئەســـپەکەی بەدەستکێشـــە زەردەکەی گرتبوو.

ئەوسا چەند ژنێک وردە وردە دەنگیان بەرزکردەوە: بۆ شار ناشیرینە، بۆ گەنجەکان رچە شکاندنێکی خراپە. پیاوان نایانەوێ قسەی تێدا بکەن. بەڵام ژنان ئەو کەشیشەی کە دوعای بۆ پاکبوونەوەی مرۆڤەکان دەکرد ناچاریان کرد «کەسوکاری خاتوو ئەمیلی هەموو ئەهلی کلێسابوون» کە بڕوات خاتوو ئەمیلی ببینێت. ئەو قەشـــەیەی هەرگیز ئەوەی لەو دیدارەدا بیســـتبووی ئاشکرای نەکرد. بەڵام ئیتر بۆ بینینی میس ئەمیلی نەچووەوە. یەک شـــەممەیەکی تر دیســـان خاتوو ئەمیلی و هۆمەر بارون لە شەقامەکان پەیدابوونەوە، رۆژی دواتر ژنی قەشەکە مەسەلەکەی بۆ خزمەکانی میس ئەمیلی، کە لە ئالاباما بوون، نووســـی. ئەوســـا دووبارە خزم و کەســـەکانی میس ئەمیلی لە ماڵەکەی پەیدابوون و ئێمە دەســـتمان خســـتە سەردەســـت و چاودێری رووداوەکانمان دەکرد. سەرەتا شتێک رووی نەدا. ئەوسا ئێمە باوەڕمان کرد کە ئەوان دەیانەوێ پێکەوە هاوســـەرگیری بکەن. بەتایبەت کە زانیمان خاتوو ئەمیلی رۆیشـــتوە بۆ لای زەرەنگەرێک و هەندێ بابەتی ئارایشـــی پیاوانەی زیوی داوە کردن کە لەســـەر هەر پارچەیەکی پیتی (ه. ب.)ی هەڵکەنرابێت. دوو رۆژ دواتر ئەوەیشمان زانی قاتێکی تەواو جلوبەرگی پیاوانەو چاکەت و بیجامەیەکی کڕیوە. ئێمە لە دڵی خۆماندا وتمان ئیتر هاوســـەرگیریان کردووەو بەڕاســـتی ئاهێک بە دڵمانـــدا هاتـــەوە. چونکە دیمان تەنانەت دوو کچە مامەکەی میـــس ئەمیلی زیاتر لەوەی خودی خاتوو ئەمیلی تا ئێستا فرۆشتبووی بەڕاستی (گریرسن)بوون.

ماوەیـــەک بوو کاری چاککردنی شـــەقامەکان تەواو بووبوون، لەبەرئەمـــە وەختێک کە هۆمەر بارون رۆیشـــت ئێمە ســـەرمان نەســـووڕما. بەڵام لەوەی کە یەکســـەر لەناو خەڵکدا هەڵا بەرزنەبۆوە، کەمێک حەپەســـاین. ئێمە وامان خەیاڵ دەکرد کە هۆمەر بارون رۆیشـــتووە تا پێداویســـتییەکانی رۆیشـــتنی خاتوو ئەمیلی دابین بکات. یا ئەوەی کە بواری بداتێ کە خۆی لەدەســـت کچە مامەکانی دەرباز بکات. «لەو وەختەدا ئێمە بۆ خۆمان دەســـتەیەک بووین و لایەنگری میس ئەمیلی بووین کە کچە مامەکانی راونێت. » هەفتەیەکی نەخایاند کە ئەوان رۆیشـــتن. بەو جۆرەی چاوەڕوان بووین سێ رۆژ دواتر هۆمەر بارون گەڕایەوە بۆ شار. یەکێ لە هاوسێکان بینیبووی کە خۆرئاوا نۆکەرە رەشەکەی خاتوو ئەمیلی لە دەرگای چێشتخانەکەوە ئەوی بردبووە ژوورێ و ئەوەیش دواجار بوو کە ئێمە هۆمەر بارونمان بینی و تا ماوەیەکیش خاتوو ئەمیلیمان نەبینی. تەنیا نۆکەرەکەی بە زەمیلەیەکەوە هاموشۆی بازاڕی دەکرد. بەڵام دەرگای ماڵەکە هەمیشە داخرابوو. ئێمە جارجارێ میس ئەمیلیمان بۆ یەک دووجار لەناو پەنجەرەکەدا بینی. وەک ئەو شـــەوەی کە لەکاتی قسڵ بەســـەردا کردن ئەویان بینیبوو. نزیکەی شەش مانگ لەسەر شـــەقامەکان نەبینرا. وەک ئەوەی ئەم تایبەتمەندییەی لە باوکییەوە بۆ مابێتەوە. تایبەتمەندییەک کە چەندەها جار رۆحی ئەوی لە زنجیر دەکێشا، بەڵام لەوە پیسترو هۆڤی تر بوو کە مەرگ قبوڵ بکات.

کەڕەتی دواتر کە ئەومان بینی ئیتر قەڵەوبوو خەریکبوو قژی ماشـــوبرنج دەبوو. لەم چەند ساڵەی دواییـــدا، قژی ئەوەندە ماشـــوبرنج بووبوو تاتـــەواو بۆ رەنگی بیبەری ســـوێر گۆڕابوو وەک حەوجۆش رەساسی بووبوو. تا رۆژی مەرگی کە تەمەنی حەفتا ساڵ بوو، هێشتا بەهەمان رەنگی پلێت ئاسا، وەک قژی پیاو زبرو رەق مابۆوە.

لەو کاتە بەدواوە، دەرگای پێشـــەوەی باڵەخانەکەی هەر بەو جۆرە داخرابوو. جگە لە شـــەش حەوت ســـاڵ، ســـەردەمێک کە نزیکەی چل ساڵ بوو وانەی شێوەکاری چینی دەوتەوە. لەو کاتەدا گەلەرییەکی لە یەکێک لە ژوورەکانی نهۆمی خوارەوە رێکخستبوو، کچان و نەوەکانی خەڵکی سەردەمەکەی کۆڵۆنێڵ ســـارتۆریس لەگەڵ هەمان نەزم و هەمان رۆح کە یەک شـــەممەکان بە سکەیەکی بیستو پێنج سەنتی، بۆئەوەی بیخەنە ســـەر ســـینی باربووکە دەیانگێڕا، دەچوونە کلێساکەوە، هەر بەو جۆرە گەلەرییەکەی

خاتوو ئەمیلیی دەڕۆیشت. میس ئەمیلی لەو سەردەمەدا لە دانی باج بەخشرابوو.

ئەوســا وردە وردە نەوەی تازە هاتنە ســەرکارو پەیکەربەندی و ڕۆحی شــاریان ڕێکخست. شاگردە کۆنەکانی گەوەرەبوون و ئیتر منداڵەکانیان بە سندوقی بۆیەو قەڵەم و ئەو وێنانەی لە گۆڤارە ژنانەکانیان دەبڕی بۆ خاتوو ئەمیلیان نەدەنارد. دەرگای پێشــەوەی بیناکەی لەدوای دوا شــاگردی داخســت و بەو شــێوەیە بەداخراوی مایەوە. کاتێ شار بووە خاوەن خزمەتگوزاری پۆستە، تەنیا خاتوو ئەمیلی بوو کە نەیهێشت ژمارەی ئاسنی بەسەر دەرگای ماڵەکەیدا داکوتن و سندوقی پۆستەی پێوە هەڵبواسن. خاتوو ئەمیلی گوێی لە قسەی کەس نەدەگرت.

ڕۆژان و مانگ و ســاڵان ئێمە نۆکەرەکەی میس ئەمیلیمان دەبینی کە قژی ماش و برنجیتر بووبوو، باڵای چەماوەتر بووبوو بە ســەبەتەیەکەوە هاموشۆی بازاڕی دەکرد. مانگی دیسامبەری هەموو ساڵێک دەبــوو ئاگادارییەکــی ماڵیات بگەیەنمە خاتوو ئەمیلی، کە هەفتەیەک دواتر لەڕێگەی پۆســتەوە بۆی دەنێــردرا. جارجارێ، بــە نیوەناچڵی ئەومان لە یەکێ لە پەنجەرەکانی نهۆمی خوارەوە دەبینی. دیاربوو کە ژوورەکانی نهۆمی ســەرەوە بەتەواوی هەمووی داخرابوون. نیوەی لەشــی میس ئەمیلی، وەک نیوە پەیکەرێکی بەردین کە بە دیواری میحرابی پەرســتگەیەکەوە هەڵواســرابێت، سەیری ئێمەی دەکرد، یا سەیری نەدەکرد، ئێمە هەرگیز نەمانتوانی لەوە تێبگەین.

بەمجــۆرە خاتوو ئەمیلی، خاتوو ئەمیلی پایە بەرز، زرت و زیندو، تۆکمە، ئارام، بە کەللەرەقییەوە، نەوەیەکی لەدوای خۆیەوە جێدەهێشت و دەچووە ریزی نەوەیەکی ترەوە.

ئەوکاتەی مەرگی ئەو ڕوویدا. لەناو ئەو ماڵەی کە پڕبوو لە ســێبەرو تاریکی و تۆزو خۆڵ، نەخۆش کەوت. لەجێیەک کە جگە لە ڕەش پێســتە پیرە لەرزۆکەکە کەســی بەدیارەوە نەبوو. ئێمە تەنانەت لە نەخۆش کەوتنیشی ئاگادار نەبووین. ماوەیەک بوو کە ئیتر خەبەرێکمان لە ڕەشەکە نەبوو.

ڕەشــەکە لەگەڵ کەس، ڕەنگە تەنانەت لەگەڵ خودی خاتوو ئەمیلیش قســەی نەدەکرد. چونکە وەک بڵێی بە هۆی ئەوەی کە قســەی نەدەکرد دەنگێکی گڕو نووســاو ژەنگگرتــووی هەبوو. میس ئەمیلی لە یەکێ لە ژوورەکانی نهۆمی خوارەوە، لەســەر سیســەمێکی لەدار گوێز دروستکراوی پەردەدار، مرد، لەکاتێکدا کە قژی ماشــوبرنجی لەناو ســەرینەکەیدا کە لەبەر بەرنەکەوتنی تیشــکی خۆر زەردبووبوو ڕۆچووبوو.

ڕەشــەکە یەکەمین دەســتە ژنــی کە دەنگیان لە ســینەیاندا کپ کردبوو بــە وس! وس! یەکتریان بێدەنــگ دەکردو نیگای خێراو فزوڵیان بەدەوروبەردا دەگێــڕا، لە دەرگای باڵەخانەکەوە کردە ژوورێ و خۆی دیارنەما. ڕێک و راســت چووە ناو باڵەخانەکەوەو لە دەرگای پشــتەوە چووە دەرێ و ئیتر کەس نەیبینییەوە.

دوو کچە مامەکەی خاتوو ئەمیلی گورج ئامادەبوون و ڕۆژی دواتر ڕێوڕەسمێکیان بۆ بەخاک سپاردنی تەرمەکەی ســازکردو خەڵکی شــار هاتن کە خاتوو ئەمیلی لە ژێر بنجە گوڵە دراوەکاندا ســەیربکەن، کە وێنەی قەڵەم کێشــی باوکی لەســەر گوڵەکان چووبووە رامانێکی قووڵــەوە. ژنان لەژێر لێوەوەو بە دەنگێکی کزەوە چپەچپیان دەکرد. پیاوە زۆر پیرەکانیش هەندێکیان بە یۆنیفۆرمی سەربازی سەردەمی جەنگی ناوخۆوە، کە ئەوان بە بەرگی خورییەوە، لەســەر سەکۆی بەردەم کلێساکەو لەناو چیمەنەکەدا وەستابوون و دەربارەی میس ئەمیلی پێکەوە قسەیان دەکرد. کە ئێستا یەعنی میس ئەمیلی هاوتەمەنی ئەوان بووەو لەگەڵیدا ســەمایان کردووەو ڕەنگە ســەردەمێک دڵیشــیانی بردبێت. وەک هەموو پیرێک حسابی ڕووداوەکانی رابردوویان پێکەوە ئاڵۆز دەکرد، رابردوو بۆ ئەوان وەک شەقامێکی باریک نەبوو کە

ئەوان لە کۆتاییدا وەستابن و وردە وردە لێیان دووردەکەویتەوە، بەڵکو وەک چیمەنێکی فراوان بوو کە هەرگیز زستانی نەبینیبوو هەر ئەم دەساڵەی دوایی وەک دالآنێک ئەوانیان لەیەک جیا کردبۆوە.

ئێمە لەو کاتەدا زانیمان کە لە نهۆمی سەرەوە ژوورێک هەبوو کە چل ساڵ بوو کەس ناوەوەی نەبینیبوو دەبوو دەرگاکەی بشکێت. بەڵام بۆ ئەوەی دەرگاکەی بکەنەوە، وەستان تا میس ئەمیلی بەشێوەیەکی ئابرومەندانە بەخاک بسپێرن.

وادەهاتە بەرچاو کە توندی شکانی دەرگاکە ژوورەکەی پڕکردووە لەتۆزو خۆڵ. ژوورەکە وەک ئەوەوابوو بۆ شەوی سوور رازابێتەوە. تۆزو خۆڵێکی خەستی ناشیرین وەک خۆڵی گۆڕستان، لەسەر مێزتوالێت، لەسەر بابەتە شووشە ناسکەکان و بابەتی ئارایشتی پیاوانە کە دەسکی زیوی لوسی هەبوو زیوەکەیش ئەوەندە لوسکرابوو کە پیتەکەی سەری نەمابوو و تۆز داپۆشیبوو. لە پەنا ئەوانە بۆینباخێک دانرابوو. وەک ئەوەی تازە لە ملی مرۆڤ کرابێتەوە. کاتێ بەرزکرایەوە، لەسەر تۆزێک کە لەسەر مێزەکەی داپۆشیبوو، وێنەی مانگێکی کاڵی لە شوێنی خۆی جێدەهێشت. لەسەر کورسییەکان قاتێک چاکەت و پانتۆڵ بەوردی قەد کرابوو، لەژێریشیدا جووتێک قۆندەرەو گۆرەوی کزکردوو پەرت دانرابوو.

خودی ئەو پیاوەی کە خاوەنی ئەو جلوبەرگانە بوو لەسەر سیسەمێک راکشابوو. ئێمە ماوەیەکی زۆر وەستاین و پێکەنینی قووڵی رووتی ئەومان سەیردەکرد کە تا بنا گوێی دەمی کرابۆوە. شێوەی جەنازەکەی وا دەردەکەوت کە سەردەمێک لە باوەشی کەسێکدا بووبێت و بەو جۆرە خەوتبوو. بەڵام ئێستا، ئەو خەوە درێژە، کە تەنانەت عەشقیشی بەسەر دەچێت و تەنانەت گاڵتەی بە ناشیرینییەکانی عەشق دەکرد، ئەویان رفاندبوو. پاشماوەی ئەو، لەژێر پاشماوەی کراسی خەوەکەیدا، ئەوەندە لەبەریەک هەڵوەشابوو، لە سیسەمەکە کە لەسەری خەوتبوو جیانەدەکرایەوە. لەسەر سەرینەکە کە لە تەنیشتییەوە دانرابوو، هەمان غوبار ئارام و بێ جووڵە نیشتبوو. ئەو کاتە ئێمە زانیمان کە لەسەر سەرینی دووەم شوێنەواری چاڵیی سەرێک دیارە. یەکێ لە ئێمە شتێکی لەسەر هەڵگرت. ئێمە بۆپێشەوە نووشتاینەوە، هەمان تۆزی تەڵخ و وشک لووتی سووتاندینەوە. ئەوەی بینیمان تاڵە موویەکی خۆڵەمێشی تێک ئالآوبوو.

**سەرچاوە**

یک گول سرخ برای امیلی .انتشارات نیلوفر.

# نامەکانی مەکسیم گۆرکی

لە فارسییەوە : حەمە رەسووڵ حەسەنپوور

رادەی ئەو نووســـەرە بەناوبانگانەی وەک گۆرکی گەنجینەیەکی لە پاش جێمابێ هێندە زۆر نین. تێکرای نامە دەستنووســـەکانی گۆرکی خۆ لە ٢٠ هەزار دانە دەداو ئەو نامانەش کە بۆی نێردراوە زۆرن.

ئەم نامانە بەشـــێکن لەوانـــەی گۆرکی بۆ ئەم نووســـەرو روناکبیرانەی ناردووە (لیۆنیکۆلا یۆڤیچ، بیرنارد شۆ، ئێچ. جی. وێڵز، رۆمان رۆلان، ڤلادێمیر ئیلیچ لێنین، بۆریس لیۆنیرۆڤیچ، ئەنڤودن سیمۆنۆڤیچ، ئیڤان ئەلیکسی یۆڤیچ.

کۆنســـتانتین بە دروســـتی ئاماژەی پێداوە کە: «لە گشـــت روســـیادا گەنج و بەســـاڵاچوو نامەیان بۆ گۆرکی نووسیوە. تەنیا بەشێک لە ئەرشیفی گۆرکی زیاتر لە ١٣ هەزار نامەی نووســـەرانی شۆرەوی پێشون. ئەم نامە هەڵبژاردراوانەی لێرەدا بەرچاوتان دەکەوێ لە ساڵی (١٨٨٩ تا ١٩١٢)یە.

مۆسکۆ

25ی ئەپریلی ١٨٨٩

لیۆنیکلایۆڤیچ

لە «یاسنایاپڵیانا» و مۆسکۆ هاتم بۆ دیدەنیت، پێیان وتم تەندروستیتان باش نیە و ناتوانیت چاوت پێم بکەوێت. بڕیارم دا نامەیەکت بۆ بنووسم. خەڵکێکی زۆر و یەک لەوان نووسەری ئەم نامەیە کە لە هێڵی ئاسنی «گریاتزی — تەزاریتسێن-

GRYAZI- TSARCTSYN RAIL WAY» کاردەکـــەن، ئۆگرییان بە کارکردن لە گوند و ئیشـــوکاری کشـــتوکاڵی ســـەربەخۆیە. لەگەڵ ئەوەیدا هەرکام لە ئێمە نزیکەی ســـی رووبـــڵ داهاتمانە لە مانگدا، پاشـــەکەوتمان کەمە و بۆ کۆکردنەوەی پارەی پێویســـت بۆ وەرێخستنی کێڵگەیەک ناچارین ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بین.

بۆیـــە بڕیارمانـــدا داوای یارمەتی لە تۆ بکەیـــن. تۆ زەوی و زاری زۆرت هەیـــە و گویا نەچێندراون. داوامان لە تۆ ئەوەیە پارچەیەکمان لەو زەویانە بدەیتێ. هەروەها جگە لە یارمەتی دارایی پێویســـتمان بە یارمەتی تۆ واتا پەسەندکردنی ئەو پێشنیارانەی گەیشتن بە ئامانجەکانمان ساناتر دەکات، هەیە و هیوادارین کتێبە یاساخەکان کە فرۆشتنیان رێگەی پێنەدراوە، وەک «دان پێدانان CONFESSION— ” «ایمان من– MY FAITH“ و هیترمان بە ئەمانەت بدەیتێ.

هیوامان وایە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی داواکارییەکەمان پەســـەند دەکرێت یاخود بەشـــێکی هیچ و پووچ و پەرێشـــانفیکری دەژمێردرێت، لانیکەم نامەکەمان بێ وەڵام مەهێڵەوە. ئەم کارە ماوەیەکی کەم کاتت دەگرێ، ئەگەر حەز دەکەی سەبارەت بە ئێمە و کارەکانمان بۆ بە ئەنجامگەیاندنی کارەکان شتێک بزانی، یەک یان دوو کەس لە ئێمە دەتوانن بێن بۆ دیدەنیت، هیواداری یارمەتیتین.

لەلایەن هەمووانەوە
هاوشارییەکی نیژنی — نوگراد
«NEZHNI - NOVGOROD»
ئەلێکس ماکسی مۆڤیچ پشکۆف

بێترۆگراد
بەر لە دیسامبەری ١٩١٥
بێرنارد شۆی ئازیز!

ئەم دەنگۆ خۆشـــەم پێگەیشت کە ئێوە بە نیسبەت ئاژاوە و ئاڵۆزییە بێ واتاکانی جەنگەوە کە بە ملیۆن داهێنەر و خەڵکی هەســـارەی ئێمەی بەرەو لەناوچوون برد، خۆت کێشاوەتە دواوە، ئەگەر رێگەم بدەی بە راشـــکاوی بدوێم، دەڵێم: چاوەڕوانی ئەوە نەبووم وەک مرۆڤێکی چاونەترسی ئەوروپا سەیرت بکەم، ئەو ئەوروپایەی لە ئاست تراژیدیایەکی جیهانیدا کوێرو کەڕە، لەوانەیە دڕدۆنگی ئانگلۆساکسۆن ناشیرینترین شت بێت کە دونیا بە خۆیەوە دیوە.

بەرێز شـــۆ! هەروەک لە گشت دونیادا بڵاوت کردۆتەوە، گومان کردن لەوپەڕی لووتکەدا تایبەتمەندی خۆتە، هیوادارم ئەم وشـــانە بە نەشـــیاو نەزانی، هەســـتی من ئەم وشانە بۆ دەرخســـتنی رێزم بۆ تۆ دەردەخات. داواکارییەکم لێت هەیە، رێگەم بدە من و هەڤاڵە ئەنتەرناسیۆنالیستەکانم بابەتێکی تۆمان لە گۆڤارێکدا کە بەم زوانە خەریکە چاپ و بڵاوبکرێتەوە، هەبێت و حەزم دەکرد بیرورِات ســـەبارەت بە رەوشی ئێستای ئینگلستان و پێشبینییەکەت لەمەڕ داهاتوودا بزانم.

دیارە تۆ وەک سۆسیالیســـتێک بەهۆی ئەم بەشـــە لـــە مرۆڤایەتییەوە کە هێـــزی مەعنەوییان لە ئایدیالیزمـــەوە وەرگرتـــووە، هەســـتپێدەکەی، ئەم بیروباوەڕانـــەی لە هەلومەرجی ئێســـتادا بە هیوای دروستبونی ژیانێکی نوێوە نایانەوێت ئەم رەوشە سامناکە درێژە بکێشێت.

شۆی ئازیز!

داوای برایانەت لێدەکەم یارمەتی ئێمەی روس بدەیت بۆ ئەوەی ئیلهامی نوێ بگەیەنینە بیرو زەینی هاولاتیانمانەوە، ئەم کارەی تۆ دەتوانی بە باشـــترین شێوە لە جیهاندا ئەنجامی بدەی. تکایە بابەتەکە بە ناونیشانی – ستۆکهۆڵم بنێرە.

م. گۆرکی

دوایی ئەپریل یان مەی

1920

وێڵزی ئازیز!

تا ئێســـتا سێزدە بەرگ کتێبی زانستی سروشتیم لەلایەن تۆوە پێگەیشتووە، کۆڕی زانایان بۆ ئەم دیارییە برایانە سوپاست دەکەن، منیش هەروەها.

هەموو کتێبەکان تا ئێســـتا لەلایەن مامۆستای زۆرەوە خوێندراونەتەوە، لێکۆڵینەوە ئەنجامدراوەکان لـــە کۆبوونەوەی رۆژی یەکشـــەممۆی زانایاندا بە دەنگی بەرز خوێندرانـــەوە و هێندێک لە بابەتەکان و بەتایبەتی – گرنگترینیان «کۆڕەکانی ســـۆدی» وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی روسی. ئەمە یەکێکی دیکە لە کارە باشەکانتە کە بۆ من جێگەی سەرسووڕمان نیە، ئاشکرایە ئەمجۆرە کارانە تایبەتمەندی تۆیە.

ئێمە بە خوێندنەوەی بابەتەکانتەوە سەرقاڵین، زۆر جێگەی رەزامەندین (چاوت لێیە چەندە ناجسنم!) چونکی توانیومە بە ترس لە «رۆژهەڵات» بتخەمە ژێر کارتێکردنەوە.

من تا ئێســـتاش بە نیســـبەت (تەلعەت پاشـــا، کەماڵییەکان، ئەولاییەکان)ەوە بـــە گومانم کە بە راشکاوی خەونی دروستکردنی دەوڵەتێکی موسڵمان دەبینین کە هەرێمەکانی سەرووی خەزەر، سەرووی قەوقازیاو داغســـتان، ئاسیای ناوەڕاســـت و بەڕواڵەت میسر لەخۆ دەگرێت. مرۆڤ وا هەستپێدەکات کە وا دێتە بەرچاو ئەرمینیا و پاشـــان جۆرجیا ئەو ولاتەی دەیناســـین و خۆشـــمان دەوێت، بێ سێ و دوو یەکەم ولات دەبن کە لەم ماجەرایەدا دوچاری ئاریشـــە دەبن. دیارە من سیاســـەتمەند نیم، بەلام هەندێ جـــار وام دێتە بەرچاو کە ئیلهامێکی راســـتم هەیە و نەفرەتم لـــە بەدبەختی مرۆڤ و ئەو رەنجەی ئەو پێشگۆیییەکی باش یان راستتر ئەوەی کە ئەم پێشگۆییە موسیبەت خولقێنە، لە مندا پێک دێنێ.

من وەک هەمیشـــە لە رەوشـــێکی نیگەران و ئالۆزدا دەژیم و هەموو کاتم لە مۆسکۆ تێپەڕ دەکەم و جەستەم ئامادەی تووشبوون بە نەخۆشی «ئیسکۆرپورت»ە و پێویستم بە چارەسەرییە.

بۆ ناردنی ئەم نامەیە بە پەلەم هەر بۆیە لێرەدا دوایی پێ دێنم.

سلاوی من بە گ. ب دۆستە ئازیزەکان بگەیەنە.

هەموو ئەوانەی لێرە دەیانناسی لەگەڵ باشترین رێزیاندا سلاوت لێدەکەن.

پەیکەرێکی بچووکی لیۆتۆلستۆت بۆ دەنێرم.

ئیرادەتمەند!

بەرلین

30ی مای ١٩٢٢

دۆستی ئازیز،

کۆمەڵێک زانا و نووسەری رووسی گۆڤارێکیان ڕێکخستووە بە مەبەستی ئاگادارکردنەوەی رۆشنبیرانی شوورەوی سەبارەت بەم باسووخواسانەی لەمەڕ بابەتی ئەو کتێبانەی لە ئەورووپا بۆ پەرەپێدانی زانست و ئەدەبیات بڵاودەبنەوە.

زۆربەی نووسەرەکانی گۆڤارەکە ئەو کەسانەن کە بە هیچ چەشنێک پێوەندییان بە سیاسەتەوە نیە. مامۆستایانی زانکۆ:

« ئا. پینکۆڤیچ " A. PINKEVICH—

"وی تارلە- Y.TARLA"

«س. ئۆڵدینبــۆرگ — S. OLDENBURG"، ئەندامی ئاکادێمیای زانســتی: «کۆنت ئەلێکســی تۆلستۆی» و خۆم.

هیوادارم تاقمێک نووسەر و هۆنەری گەنجی رووسیی کە هێندێکیان زۆر ئامادەی فێربوونن بەشداری تێدا بکەن. ئێمە داوامان لە نووسەرە بیانییەکان: «بی. کێلرمان — B. KELLERMANN"، «کلاوفارر — CLAWDEFARRER" و «دامســمێل دی گرامۆنت — DUMES MILDE GRAMONT" کردووە یارمەتیمان بدەن بۆیە دەبینن ئێمە ئامانجێکی گشتیمان هەیە!

بەشــێک لە گۆڤارەکە تایبەتە بە پێداچوونەوەی ئەدەبیاتی وڵاتە جۆراوجۆرەکان. ئایا بیردەکەیەوە کامە ڕەخنەگری فەرانســەیی شــیاوترین کەس بێت بۆ ئەم کارە؟ تکایە بابەتێک بۆ گۆڤارەکە بنێرە. بابەتەکە دەکرێ سەبارەت بە ڕای تۆ لەمەر شۆڕشدا بێت!

دۆستی ئازیز رێگەم بدە هیوادارب‌م لەم کارەدا یارمەتیم دەدەی، بە چییەوە سەرقاڵی؟ ماوەیەکی دوور و درێژە نامەیەکم لەلایەن تۆوە پێنەگەیشتووە.

ئیرادەتمەندی تۆ

م. گۆرکی

پێترۆگراد

ژانوییەی ١٩١٩

ڤلادیمێر ئیلچ ی ئازیز:

ئەو کرێکارە کۆمۆنیســتانەی لە بەرەی جەنگ دەگەڕێنەوە گازەندەیان لەوەیە بەرخۆدانیان لە نێوان ئاپۆرای خەڵکی ئامادە لە ئەرتەشی سووردا لەگەڵ پێشڤەچوون و چاوەڕوانیاندا یەکناگرێتەوە.

ســکاڵای ئەم تێکۆشــەرانە زۆر جیددی و نادیارە و من داوات لێدەکەم سەرنجیان پێ بدەی. بەش بە حاڵی خۆم فیکر دەکەمەوە ئەگەر بە شتێکی زیاتر لە تیۆری سادە تەیار بکرێن و بنێردرێنە سەرکار،

ســـەرکەوتنی گەلێک زۆرتریان دەبێت، تەیار بە ڕاســـتییەکانی دەســـکەوتەکانی داهێنەرانەی دەوڵەتی شووراکان کە بە چەشنێکی زیندوو و تیۆری دەسەلمێنێ.

من ماوەیەکی زۆرە جەخت لەسەر چاپی گۆڤارە هەواڵ دەکەمەوە — گۆڤارێکی بەرپرسی کۆکردنەوەو شرۆڤەکردنی هەموو شتێکی پۆزەتیڤە کە دەوڵەتی شووراکان لە ماوەی ساڵێکدا لە بوارە جیاجیاکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا وەدەستی خستوون. هاواری من هاوار لە بیابانداییە کە بە داخەوە ئەو بیابانە کەسی تێدا نیشـــتەجێ نیە. لەگەڵ ئەوەیدا من بە سەرســـەختییەوە درێژە بـــە هەوڵدانەکەم دەدەم، هەوڵدان بۆ راکێشـــانی ســـەرنجی تۆو ئەوانەی بتوانن بە چاپکردنی گۆڤارە هەواڵێک یان لانیکەم نامیلکەیەکی لێکۆڵینەوە لەو کارە گەورانەی دەوڵەتی شـــووراکان لەماوەی ســـاڵێکدا ئەنجامی داون. ئەم لێکۆڵینەوە پێویستە دەستکەوتەکانی ساڵی ١٩١٨ی کۆمیسارییای پەروەردەی گشتی و باقی کۆمیسارییاکان و هێند بە کورتی بێنێتە بەر باس کردن.

کەم نین ئەو راســـتیانەی دەوڵەتی شووراکان دەتوانێت — شانازییان پێوە بکات بەتایبەتی ناوەندی بە کردەوەی لووناچارســـکی. پێویســـتە دیعایەکاران ئەمە بزانن و ئەگەر تۆ ئەوە بە مەسئولان بڵێی بۆ کۆکردنەوەی پێشنیارەکان دەستبەکاربن خزمەتێکی بەرزت ئەنجام داوە...

لەگەڵ زۆرترین ئارەزوکانم بۆ ساغی و سەلامەتیت

ئە- پشکۆف

سۆرنتۆ

چواری ئۆکتۆبەری ١٩٢٧

بۆریس لیۆنیدوڤیچ ی ئازیز،

دیوانی هەڵبەســـتەکانتم پێگەیشت، لەمبارەیەوە برایانە سوپاست دەکەم! پێویستە بە ئاگاداریتان بگەیەنم کە: «منداڵیی لوڤور — LUVERS CHILDHOOD“ وەرگێردراوەتە سەر ئینگلیزی و لەوانەیە لە چەند حەوتووی داهاتوودا لە بڵاوکراوەکانی ئەمریکادا چاپ بکرێت. من ئێســـتاش دەورەی وەرگێڕان و چاپ شارەزا نیم، پاش ئاگاداربوون فەوری پێت رادەگەیەنم. بابەتی زۆرم سەبارەت بەوەی چۆن ژیان دەکەیت لە: زمانی «زوباکین — ZUBAKIN“ و «تســـۆتایوڤا — TSVETAYEVA“ بیستووە، بەڵام ئەوان ناتوانن بڵێن داخوا تۆ پەخشان دەنووسیت؟ هیوام وایە هەر وا بێت و بە بەڵگە هێنانەوەی کتێبی «منداڵی لوور» تۆ توانای نووسینی کتێبی زۆر باشت هەیە.

لەگەڵ باشترین ئارەزوەکانم و سوپاسی دوبارە!

ئە — پشکۆف

سۆرنتۆ

17ی دیسامبەری ١٩٣٢

ئەنتوانت سمیۆنۆڤیچ ی ئازیز

دوێنێ کتێبی «مارسی ١٩٣٠»ی تۆم بە شۆرو شەوقەوە خوێندەوە. کۆمون و کۆمۆنارده بچوکەکانت زۆرباش وەسف کردووە. مرۆڤ لە گشت لاپەڕەکانیدا عەشقی تۆ بە منداڵان و ئۆگریی هەمیشەییتان بەوان

هەستپێدەکات، هەست و تێگەیشتنی ئەوتۆ لە فیکری منداڵێک! من بە هۆی نووسینی ئەم کتێبەوە لە ناخەوە پیرۆزباییت لێدەکەم. لەوانەیە چەند وشەیەک سەبارەت بەو بنووسم.

من لە کۆمەڵەی «کووریاژ – KURYAZH“ پەیوەندی نامە نووسینم بە منداڵانەوەیە نیە، هیچیان لە بارەدا نازانم. جێگەی داخە کە منداڵی بەم باشییە لەوێدان و زۆر سەرنجیان پێنەدراوە.

بە سڵاوی برایانەوە

سڵاوی من بە منداڵان بگەیەنە و پێیان بڵێ بە خوێندنەوەی ژیاننامەکانیان و ئەوە کە چەندە باش تێدەکۆشن و چەندە دۆستی باش و راستەقینەی یەکترین، زۆر پێخۆشحاڵم.

م. گۆرکی

کاپری

نزیکەی ١٨ی ئووتی ١٩١٢

ئیڤان ئەلکسی یۆڤیچ ی ئازیز!

لە یەکێک لە رۆژانی ئەم حەوتوویەدا دەستنووسی چیرۆکەکانم بۆ «ڤیکینتی ڤیگنتۆڤیچ VIKENTY VIKENTYEVICH- VERESAYEV» دەنێرم.

تۆ حەتمی کتێبە نوێیەکەتم بۆ بنێرە! من نەک چیرۆکێک بگرە کورتە چیرۆکی «عەشقی گەورە»[1] ت کە ئێستا بە نووسینییەوە سەرقاڵم پێشکەشت دەکەم، گەرچی تا ئێستا نازانم لە کوێ چاپ دەکرێت. لە ساڵی تازەدا گۆڤارێکی نوێ دێتە بازارەوە، ئەگەر دەربچێت لە راستیدا لە زۆر لایەنەوە نوێ دەبێت.

سەبارەت بە «زاوتی» بە داخ مەبە، چونکە هەر ژمارەی خراپترە لە ژمارەی پێشووی. لە «چرنۆف» زیادە، ئەو هەرگیز سەرکەوتوو نیە. لە ژمارە چواریدا چاوخشاندنێکی بەسەر «گفتوگۆی شەوانە»دا کردووە کە پڕە لە قسەی بێ واتا. نرخی ئەو بابەتەی سەبارەت بە «ئیسترۆ»یە لە ژێر نیشانەی پرسیاردایە. کورتە چیرۆکی «راپشین» ناتەبایی تەواوی لەگەڵ لاپەڕەکانی پێش و دواییدا هەیە. بەر لە هەموو شتێک نووسراوەکانی تۆلستۆی تێدایە.

م. گۆرکی

## پەراوێزەکان:

١-عەشقی گەورە (GREAT LOVE) ناوی چیرۆکێکە گۆرکی هەرگیز تەواوی نەکرد.

# چێشتخانەیەکی نایاب

ئەمبارۆ داڤێلا
لە عەرەبییەوە: عیسا چیایی

### ئەمبارۆ داڤێلا

..ئەم خانمە ساڵی (١٩٢٨) لەمەکسیک لەدایک بووە،لەیەک کاتدا شاعیر ونووسەری کورتەچیرۆکیشە، لەپەنجاکانی سەدەی پێشوودا، سێ کۆمەڵە شیعری بڵاوکردەوە و پێشوازیەکی گەرمیان لێکرا.

سەردەمی منداڵی ژیانی لەنێوان راهبەکان و ئەوانەدا بەسەربردووە کە لە کانە خەڵووزەکاندا کاریان کردووە، پێش تەمەنی دەساڵی و ئەو کاتەی کە قوتابی بووە دەستی بە شیعر نووسین کردووە .ئەو چیرۆکانەی کە لە پەنجاکانداو پاش گیرسانەوە و نیشتەجێبوونی لە مەکسیکۆسیتی نووسیونی، باس لەو ململانێیانە دەکات کەبەسەر ژیانی یەکێک لە خێزانەکاندا هاتووە، باس لەو کۆت و بەندانەش دەکات کە بەتەنها کار لە ژیانی ژن و پیاوەکان ناکات — هەروەکو بەڕوونی ئەوە لە چیرۆکی چێشتخانەیەکی نایابدا دەردەکەوێ، بەڵکو کار لە خەونەکانیان و لەو بوونەوەرانەش دەکات کە لە خەونەکانیاندایە. هەرسێ کۆمەڵە چیرۆکەکەی ئەو تایبەتمەندیانەیان بۆ خەیاڵی ئەدەبی مەکسیکی گواستۆتەوە، ئەو تایبەتمەندیانەی کە «کافکا» و «خۆلیۆ کۆرتاساری» پێ دەناسرێنەوە.

## چێشتخانەیەکی نایاب...

.. کاتێ گوێم لەباران دەبێت ئەودەمانەی کە بە تووندی پەنجەرەکەم دەکوتێ، دووبارە ئەو قیژانەی ئەوانم بیردەکەوێتەوە، ئەو قیژانەی وەک شوێن لێدان ئاسایی بە پێستمەوە دەنووسێن. تا مەنجەڵەکە گەرمتر دەبوو و ئاوەکە دەستی بەکوڵان دەکرد. چینی دەنگەکانیان بەرزتر دەبووەوە، چاوە بچکۆلەکانیان دەبینم لەکاتی لێناندا وەک مورووی ڕەش لە گلێنەکانیاندا خێل دەبوون.

ئەوان، لە وەرزی باران بارین و لە باخچەی سەوزەمەنیەکاندا لەدایک بوون، لەنێوان گەڵای دارەکاندا خۆیان حەشارداوە. بەتووندی دەستیان بەقەدەکانەوە گرتووە، یان لەتوێی گژ و گیا تەڕەکاندا خۆیان شاردۆتەوە، لەوێشەوە بەتووندی و بەخێرایی ڕادەکێشرێن، تا بەنرخێکی باشیش بفرۆشرێن. هەمیشە سیانیان بە پێنج (سەنت)ـی ڕێک و کە زۆریش دەبن نرخی دەرزەنێکیان بە پانزە سەنت دەفرۆشرێن.

لەماڵەوە وا ڕاهاتبووین کە هەموو هەفتەیەک بایی دوو (بیزوو) بکڕین .ئەوەش بۆ ئامادەکردنی ژەمە سەرەکیەکەی ڕۆژانی یەک شەممە، هەندێ جاریش وەک زۆربەی جاری دی کە میوانمان دێت، لەوە زیاتر دەکڕین. خێزانەکەی ئێمەش ئەو ژەمەخواردنەی تەنیا بۆ میوانە زۆر تایبەت و خۆشەویستەکان لێدەنا، دایکم وا ڕاهاتبوو کاتێ کە دەیویست چێشتەکەی خۆی هەڵبنێ بەهەموو شانازیەکەوە دەیگوت..:

((لەم جێگایە زیاتر هیچ جێگایەکی تر نی یە، ئەم خواردنەی هێندە بەچاکی تیا لێبنرێ))

چێشتخانە تاریک و دڵتەنگەکە و ئەو مەنجەڵەشم لەبیرە کە تیا لێدەنران- مەنجەڵێک بوو چێشتلێنەرە فەرەنسیەکە دەیپاراست و پاکی دەکردەوە- هەروەها ئەو کەوچکە دارینەش کە لەبەر زۆر بەکارهێنانی ڕەش داگەڕابوو. چێشلێنەرەکەشم لەبیرە کە ژنێکی قەڵەو و دڵڕەق و بێ بەزەیی بوو، ئازارەکانیان ئەوی نەدەوروژاند. ئەو هاوارانەی دڵی هەرکەسێکی دەپچڕاند، هیچ کارێکی لەو نەدەکرد، وەکو هیچ شتێک ڕووی نەدابێ بەردەوام ئاگرەکەی خۆش دەکرد و فووی لە پشکۆکان دەکرد. من لە ژوورەکەی خۆمەوە کە کەوتبووە سەروویانەوە دەمتوانی گوێم لێیان بێ کاتێ دەقیژێنن . هەمیشە باران دەباری، قیژەکانیان تێکەڵ بە خرمە خرمی بارانەکە دەبوو. مەرگی ئەوان کاتێکی زۆر زۆری خایاند.

وام دەهاتە پێش چاو کە گیانەڵای ئەوان بۆ هەتا هەتایە بەردەوام دەبێ. لە ژوورەکەمدا دەمامەوە و سەرم لەژێر سەرینەکەمدا نوقوم کردبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەمتوانی گوێم لێیان بێ. هەرگیز نەمزانی ئایا هێشتا بە زیندوویی ماونەتەوە، یان دەنگەکانیان تەنیا لەناو سەر و لەناو گوێچکەی مندایەو لە ناوەوەو لە دەرەوەش لێدەدەن و هەلا هەلام دەکەن.

هەندێ جار دەمتوانی سەدان چاوی بچکۆلە ببینم کە نووساون بە شوشەی ئەو پەنجەرانەوە کە نوقمی باراناون. سەدان چاوی ڕەشی درێژکۆلە، چاوانێک دەبریسکانەوە، بەفرمێسک تەڕبوون، بەپاڕانەوەوە داوای بەزەییان دەکرد، بەڵام لە ماڵی ئێمەدا بەزەیی نەبوو، لەپای دڕندەییمان سۆزی هیچ کەسێک نەدەوروژا. چاو و قیژەکانیان بەدووامەوە بوون، هەروەکو چۆن تا ئێستاش- بۆ هەر جێگایەک کە بۆی چووبێتم، هەر بەدووامەوەن.

چەندین جار مندیان بۆ کڕینیان دەنارد و هەمیشە بەدەستی بەتاڵ دەگەڕامەوە. سوێندم بۆ دەخواردن کە بۆم نەدۆزراونەتەوە، ڕۆژێکیان لەوە کەوتنە گومانەوە و ئیتر مندیان نەنارد و چێشلێنەرەکە لەباتی من دەڕۆشت و دەیهێنان، ئیتر منیش بە ڕقەوە چاوم تێدەبڕی هەروەکو چۆن مرۆڤ دەڕوانێتە جەلادێکی زۆر دڕندە، ئەویش هیچی بۆ نەدەمایەوە ئەوە نەبێت کە لوتە فسەکەی گرژ دەکردەوەو بە لەخۆبایی بوونێکەوە دەیفیشکاند.

ئامادەکردنیان کارێکی ئاڵۆز و کاتێکی زۆریشی دەبرد. لە سەرەتادا دەیانخستنە سنوقێکەوە گژوگیای تیا ڕاخرابوو، گیایەکی بۆنداری دەگمەنیان دەدانێ تا -هەروەکو دیار بوو بەخۆشیەکەوە- بیخۆن . ئەو گیایەش بۆ پاکبوونەوەیان بوو بە سکچوون. ڕۆژی یەکەمیان لەوێ دەبردەسەر، لە بەیانی ڕۆژی دوواتردا بەئاگاییەوە دەکوڵێنران تا ئازاریان پێنەگات، پاشان وشک دەکرانەوە و دەخرانە مەنجەڵێکەوە کە پڕبوو لە ئاوی سارد و بەهارات و ئەو گژوگیا بۆنخۆشانەی کە تامێکی تایبەتیان هەیە لەگەڵ ئاو و خوێ و سرکەدا، ئەوکاتەی ئاوەکە دەست بە کوڵان دەکات، ئەوان دەقیژێنن و دەست بە هاتو هاوارکردن دەکەن، هاتو هاوارێک لە هات و هاواری ئەو منداڵانە دەچێ کە تازە لەدایک دەبن، وەکو کۆمەڵە مشکێکی هاڕاو، وەکو شەمشەمە کوێرە، وەکو کۆمەڵە پشیلەیەک کە وەختە بخنکێن. وەکو ژنە هستیریەکان.

ئا لەو بۆنەیەدا -کە دواڕۆژی من بوو لە ماڵەکەدا- خوانێکی زۆر درێژ ..و پوخت ڕێک خرابوو ..

## سەرچاوە:

گۆڤاری (الثقافة الأجنبية)ی عێراقی، ساڵی دووازدەیەم، ژمارە (١)ی (١٩٩٢) لاپەڕە (١١١-١١٠). وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: ئەلیاس فەرکوح.

# خۆم و ژیانم و دونیا

سەحەر خەلیفە
لە ئینگلیزییەوە: گۆران عومەر

سەحەر خەلیفە ڕۆماننوسێکی بەناوبانگی عەرەبی فەلەستینیە. ناونیشانی کۆتا ڕۆمانی «المیراث» میرات، هو لە پێشتریشدا کۆمەڵێک ڕۆمانی تری بڵاوکردوەتەوە بە ناوەکانی «لم نعـد جواري لكم» ئێمە چیتر کچەکۆیلەی ئێوە نین، «الصبار» کاکتەس، «عباد الشمس» گوڵە بەڕۆژە، «مذكرات أمرأه غير واقعية» یادەوەریەکانی ژنێکی ناواقعی، «باب الســاحة» دەرگای گۆڕەپانی ناوشــار. لەم وتارەی خوارەوەدا باس لە هەندێک لە لایەنەکانی ژیانی خۆی و کارە ئەدەبیەکانی دەکات.

هەمــوو ئەمانە بــە لەدایکبوونی کچێک لە خێزانێکی فەلەســتینی لە نابلوس دەستی پێکرد. بە شێوەیەکی چاوەڕوانکراو پێشوازیکردنی ئەم کچە بۆ دونیای نوێ بە ئەوپەڕی ناڕەحەتی و غەم و فرمێسک و هەنسکی گریانەوە دەستی پێکرد. هەموو ئەمانەش تەنها لەبەرئەوە بوو کە ئەو پێنجەمین کچی ناو خێزانێکی هەشــت کچی بــوو. ئەم ڕووداوە دڵتەنگەش کاریگەرییەکی خراپی کردە ســەر باوکم، چونکە ئەو زۆر بــە پەرۆش بوو بۆ کوڕێک بۆئەوەی لە دوای خۆی ناوی بنەماڵەکەی بپارێزێت و لەدوای خۆی بتوانێت ببێتە خاوەنی میراتیەکەی. لەڕاســتیدا نەتوانینی کچان لە پاراســتنی ناوی خیزانەکەیاندا تەنها هۆکاری ئەو غەمباری و دڵتەنگیانەی نەبوو، بەڵکو باوکم وا هەستی دەکرد کە وێنەی ئەو وەک (باوکی کچەکان) بۆ هەمیشەیی دەچەســپێت کە لەناو کەلتوری عەرەبیدا بە جۆرێک لە لاوازی پیاوەتی و نێربوون ســەیردەکرا. کاردانەوەکانی دایکم زۆر بەهێزتــر و توندتر بوون بە جۆرێک بوو بە بەردەوامی و بۆ مــاوەی چەند ڕۆژێک دەگریاو خۆی بە بێزراوترین و بەدبەختترین ژنی دونیا دەزانی.

لە ژینگەو بارودۆخێکی ئاوا نەشیاو و تاریکدا مانای بوون و بەهای خۆم لە دونیادا فێربووم. فێربووم کە من لە ڕەگەزێکی خەفەتباری بێ سوودی بێ ئەهمیەتدام. هەر لە منداڵیەوە فێرکرام کە خۆم بۆ ئەو سەرکێشیانەی کە ڕووبەڕووی ژن دەبوونەوە ئامادەبکەم. هەمیشە پێم دەوترا کە دەبێت خۆم ڕابهێنم بۆ گوێرایەڵی و جێبەجێکردنی هەموو ئەو یاسایانەی کە کۆی ژیانی من دەگرێتەوە و کۆنترۆڵی دەکات.

وەک هۆکارێک بۆ هەڵهاتن لەو واقیعە خۆم بە خوێندنەوەو نوسین و وێنەکێشانەوە خەریک کرد. هەرگیز نەمدەتوانی وابیربکەمەوە کە من سەر بە کۆمەڵگەیەکم و لەوانم، بەڵکو هەمیشە وامدەزانی من کەسێکی هیچ و دەرکراو و قوربانیەک و ڕۆحێکی دۆڕاوم کە ناتوانێت پەناگەیەکی پارێزراو و سەلامەت بۆخۆی بدۆزێتەوە. ئەمەش لە یەکەمین ڕۆمانمدا «لم نعد جواري لكم «دا بەتەواوی ڕەنگی داوەتەوە، کە یەکەمین ئەزموونم بوو لەگەڵ دانانی کەسایەتیەکاندا کە تێیدا هەموو کەسایەتیەکانم زیندانی کێشە هەمیشەییەکان و سەرکێشیەکانی نێو ژینەگەکانیانن.

لەو کاتەشدا دایکم دژی یاخی بوونەکانم وەستایەوەو ڕێگری لێدەکردم. ئەو ژنێکی زیرەک و کەسایەتیەکی بەهێز و دەستەڵاتێکی ڕەق و لەخۆبایی بونێکی زۆری هەبوو. لەو کاتەدا تێگەیشم کە ئەو دەسەڵاتەی هیچ نیە جگە لە جۆرێک لە دەربڕینی ئەو غەم و خەفەتەی و ئارەزوی بەرگریکردن لە خۆی. ئەو هەمیشە لەوە دەترسا کە من کارێکی نەشیاو و سەرکێشانە بکەم و ببمە بێزراوترین کچی ناو هەموو خێزانەکە. هەروەها لەبەر نانەوەی کۆمەڵێک کچ کە دەگەڕێنەوە بۆ ڕەگەزێکی بێ ئەهمیەت و لاواز، هەمیشە هەستی بە جۆرێک لە تاوانباری دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا لەخۆبایی بونەکانی دایکم هەرگیز ڕێگەی لە پیشاندانی هەستەکانیدا لێنەدەگرت. بە زیرەکی و توانا ناوەکیەکانی خۆی بە دروستکردنی چیرۆک، هەمیشە خۆی بۆ شاردنەوەی ترسەکانی ڕیکدەخست و وای پیشاندەدا کە وەک ئاسن بەهێزە و وەک بەرد نەگۆڕە. بەردەوام وا هەستی دەکرد کە زۆر زیاتری شایەنە لەوەی کە پێی دراوە، هەشت کچ و تەنها کوڕێک(تەنها کوڕێک!) ئەو تەنها زیرەکترین و جوانترین و بەهێزترین کەسی ناو خێزانەکەمان نەبوو بەڵکو لە ناوچەکەشدا وێنەی نەبوو. بەڵام لەگەڵ بوونی ئەو هەموو کچەدا بەردەوام سەرکۆنەی خۆی دەکرد و هەستی بە تاوانباری دەکرد.

من هەستم بەو بۆچونانەی کردبوو هەر بۆیە بەردەوام ئەو بۆچونانەی ئازاریان دەدام. تاڕادەیەکیش ناحەزی و غیرەی لە بەرامبەرمدا پەیدا کردبوو لەبەرئەوەی لە هۆی هەڵسوکەوتەکانی دەگەیشتم، هەر ئەمەش بوو وای کرد منیش ڕق و ناحەزی لەبەرامبەریدا پەیدا بکەم چونکە ئەو منی وەک ئەوەی کە هەبووم قبوڵ نەبوو. من بە دووڕوو بێ بەزەیی تاوانبارم دەکرد بە جۆرێک هەندێجار دەمخستە گریان تا وای لێهات چەند جارێک سوێندی خوارد کە بمکوژێت. بەڵام دوای ئەوەی کە بۆی نەکرا، بڕیاریدا بمنێرێت بۆ بەشی ناوخۆیی قوتابخانە لە شاری قودس، قوتابخانەیەکی (فیرکاری ئافرەتانەی زایۆنی)بوو، کە لەلایەن کۆمەڵێک کەسی زۆر توندوتیژەوە بەڕێوە ئەبرا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی لە ژیاندا من تێکبشکێنن و بێ ئومێدم بکەن. بەڵام دواتر زۆر بە خێرایی خستمیانە ناو هاوسەرگیرییەکی زۆر بێ هەستانەوە کە بەتەواوی دڵی شکاندم.

## گریان ، پاڕانەوە، نەفرەتەکان:

ئەو هاوسەرگیرییە هاوسەرگیرییەکی زۆر ناپەسەندو بێ بناغە بوو. بۆیە بە هاوکاری و هاندانی خێزانەکەمان و لە کۆتاییداو دوای ١٣ ساڵ لە ئازارچەشتن، کۆت و زنجیری ئەو زەواجەم شکاند. من

پێویســـتم بە هاندان هەبوو چونکە توانای بڕیاردان و بیرکردنەوەم لەدەستدابوو، بە سەلماندنی ئەوەی کـــە بـــە تواناترین ژنیش، ئەگەر من یەکێک بم لەوان، لە کاتێکدا کە دایکایەتیەکەی لەمەترســـیدایە و پێویســـتە بڕیاری خـــۆی بدات، لەو کاتەدا ورەی بەردەدات و دەڕوخێـــت. ئێمەی ژن هەر لە منداڵیەوە لەســـەر ئەوە ڕاهاتووین کە سەیر بکەین و چاوەڕێ بکەین کەســـێکی دیکە لەجیاتی ئێمە بڕیار بدات. هەر ئەمەشە وایکردووە کە ئێمە بەردەوام لە شوێنی خۆماندایین گۆڕان ڕونادات، ئێمە تەنها بۆمان هەیە قسە بکەین نەک بە کردەوە شتێک بکەین، ئێمە بۆ گریان و پاڕانەوەو نەفرەت لێرە جێگیر بووین نەک بۆ کردار.

بۆ ماوەی چەند ســـاڵێک هەر ئەمانە کاری من بوون، تا ئەو کاتەی لە (حیلمی موراد)ەوە نامەیەک هات و بوو بە ڕزگارکەری من. موراد سەرنوســـەری زنجیـــرە کتێبێک بوو کە لە (دارالمعارف)ی قاهیرە بڵاودەکرایەوە. لەو کاتەدا (دار المعارف) بەناوبانگترین و گەورەترین خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب بوو نەک تەنها لە قاهیرەدا بەڵکو لە تەواوی جیهانی عەرەبیشـــدا. موراد پێمی ووت کە نیشـــانەکانی ڕۆماننوسێکی گەورەی لە مندا بینیوەو هەستی پێکردووە. لە ڕاستیدا ئەمەش منی بەشێوەیەک دڵخۆش کرد تا گەشـــکەداری (ئەوپەڕی خۆشحاڵی). باوەڕم پێی هەبوو دەشمویست باوەڕی پێبکەم، هەربۆیە بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەک ئەوپەڕی هەوڵی خۆمم دا تا پێشبینیەکەی هاتە دی.

ســـەرەڕای هەموو ئازار و ناخۆشیەکانی هاوســـەرگیریەکەم بۆ من دوو دەسکەوتی گرنگی تێدا بوو. یەکەمیـــان ئەو دوو کچە جوانەم بوون کە منیان بەتەواوی دڵخۆشـــکردبوو لەگەڵ ئەوەشـــدا هەســـتی دایکایەتیـــان لەلام جوانتر و گەرمتر کردبوو. دووەمیشـــیان هەلی ئەوەی پێـــدام کە بتوانم تواناکانم لە خوێندنەوەو وێنەکێشاندا بخەمەکار. لە کاتی نەبوونی بەردەوامی مێردەکەشمدا لەماڵەوە، هیچ شتێک نەبوو بتوانێت من لە گێژاوی ناخی خۆم و دڵتەنگی شـــوێنەکەم دەربازبکات، جگە لە وێنەکێشـــان و وشـــە نوســـراوەکان نەبێت. هەموو ئاوات و حەزەکانی دڵە بێبەشەکەشم لە خۆشیەکانی ژیان، هەر لەو دوو جیهانەدا دەژیان. هەســـتم کرد کە دەتوانم بەبێ ئەوەی ماڵەکەم بەجێبهێڵم بەردەوام لە گەشـــتی دەریایی و ئاسمانیدابم. ئەوەم دۆزیەوە کە توانای ئەوەم هەیە لە ڕێگەی پاڵەوانەکانی ناو ڕۆمانەکانمەوە لـــە ژیانی جیاوازدا بژیم، دەتوانم ببمە کەســـانی تر و لە هەمانکاتیشـــدا خۆم بـــم. خەیاڵکردن ئەوەی پێبەخشیم کە بتوانم بە ئازادی سەرکێشی و پلانگێڕیەکانی خۆم بهێنمە دی و هەر لە خەیاڵی خۆمدا هەمـــوو دونیام ســـەراوبن دەکردەوە. بۆ تەنهـــا جارێکیش نەدەگیرام و نە ئازاردەدرام و هیچ کەســـیش بەو ســـنوور شکاندنە شـــاراوانەی نەدەزانیم. مێردەکەم زۆر لە ئارەزو و نیازەکانم بە گومان بوو، بەڵام نەیدەتوانـــی بچوکترین تاوانیش بســـەلمێنێت تـــا وای لێهات ژیانی هەردووکمانی کرد بە بەشـــێک لە جەهەنـــەم. کاتێک بەتەواوی دڵنیا بوو دەزانم چیم دەوێت و دەمەوێت چی بکەم ئیتر بەجێم هێشـــت. چونکە من دەمویست پێشبینیەکەی حیلمی موراد بهێنمە دی، من وشە و ئایدیا و بۆچوونم دەویست، ڕەنگ و مۆسیقام دەویست.

لەماوەی ســـاڵانی هاوسەرگیرییەکەم ســـێ ڕووداوی زۆر گرنگ ڕویاندا کە پەیوەندی منیان بە دایکم و هەموو دونیاشـــەوە گۆڕی. یەکەمیان ئەو ڕووداوی هاتوچۆیە بوو کە بەهۆیەوە تەنها براکەم بڕبڕەی پشـــتی شکاو هەموو ژیانی بە شەلەلی بەســـەر برد. لە ئەنجامی ئەم رووداوە دڵتەزێنەدا خێزانەکەمان بەتەواوی لێکهەڵوەشـــا. دایکم هەموو ئارەزووەکانی بۆ ژیان لەدەســـت داو دەستبەرداری بوو. ڕووداوی دووەم، دوای ئەوەی باوکم بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک ناڕەحەتی و ئازاری چەشت کاردانەوەیەکی زۆر سەیر و جیاوازی هەبوو، لەناکاو هەســـتایەوەو دووبارە هەموو حەز و ئارەزوەکانی بۆ ژیان بەدەستهێنایەوە و

بەدوای کچێکی گەنجی قژ کاڵدا دەگەڕا بۆ ئەوەی بیکات بە هاوســەری نوێی ژیانی. هەرگیز لە ژیانمدا ئەوەنــدەی ئەو کاتە ڕقم لە ڕەگەزی خۆم نەبوەتەوە. بۆ هەموو شــوێنێک بــەدوای باوکمدا دەچووم و لێــی دەپاڕامــەوەو تکام لێدەکرد بەزەییەکی پێماندا بێتەوەو واز لــەو حەز و ئارەزوانەی بهێنێت، بەڵام ئەو لە ئاســت قسەو فرمێســکەکانمدا کەڕ و کوێر بوو. ئەو هیچ شتێکی ئەوتۆی نەووت تەنها «چیت پێبڵێم خانم، خوا ڕێگەی بەمە داوە! ئەتەوێت بمرم و هیچ ســەرکەوتن و دەسکەوتێکم نەبێت.» تەنها لەبەرئەوەی خوا ڕێگەی پێداوە، برا شــەلەلەکەم و من و خوشــکەکانم بەکەڵکی شــتی باش نەدەهاتین چونکە ئێمە نەماندەتوانی ناو و ســەروەت و ســامانەکەی بپارێزین. وتەو قســەکانی تا ئەو ڕۆژەی کە مرد دڵمیان گرتبوو. بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەک وتەکانی بەردەوام دەهاتنەوە خەیاڵم و بیرکردنەوەیان داگیرکردبووم. چەند ساڵێک پێش مردنی و ئەو کاتەی کە من بوو بووم بە نوسەر و نوسین و کتێبەکانم بڵاودەکرانەوە، جارێکیان لە پاڵ خۆمدا کتێبەکانمی بینی و وەک ئەوەی ڕاســتی بکاتەوە پێمی وت « تەنها ناوی خۆت ؟... ئەی ناوی من لە کوێیە؟ « منیش ســەیرێکم کردو وا خۆم پیشــاندا کە لێی تێنەگەیشــتووم. دوای مردنی باوکیشم، دایکم بەتەواوی بێ هیواو خەفەتبار بوو بەجۆرێک کە جگە لە جەســتەیەکی بێ ڕۆح هیچی دی نەبوو. هەموو زیرەکی و جوانی هێزو تواناکانی لەدەســتدا و لە مرۆڤ بــوون کەوتبوو، ئەوکات بۆ یەکەمجار هەســتم کرد دایکم وەکو من، وەکــو هەموو ژنێک، وەکو هەموو خوشکەکانم تەنها قوربانیەکەو هیچی دی. لە تراجیدیای ئەو و خۆمدا تراجیدیای هەموو ژنێکم دەبینی بەبێ جیاوازی عادەت و کەلتور و یاسا، هەر ئەمەش بوو منی کرد بە فیمینیستێک.

شکستەکەمان لە ساڵی ١٩٦٧دا تراجیدیای سێیەم بوو کە لە ماوەی هاوسەرگیریمدا ڕوویدا. دەمزانی شکســتی سیاسیمان دەرەنجامی شکستی کەلتوریمانە. زۆر ڕوون بوو کە ئەو کارەساتەی ساڵی ١٩٦٧ بەرهەمی درەختێکی ڕزیو بوو کە پێویســتی بە چارەسەر هەبوو. بەڵام شکستەکانی ناوەوەمان دەنگی نەدابووبوویەوە. چارەســەرکردن پێویســتە لە ماڵەکانمانەوە، ئەوانەی لە دەستەڵاتدان، لە پەیوەندی و بەها کۆمەڵایەتیەکانەوە، لە شــیرازەو چوارچێوەی خێزانەوە، لە یاساو بنەماکانی پێگەیاندنی تاکەوە لە ماڵ و قوتابخانەو زانکۆوە دەســت پێبکات. دواتر پێشــکەوتنەکە بگوازینەوە بۆ ناو جەماوەر و خەڵک. دایکان خۆیان دروســتکەری نەوەو پێگەیەنەری نەوەکانن، دایکان خۆیان نەتەوەن چونکە ســەرچاوەو کرۆکی پێگەیاندنی هەموو تاکێکی نەتەوەن.

## گەڕانەوەی خۆشیەکان:

لە تەمەنی ٣٢ ساڵیدا دووبارە هاتمەوە سەرخۆم و ئاهێکم بەبەردا هاتەوە. لە زانکۆی (بیرزەیت) و لە بەشی زمانی ئینگلیزی ناوی خۆم تۆمارکرد. ڕوخسار و هەڵسوکەوت و بەپەرۆشیم دەیتوانی هەر کەسێک کە ســەیری دەکردم فریوبدات. ڕوخســارم ١٠ ســاڵ گەنجتر دەردەکەوت و پێم وابوو بەو کارانە دەتوانم تەمەنی گەنجێتی لەدەســت چووم بگەڕێنمەوە بۆ خۆم. وەک گەنجێکی هەرزە هەڵسوکەوتەکانم دەکرد، بەخۆشــیەکی زۆرەوە لە ئاهەنگەکاندا بەشــداریم دەکرد و گۆرانیم دەوت و دانسم دەکرد و دەچوومە ناو یانەکانی شــەوانەوە. دواتریش کەوتمە داوی خۆشەویستی پرۆفیسۆرێکەوە. بۆ ماوەی چوار ساڵ هەموو دڵی خۆم و هەموو هێز و توانایەکم دا بەو خۆشەویستیە بێ ئەنجامە. کەسێکی زۆر بەبەزەیی و ڕوخۆش و زیرەک و هەستیار بوو، باشترین کەسێک بوو کە تا ئەو کاتە پێیگەیشتبم. سادە بوو وەک منداڵ، تا وام لێهات وەک خودا سەیرم دەکرد و دەمپەرست. بەدڵنیایەوە هەموو بۆچونە هەڵەکانی من بوون هانیان دەدام بۆ ئاوەها کارێک. تا ڕۆژێک لە خەوی غەفڵەت هەســتام و لە ئاوێنەدا سەیرێکی خۆمم کرد و بە

خۆمم ووت» تۆ زۆر گێل و ســاویلکەیت، ئەو خودا نییە، تەنها پیاوێکەو بەس، خۆشەویستیەکەت بۆ خودی پیاوەکە باشە نەک بۆ خۆت، ئەو خۆشەویستی و پەرستنەت بۆ ئەو خۆبەزلزانی ئەو زیاددەکات و لە خۆبایی بونیشـــی (ئیگۆ- EGO (ی زۆر دەبێت، بەڵام دڵت هیچ مانایەکی نیە بۆ ئەو» دوای چوار ســاڵ ئەو ئەمەی ســەلماند، کاتێک زۆر بە نەرمی وتی « تۆ زۆر جوان و زیرەکی، تۆ وات لێکردم کە بیربکەمەوە»

بەهۆی ســەرنەکەوتنم لەو ئەزموونە خۆشەویستیەدا ئارەزوی سەلماندنی خۆمم دۆزیەوەو مانایەک بۆ ژیانم لە ناخمدا دووبارە بوژایەوە. دوو کۆرسی خوێندنم کرد بە مۆڵەت و لەو ماوەیەدا توانیم ڕۆمانی «الصبار» بنوســم. ئەم ڕۆمانەم ســەرکەوتنێکی بەدەســت هێنا کە بەهیچ جۆرێک چاوەڕێم نەدەکرد و تەنانــەت خەویشــم پێوە نەبینیبوو. لەم ڕۆمانەمدا هەوڵم دا بزوتنــەوە رزگاریخوازەکانی کۆمەڵگەی فەلەســتینی لەڕێگەی چیرۆکی پاڵەوانەکان و چیرۆکە باوەکانەوە بە خەڵک بناســێنم. لەم ڕۆمانەمدا وێنەی شورشــگێرە ڕۆمانتیکیەکانی ئەو قۆناغەم خســتوەتە ڕوو کە ئێمە تێیدا دەژیاین، ســەرەڕای ئازارو ناڕەحەتیەکانی داگیرکاری و لەدەســتدانی هاوسەنگی بەڵام ئەو ڕۆمانە چێژێکی تایبەتی هەبوو. مەبەســتی من لە (ڕۆمانتیسیسم)، بیروبۆچوونە چەســپیوەکانی ئەوکاتەمان بوو کە شتێکی شیاوو نەبوو بتوانین بەرەو باشتر بیانگۆڕین لە هەموو ئاستەکانی تاک و گشتی و کۆمەڵگە.

لەماوەی کارکردنمدا لە ڕۆمانی «الصبار»دا بە گەنجێکی چەپ ئاشــنابووم. گەنجێکی زۆر زیرەک و بەتوانا بوو، دەیویســت دونیا بگۆڕێت، هەرئەوەی کە من هەمیشە خەونم پێوە دەبینی. بەڵام لە کوێوە دەست پێبکەین، ئەو بەوپەڕی متمانەوە وتی «لە گۆڕینی سیستەمەکان و شکاندنی یاساکانەوە دەست پێبکەین تا ببینە نمونە بۆ ئەوانی دیکە.» بەڵام من وتم بە خۆم « من هەموو یاســاکانم شــکاند بەڵام هیچ نەگۆڕا، یاســای خەڵکی هەرنەگۆڕا، سیســتەمی خێزانی نەگۆڕا، تەنانەت خۆشم نەگۆڕام. « چی شــتێک هەیە هاوشــێوەی ئەوەبێت کە ژنێک یاخی ببێت لەو کۆمەڵگەیەی کە تێیدایە؟ بەڵام ئایا هیچ کاریگەرییەکی دەبێت و دەتوانێت هیچ بگۆڕێت، تەنانەت بچێتە دەرەوەی چوارچێوەی کۆمەڵگەشەوە.

بەدەست پێکردنی گفتوگۆ لەبارەی سەرکردایەتی کردنی ئێمەوە بریارم دا بە هەڵگیرسانی شەڕێکی نــوێ. دوای ئــەوەی کە چاوپێکەوتنێکی دوورو درێژم لەگەڵ زیاتر لە (٥٠) ڕۆشــنبیر و شۆڕشــگێر و ئایدۆلۆجیســتدا بەڕێوەبرد، بریارم دا بە هەمان شێوە چاوپێکەوتنێکیش لەگەڵ خێزانەکانیان یان کچە هاوڕێکانیان یان لەگەڵ ژنە چالاکەکان بەپێی شوێن و پلەی کۆمەڵایەتیان ئەنجامبدەم. بەداخەوە ئەوەی جێی نیگەرانی بوو، ئەو بابەتەی کە بەدیم کرد لە هەموو ئەو چیرۆکانەی کە بیســتبووم، چەوساوەیی و پلە دوویی و جیاکاری ڕەگەزی بوو کە وەک ژەهرێکی کوشندە لە ژیانی من و دایکم و خوشکەکانم و هەموو ژنێکی ئەم دونیایەدا بڵاوبووەتەوە. لە هەموشیاندا وەک یەک ڕەنگی داوەتەوە بەکەمێک جیاوازی لە شێوەدا بەڵام هەمان ناوەرۆک و کێشە هەبوو. ئەم تراژیدیایە بۆ من زۆر ئاڵۆزتر بوو کاتێک هەستم کرد ئەم ژنانە ســەرەڕای ڕۆشــنبیریان هەســتی خۆ بەکەم زانی و بەکەم سەیرکردنی خۆیان کردبوو بە عادەت و لە هەســت و نەســتیاندا جێگیریان کردبوو. ئەوان زۆر باوەڕیان بەوە هەبوو هەرشــتێک ژنان بیکەن، تەنانەت خۆشیان بکەن بە قوربانی یان تەنانەت ئەگەر بەشێوەیەکی ئەکادیمی و پرۆفیشناڵی و سیاســیانەی بەرز پەروەردە ببن، ئەوا هەر لە ئاستی خوارەوەی پیاودا دەمێننەوە. قوربانیدانەکانیان بۆ پاراســتنی یەکڕیزی خێزان و بنەماڵە یان تێکۆشانەکانیان لە ئیش و کاردا ئەوەندە کەمن کە جێی بایەخ پێدان نین. دواتر بۆم دەرکەوت ئەو سەرکردانەی کە ئێمە بە پێشڕەو و شۆڕشگێڕ و پێشکەوتوخواز و ئازادیخوازمان دەزانین هیچ نین جگە لە کۆپیەکی نەوەکانی پێشوو بەڵام بە ڕوخسارێکی مۆدێرنانەو

نوێوە. فێربووم کە سـەرکردە پیاوەکانی ئێمە زۆر خراپن و شۆڕشـەکەمان شۆڕشـێکی بێ بەرهەم و سنوردار بووە چونکە بایەخی بە مەسەلە ناوخۆییەکان نەئەدا. هەموو ئەو شتانەی کە بینیم و بیستم و هەستم پێکرد مەملەکەتی ترسی لەناو مندا زیاتر و فراوانتر دەکرد. هیچ ئومێد و هیوایەک و ڕێگایەکمان نەمابوو بۆ دەرچون. ئێمە هەمیشـە تیکدەشـکێین و دەڕوخێین و دوبارە دێینەوەو هەرگیزیش ئازادی فەراهەم نابێت بۆمان. بەم بارودۆخە ناخۆش و ڕەشـەوە بوو دەسـتمکرد بە نوسینی «عبادالشمس» . کە بەهۆیەوە لە ڕووی دەروونیەوە لە چەند جارێک زیاتر توشـی خەم و خەفەت و نەخۆشـی دەروونی بووم.

## خۆ لەبیرکردن:

تراجیدییەکـی لەناکاو ڕویدا ئەویش کەوتنە داوی خۆشەویسـتی پیاوێکی تـرەوە بوو. هەرچەندە ئەو هاوسـەری هەبوو بەڵام بەپێی قسـەکانی خۆی دەیویسـت تەڵاقی بدات. زۆر غەمبار بوو هەمیشە بەدوامدا دەگەڕا و دەیوت کەسی ناو خەوو خەیاڵەکانی ئەوم. منیش بەئاسانی باوەڕم پێکرد بەڵام چەند هەفتەیەکی کەمی خایاند کاتێک ڕاسـتیەکەیم بۆ دەرکەوت کە ئەو خۆی بێزار بووەو ئەمەی تەنها بۆ ئەوە کردووە چونکە کەمێک پێویستی بە هاتنە سەرخۆو بوژانەوە هەبووە. ئەمەش تەنها توشی شۆکێک و غەم و نائومێدی نەکردم، بەڵکو شتێکم دۆزیەوە کە زۆر لەو برینە بەئازارتر بوو ئەویش ئەوە بوو کە زانیم عەقڵم هەرگیز یارمەتی نەداوم و نەیتوانیوە لە زاڵبوونی هەسـت و سۆز (EMOTION ) بەسەر بڕیار و بیرکردنەوەکانمدا بمپارێزێت. من گەنج بووم و تەمەنێکم کردبوو بەڵام هەسـتم هێشتا وەک هی منداڵێک وابوو. هەرلەبەر ئەوەش بووە هەرکاتێک کەوتبمە داوی خۆشەویستیەوە ئەو کاتە خۆم و ئیش و کارەکانم و هەموو خەونەکانم لەبیردەکرد تەنانەت دوو کچەکەشم.

ئەوەی کە دەتوانم لەم نوسـینەوە بەدەستی بهێنم بیرکردنەوەو تێڕوانینێکی قوڵی سایکۆلۆژیانەیە بـۆ ماکیاجەکانی ژنانی عەرەب. فێری ئەوە بووم کە هەسـتەکانی ئێمە هـەر لە تەمەنێکی منداڵیەوە شـێوەو شـکڵی خۆی دەگرێت و گۆڕانێکی زۆری بەسـەردا نایەت لەگەڵ گەشـەکردن و گەورەبوونی ئێمەدا. پێم وایە ئێسـتاش خاوەنی کۆمەڵێک ئومێدین کە کەمترین گۆڕانکاریان بەسـەردا هاتووە لە هەمـوو قۆناغەکانـی ژیانماندا. ئایا ئەمەش مانای وانیە کە ژنـان ئومێدیان نیە یان کەمە بە ئەنجامی گۆڕانکاریەکان یان گەیشتن بە تەمەنی پێگەیشتویی (کامڵبوون)؟ من بەتەواوی لە حاڵەتێکی شڵەژاوی و قەیرانێکـی گەورەدا بووم. جارێکـی تریش ئەدەب بوو بە ڕزگارکەرم، بەڵام ئەمجارەیان لە شـێوەی دەعوەتنامەیەکـدا بوو بۆ پەیوەندیکردن بە بەرنامەی نوسـەرانی نێودەوڵەتیەوە لە زانکۆی (ئایوا) لە ئەمریکا. ئەمەش ئەزموونێکی زۆر گرنگ و گەورە بوو بە جۆرێک کە یارمەتیدام بکەومە سەرپێیەکانی خۆم و جارێکی تر ڕۆحم بوژایەوەو ئارەزوەکانم سـەریان هەڵدایەوە بۆ گەڕانەوە بۆ ئیش و کارەکانم بە پەرۆشی و خۆشیەکی زۆرەوە.

ڕۆمانی «عبادالشـمس» بەم شێوەیەی کە باسـمان کرد هاتە بەرهەم. بەم ڕۆمانەم سەرکەوتنێکی دیکەم بەدەسـتهێنا. هەروەک ڕۆمانی «الصبار» بۆ چەند زمانێـک وەرگێڕدراو چەند جارێک بە زمانی عەرەبی چاپکرایەوە. لەگەڵ ئەوەشـدا ڕێکخراوی ڕزگاری فەلەستینی توانی مافی ئەوە بەدەست بهێنێ هەروەک ڕۆمانی «الصبار» بیکات بە زنجیرە درامایەکی درێژی تەلەفزیۆنی کە ئەزموونی فەلەستینیەکان لەژێر بارودۆخی داگیرکاریدا پیشـان دەدات. لە ڕۆمانی «عبادالشـمس»دا بارودۆخی پێکدادانی شۆڕو واقیع و بارودۆخی چاوکراوەیی و ڕاسـت بوونەوەی شۆڕشـم باسـکردووە. دووساڵ دواتر و لە ڕۆمانی»

مذكرات امراة غير واقعية» دا ژنێکم کرد بە سـەنتەری کارکردنم. ئامانجی من لەم ڕۆمانەدا پیشـانداني هەموو قۆناغەکانی ئەو ژنەیە، چۆنیەتی گەشـەکردنی هەسـت و بیرکردنەوەکانی هەر لە منداڵیەوە تا گەنجێتی و تاوەکو دەبێت بە ژنێکی بێئارام بە شـێوەیەک کە ترس و خەم و بێ هیوایی و هەسـتی خۆبەکەمزانی بەسـەریدا زاڵدەبێت. ئەو کاتەی کە لە زانکۆی (بیرزەیت) بووم ڕۆمانەکانی «الصبار» و «عبادالشـمس» و «مذكرات أمرأة غير واقعية»م نووسـی و تەواوم کردن. بەڵام دوای چەند سـاڵێک ژیانیش لەوێ ئەو خۆشـیەی پێشـتری لەدەستدا. سـەرەڕای ئەوەش بارودۆخی ئەکادیمی ئەو گەرم و گوڕیەی نەمابوو. کۆمەڵە سیاسـیەکان دەسـتیان کـرد بە جوڵانەوە لەناو حەرەمـی زانکۆداو ئێمەش بۆ زاڵبوون بەسـەر ئەو دەسـەڵاتەدا دەستمان کرد بە تێکۆشـان. دواتریش ڕۆشتمە ناو ئیش و کاری ڕێکخراوەیی و سیاسیەوە. هەرچەندە لە ڕووی سەرچاوەی داراییەوە زۆر لاوازبووین بارودۆخی سیاسیش سـتەمکارانە بوو، بەڵام یەکیەتی نوسەرانی فەلەسـتینیم دامەزراند. زۆر جاریش لەلایەن برا ئیسلامی و نوسـەرە چەپەکانەوە هێرشـم دەکرایە سەر. لە دەورووبەری سـاڵی ۱۹۸۰دا بوو هێز و ورەم بەتەواوی لاواز بوو بوو، لەبەرئەوە دەسـتم کرد بە گەڕانێک بـەدوای هەلێکی گونجاودا بۆ ئەوەی گۆڕانێک بکەم. دوو کچەکەم خوێندنی ئامادەییان تەواوکردو بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕۆشـتن بۆ دەرەوەی وڵات. هەموو ئەو هۆکارانە وایانکرد کە زانکۆی (بیرزەیت) بەبێ هیچ پەشـیمانبونەوەیەک بەجێبهێڵم. کاتێک کە لە دەرەوەش بووم خۆم خەریککردبوو بە لێکۆڵینەوەو لە دونیای ئەکادیمیشـدا ئەوەی سـودی هەبوو بۆم بەدەستم هێنا. بەڵام بۆماوەی دە ساڵ دەستم لە نوسین هەڵگرت تا ئەو کاتەی کە گەڕامەوە بۆ کەرتی خۆرئاوا و باب الساحە.

لە ئەمریکادا بە دوای پەناگەیەکی ڕۆحیدا دەگەڕام و وێڵی دوای پڕکردنەوەی کەم وکوڕیەکانم بووم. تێکچون و لەت لەت بوونی هەسـتە کەسـی و نەتەوەییەکانم بەتەواوی هەراسان و پەستیان کردبووم. سـەرنەکەوتنەکانم لە خۆشەویسـتیدا و بێزاریم لە ناکۆکی و شەڕو ئاژاوەی نێوان پارت و کۆمەڵەکان و چیرۆکی گەندەڵی و دواکەوتوویی و بوونی ئەو هەموو بیرکردنەوە پاسیڤ و لێڵە و داگیرکردنی لوبنان لەلایەن ئیسـرائیلەوە و گواسـتنەوەی سەرکردە فەلەسـتینیەکان بۆ تونس، هەموو ئەم هۆکارانە وایان کرد کە وا هەست بکەم منداڵێکی هەتیوی وون بووم لەم جیهانەدا. لەبەر ئەوە دەستم کرد بەگەڕان بۆ پەناگەیـەک و بۆ جۆرێک لە خەڵوەت و دورکەوتنەوە لە خەڵک، سـەرەنجام توانیم هەندێک حەوانەوەو ئارامی ڕۆحی و عەقڵی بۆ ماوەی چەند مانگێک بەدەسـت بهێنم. سروشـت و بازارکردنەکانم بەتەواوی باری دەروونی تێکچومی ڕاست و هێمن کردەوەو ئارامی بەخشی بە عەقڵ و مێشکم. پاشان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ خۆم خەریک کرد بە هەردوو بڕوانامەی ماستەر و دکتۆراکەمەوە.

دوای چەند هەفتەیەک لە دەستپێکردنی ڕاپەڕینی ساڵی ۱۹۸۷ ئەمریکام بەجێهێشت و گەڕامەوە بۆ کەرتی خۆرئاوا بۆ ئەوەی لە نزیکەوە هەندێ لە ڕاسـتی ڕووداوەکان بە چاوی خۆم ببینم. ژن و منداڵ ڕژابوونە سـەر جادەکان و شانبەشـانی گەنج و پیرەکان شەڕیان دەکرد، دەنگی گوللەو گازی فرمێسک ڕێژو تانکەکان هەموو لایەکیان گرتبوویەوە، مزگەوتەکانیش خاپوردەکران و سـروودی نیشـتیمانی و هەسـت بزوێن بە هەموو لایەکـدا بڵاوبووبوویەوە. ڕووداوەکان زۆر بەخێرایـی و گەرمی ڕوویاندا. ئەو ڕۆژگارانـە وەک خەون وابوون، وەک چیرۆکی قوربانیدانی ئەو پاڵەوانانە وابوو کە لە کتێبە مێژووی و داستانیەکاندا خوێندبومانەوە. ژنان بۆ هەموو دونیایان سەلماند کە ئەوان چیتر بەشێکی ناچالاک نین بەڵکو ئەوان دڵ و عەقڵ و هەست و ویژدانی زیندووی شۆڕشن. ئەنجامی ئەو ڕووداوە خێراو کاریگەرو بەهێزانە بوو بەهۆی لەدایک بوونی ڕۆمانی «باب الساحة».

کاتێک دانوستانەکانی مەدریدیش دەستی پێکرد ئێمە هێشتا لاوازی دەستی دیلی و دەست بەسەری بووین. بە هۆی ڕاپەرینەکەوە هەموو هێزو تواناکانمان لێبڕاو سست و لاواز بوو بووین. سەرکردەکانیشمان بۆ ماوەیەکی درێژخایەن پارچەپارچە بوون و جیابوونەوە ڕووی تێکردن، بە جۆرێک کە دەستەیەک پیاو خراپ دەستەڵاتیان بەسەر ژیانی ئەو خەڵکەدا گرتبوو. ئێمە لەو کاتەدا لە ژێر دوو داگیرکاریدا دەژیاین: یەکێکیـــان داگیـــرکاری ناوخۆ بوو ئەوی دیکەیـــان داگیرکاری دەرەوە بوو. دواتـــر و لەناکاو ڕێکەوتنی ئۆسلۆ ڕاگەیەنرا بە کۆمەڵێک چارەسەرەوە، لەبەرئەوە چوینە سەر جادەکان و پشتگیری خۆمان بۆ ئەو ڕێکەوتنە دەربڕی. بەڵام زۆر زوو زانیمان ئەو ڕێکەوتنە ساختەیەو ئەو چارەسەرانەش جێبەجێنەکران و تا ئێستاش وەک خۆیان ماونەتەوە. ئازادی تاکە خەونی ئێمە بوو بەڵام ئێستا بووەتە مۆتەکە بۆمان.

دەرەنجامەکانـــی ئـــەم بارودۆخە ڕۆمانی «المیراث» ی هێنایە بـــوون. «المیراث» ڕەنگدانەوەی ئەو واقیعە بوو، ڕەنگدانەوەی ئەو غەمانە بوو کە بەردەوام زیادیان دەکرد، ڕەنگدانەوەی گازندەکانی خەڵک و لاواندنەوەکانی نیشـــتیمان بوو. چیرۆکی تێکشکانی هەموو ئاستە جیاوازەکانی خەڵک بوو، تێکشکانی ســـەرکردەکان بوو بەهۆی شۆڕشەوە، تێکشـــکانی باوک بوو لەلایەن خێزانەکەیەوە، تێکشکانی هەموو منداڵەکانی دونیا بوو.

مـــن واخەریکـــە دەگەمە کۆتایی، لێرەوە بـــۆ کوێ دەچم؟ هەندێک کەس پێـــم دەڵێن «بەم زنجیرە نوســـراوانەت لەسەر ئەم بابەتە تایبەتانە ناتوانی هیچ شتێک بەدەســـت بهێنیت، چونکە ئەوەی لەناو ئەدەبـــدا دەمێنێتەوەو بێ کۆتاییە، ئەو چیرۆکە جیهانیانەیە کە لەبارەی خۆشەویســـتی، قوربانیدان، خیانەت، شەڕ، ئاشتی، غەمی جیابوونەوە، خۆشی یەکگرتنەوە، شێتی و سەرکێشی خۆشەویستەکانەوەیە نەک بابەتی تایبەتی» هەموو ئەمانە ڕاســـتن بەڵام کێ دەڵێت چیرۆکەکانم هەموو ئەم بابەتانەی لەخۆ نەگرتـــووە؟ بەو نوســـینانەم پەیوەندی نێوان تاکەکان لەلایەک و واقیعیش لەلایەکی ترەوە پیشـــانداوە. ئایا هیچ تاکێک هەیە واقیعێکی نەبێ؟ ئەمەش واقیعی ئێمەیە، واقیعی شەرمەزارکردن و لەکەدارکردنی مرۆڤـــە، واقیعی لاوازکردن و یاخـــی بوونە. واقیعێک کە مرۆڤەکان بەتاســـەی ئازادیەوەن و نایدۆزنەوە. واقیعێـــک بـــەردەوام خەڵک هەوڵدەدات و لەگەڵ هەر هەوڵدانێکیشـــدا خوێن و گەنجی زیاتر وەک نرخی شـــۆڕش دەبەخشـــن، بەڵام لەبەرئەوەی لەناوەوە ڕزیو و بۆگەن بوون هەموو خەونەکانی کردن بە خەیاڵ پەرشـــو بڵاوی کردەوە، گڕوتینی خەڵکی سەرجادەشـــی بەشێوەیەک سست و لاواز کردووە، کە هەمیشە ســـەرکەوتنەکان نەگەشـــتونەتە کۆتایی. بە بەردەوامی خەڵکی لە خەونەکانیان هەڵدەســـتن و دووبارە دەچنەوە ناو خەیاڵەکانیان تا ئەو کاتەی لەناو بەندیخانەدا ڕزگاریان دەبێت. ئێستا ئایا ئەمانە چیرۆکن یان ناچیرۆکن؟

زۆر دڵخۆش بووم بە دۆزینەوەی ئەو ڕاستیانەو خەونم پێیانەوە دەبینی. هەروەها شۆڕگێڕێکی بەهێز بووم دژ بە دەســـتەڵاتی ستەمکاری. دارخورمایەک بووم کە بەسەر شوێنێکی بەرزەوە بێت و بە هەموو لایەکدا بڕوانێ. لە ســـەرووی هەموو ترسێکەوە بووم. گەلێک خەونم هەبوو لەوانە بەرزکردنەوەی ئاستی خۆم و چاککردنی هەڵســـوکەوتەکانم و گۆڕانکاریکردن بوو لە جیهاندا و دەرخســـتنی ئەوەی لە دڵمدا هەبوو لەبەر خۆشەویستی خواو هەقیقە تەنانەت ئەگەر نرخەکەشی مردن بێت.

**سەرچاوە:**

WWW.ALJADID.COM

# وتووێژێکی تایبەت لەگەڵ دەیڤید لینچ
# کە هەموو جیهان دەگۆڕدرێ سینەماش دەگۆڕدرێ

ئامادەکردنی: سەعید کەماڵی دهقان
لە فارسییەوە: مستەفا زاهیدی

**- لە ئێران دەرهێنەرێکی خۆشەویست و ناسراون، بەتایبەت لەناو رەخنەگرانی سینەماییدا، زۆربەی ئەو رەخنەگرانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن سینەما زۆر باش دەناسن، بە دڵنیاییەوە دەربارەی بەرهەمەکانی تۆ شتێکیان نووسیوە. بەڵام هەر ئەم رەخنەگرانە لە لێکدانەوەی دوو بەرهەمی دواییتاندا بە ئاکامێک نەگەیشتوون.**

* ئەو کاتەی فیلم دەرهەست (ئینتیزاعی) دەبێ، ناکرێ بە ئاسانی قسە دەربارەی بکەی. ئەو کاتەی لەگەڵ سینەمایەکی دیاریکراودا رووبەڕوو دەبینەوە، واتە ئەو کاتەی لەگەڵ چیرۆکێکی یەکدەستدا رووبەڕووین، تەفسیرەکان زۆر جیاواز نین، بەڵام بە هەر ڕادەیەک دەرهەست بوون لە سینەمدا زیاتر و زیاتر بێت، واتە ئەو کاتەی لەگەڵ سینەمای دەرهەستدا رووبەڕوو دەبینەوە، تەفسیری جیاوازمان هەیە و جیاوازییەکانیان زۆر و زۆرتر دەبێت. کێشە لێرەدایە، ئەو کاتەی بینەران لەگەڵ جیهانی دەرهەستدا رووبەڕوو دەبنەوە، بە دڵنیاییەوە لەگەڵ تەفسیری جیاوازیشدا رووبەڕوو دەبنەوە. لایەنگرانی سینەماو رەخنەگرانی سینەماش هەر کامەیان بیرکردنەوەو ئایدیای تایبەت بە خۆیان هەیە، کە وایە سرووشتیە لەگەڵ تەفسیری جیاوازدا رووبەڕوو ببینەوە.

**- هەر چەن رەخنەگرێک بانگەشەی ئەوە بکات کە باش لە فیلمەکانتان تێگەیشتووە، هەمدیسان دڵنیا نەبوونێک دەبینین کە دەکرێ بەو پێیە رەخنە لەو رەخنەگرە بگیردرێ، ئەم بابەتە بەتایبەت دەربارەی»ئینلەند ئێمپایەر« بە روونی دەبیندرێ. بۆچوونی**

**ئێوە دەربارەی ئەم دڵنیا نەبوون و تێگەیشتنە جیاوازانە لە بەرهەمەکانتان چییە؟**

* ئەم بابەتە راست لە خودی ژیان دەچێ، لامان وایە هەموومان جیهانێکی وەک یەک دەبینین، بەڵام وا نییە. ئەو کاتەی لەگەڵ جیهانی دەرهەستدا رووبەڕوو دەبینەوە، ئەو تەفسیرانەی هەر ئینسانێک لە رووداوەکانی ئەم جیهانە دەرهەستە دەیدا بە دەستەوە، لەگەڵ تەفسیری ئەوی تردا جیاوازە. سینەماش بــە زۆری رەنگدانـــەوەی ئەو جیهانەیە کە تێیدا دەژین. ســـینەماش وەک ژیان دەتوانێ هەم جیهانێکی ئاسایی هەبێ یان جیهانێکی دەرهەستی. کە وایە لەگەڵ تەفسیری جیاوازدا رووبەڕوو دەبینەوەو رەنگە کەســـێک بە دڵنیاییەوە بڵێت ئەو شتەی کە من بیری لێ دەکەمەوە راستە بەڵام کەسێکی تریش پەیدا دەبێت پێی بڵێت نا، نا، ئەوە منم راست دەکەم و دروست بیر دەکەمەوە. دەی خۆ لە ژیانیشدا ئەم رووداوانە روو دەدەن. لە ژیانیشدا راست لەگەڵ ئەم دیاردە رووبەڕوو دەبینەوە.

**- کە وایە هاوڕای ئەو تەفسیرە جیاوازانەی کە لە فیلمەکانت دەکرێ؟**

* بەڵێ، بە تەواوی. چونکە هەر بینەرێک تەفسیر و راڤەی خۆی هەیە.

**- لە فیلمەکانی ئێوەدا و بەتایبەت فیلمە نوێکانتدا و بە تایبەت لە «ئینلەند ئێمپایەر»دا سـنووری واقیـع و خـەون بـە تەواوی دیاری ناکرێ، لە بنەڕەتدا تێگەیشـتنی ئێوە لە واقیـع و خەون چییە؟ بۆچی سنووری ئەم دوانە لە فیلمەکانتاندا ئەوەندە باریکە؟**

* بەر لە هەر شتێک پێت بڵێم کە واقیع بۆ من واتە هەموو شت. هەم جیهانی دیاری کراو و هەست پێکرا و هەم جیهانی دەرهەســـت. راســـت هەموو شتە. واقیع بوون واتە کامڵ بوون، بەڵام لە فیلمدا ئەم کامڵ بوونە بە تەواوی نیشان نادرێ، تەنها لەگەڵ چەن گرتەیەکی ژیاندا رووبەڕووین و ئەو چیرۆکەی لە فیلمەکەدا دەگێڕدرێتەوە، دەبێ بە شێوەیەکی هەستی لێی بگەی. هەر بینەرێک دەبێ بگەڕێتەوە بۆ هەستی خۆی. فیلم ئێمە دەبا بۆ جیهانێکی تر و دەبێ شتگەلێکی نوێ ئەزموون بکەین.

**- بەڵام من هێشتا قەناعەتم نەکردوە!**

* وتم واقیع واتە هەموو شت. بەڵام فیلم تەنها گرتەیەک لە ژیان نیشان دەدا و هەر چیرۆکێک، تەنیا بەشـــێکە لە واقعێکی گەورە، گەورەو گەورەتر، «ئینلەند ئێمپایەر»یش گرتەیەکە لە دیمەنێکی گەورەو گەورەتـــر. ئینلەند ئێمپایەر بەتایبەت، ئەزموونێکە لە جیهانی ژنێکی تایبەت. لەم فیلمەدا، لەگەڵ زۆر شـــتی دەرهەســـتدا رووبەڕوو دەبینەوە، بەڵام هەر ئەم شتە دەرهەستانە دەکرێ بە شێوەیەکی هەستی دەرکیان پێ بکرێت. زۆر ئەستەمە لە چوارچێوەی وشەکاندا ئەمە شی بکرێتەوە، بەڵام لە هەر بینەرێکدا بە شـــێوەیەک رەنگ دەداتەوە. کە وایە ســـینەما ئێوە دەباتە جیهانێکەوە کە تەنها لە بەر سینەما و بە بۆنەی ســـینەماوە بوونی هەیەو ئێمە تا قووڵاییەکانی ئەم جیهانە دەڕۆینە پێش و ئەزموونی دەکەین و هەســـتی پێ دەکەین. تەفســـیر و لێکدانەوەی ئێمە بۆ فیلم بەپێی ئەو شتە جوانە شکڵ دەگرێ کە من ناوم ناوە «شـــایەت». کێشە لێرەدایە ئێمە لە ژیانی رۆژانەماندا بە دیتن لە زۆربەی شتەکان دەگەین، بەڵام ئەو کاتەی دەگەینە سینەما و باس لە سینەما دەکرێ لە هەستمان کەڵک وەرناگرین.

**- ئێوە ســاڵانێکی زۆر مامۆســتای یۆگا و مدیتەیشــن** (MEDITATION) **بوون و چەن کاتژمێر لە شەو و رۆژتـــان بـــۆ ئەم کارە تەرخـــان دەکرد. جیهانـــی** MEDITATION **و یۆگا جیهانێکـــی ئارامە، کەچی لە**

**فیلمەکانتا لەگەڵ جیهانێکی سەیر و نائاسایدا ڕووبەڕوو دەبینەوە، چ کەسایەتییەکان و چ شوێنەکان! هەروەها ئاڵۆزی و پشێوی زۆر دەبینین لە فیلمەکانتدا. ئەم پارادۆکس بوونە چۆن دەبینی؟**

* بۆ هەر کوێی جیهان دەڕۆم ئەم پرسیارەم لێ دەپرسن، پێم دەڵێن دەیڤید، خۆ تۆ کەسێکی شادمانیت، یۆگا و MEDITATION دەکەیت و خۆشت لەسەر ئەو باوەڕەی کە لە MEDITATION دا لە پێشکەوتنداى، ئەی بۆ چیرۆکەکانت ئەوەندە ڕەش و شێواون.

**- ئەوی ڕاستی بێت، کێشە لێرەدایە کە ئێوە هیچکات وەڵامێکی دڵنیاکەرتان بۆ ئەم پرسیارە نییە.**

* زۆر باشە، هەوڵ دەدەم ئەم جارە وەڵام بدەمەوە. هەمیشە وەڵامی من ئەمەیە کە مۆسیقا، کتێب و چیرۆکەکان، ڕەنگدانەوەی ئەو جیهانەن کە تێیدا دەژین، ئێمەش لە جیهانێکی ئازاردەر و ئاڵۆزدا دەژین. جیهان پڕە لە ڕەنج و نەزانین و شتە خراپەکان. ئەم چیرۆکانە، واتە بیرۆکەکەیان، لە جیهانی خۆمانەوە سەرچاوە دەگرێ و چیرۆکەکان بەم شێوە بیچم دەگرن. لە چیرۆکێکی باشی ڕاستەقینەدا کۆمەڵێک لە نارامییەکان، پارادۆکسەکان و مەرگ و ژیان دەبینین. بەڵام خاڵی گرینگ لێرەدایە، هونەرمەند بۆ خستنە ڕووی ئازار و ئەزیەتی خۆی کە پێویست ناکا ئازار بچێژێ، دەبێ لە ڕەنج و ئازار بگات. تێگەیشتن باشترین کارە کە مرۆڤ لە باشترین هەلومەرجدا دەتوانێ ئەنجامی بدات و زۆر باشترە کە ڕەنج و ئازار لەسەر پەردەی سینەما یان لە کتێبەکاندا ببینین نەک لە ژیانماندا.

**- ئاخۆ لە ژیانی ڕۆحی و زەینیشتاندا لەگەڵ ئەم ئاڵۆزی و شێواوییەدا ڕووبەڕوون و هەردەم بیرکردنەوەتان پەرتە؟ بۆ هەڵهاتن لەم پەشێوییە کە پەناتان بردوە بۆ مەدیتەیشن؟**

* نە، مەدیتەیشنی باڵا (TRANSCENDENTAL MEDITATION) تەکنیکێکی زەینییە. ئەم تەکنییکە، لەڕاستییدا، جۆرێ مەدیتەیشنە کە باوەگەورەکانمان ئەنجامیان داوە، بەڵام جیاوازییەکەی ئەوەیە کە هەموو کەس دەتوانێ فێری بێ و خۆی بخاتە ناوی. خۆ خستە ناو قووڵاییەکانی توناوتوونی شاراوەی زەین و بیرکردنەوەمان. ئەزموونێک سەرتر لە ئۆقیانووسی نەمری و بێ کۆتا لە تێگەیشتنی ڕەسەن و خۆشحاڵانەی ئینسان. ئەم ئۆقیانووسە، وزەیەکی تەواوە لە زانستی مۆدێرن و شوێنێکە هەموو سەمبول و بیرکردنەوەکانی مرۆڤایەتی لەوێیە. ئەو کاتەی خۆت دەخەیتە ناو ئەم قوڵایانەوەو وەها توێژگەلێکی قووڵی زەینی دەبینی، ئەو کاتەی لەوێدا دەژیت و لەگەڵی گەورە دەبیت، ژیانتان باشتر و باشتر و باشتر دەبێت. ئەم تێگەیشتنە ڕەسەنە، تایبەتمەندی گەلێکتان پێشکەش دەکات، هۆش و بیرێکی ناکۆتا، ئەوپەڕی شادی و خۆشحاڵیی، داهێنانی بێ سنوور، وزەی لە بێخ نەهاتوو، ئارامییەکی تەواو، عەشقێکی بێ سنوور، واتە بە یارمەتی ئەم شێوەیە دەتوانی قووڵترین توێژ و چینەکانی ژیان ئەزموون بکەی. ئەو کاتەی لە یەکەم مەدیتەیشنەکانەوە، مەدیتەیشنی باڵا ئەزموون دەکەن، تایبەتمەندیگەلێک لە ئێوەدا گەشە دەکا و هێدی هێدی ڕەشبینی لە ئێوەدا کەم دەبێتەوەو قەیرانەکان، دڵەڕاوکەکان، سترێسەکان، خەم، تووڕەیی و ڕق و ترس لە ئێوەدا لەناو دەچێ. هەموو ئەم ئاکارە خراپانەتان لێ دوور دەکەوێتەوەو بە ئازادییەکی زۆرترەوە باشتر و باشتر کار دەکەن. ئەو کاتە شادتر دەبی و کاری باشترت لەدەست دێت. ئایدیای باشتر بە زەینتان دەگا و داهێنانی زۆرترتان دەبێ. وزەتان زۆرتر دەبێ و زیاتر قەدری ژیان و کێشەکانی دەزانن و تێگەیشتنتان لە ژیان و کێشەکانی زۆرتر دەبێت. مەدیتەیشنی باڵا بەڕاستی شتێکی سەرسووڕهێنەرە.

**- لە ڕۆژدا چەندە پرۆڤەت هەیە؟**

* بیســـت خولەک بەیانیان و بیســـت خولەک دوانیوەڕوان. ئەو کاتەی ئەم پرۆڤەیە بە ڕێک و پێکی ئەنجام دەدەی و دەڕۆیتە سەر کار دەبینی ژیان چەند باشتر دەبێت. با شتێک بزانی، مەدیتەیشنی باڵا ئایین یان ئایینزا نییە، تەنها تەکنیکێکی زەینە و لەگەڵ هیچ باوەڕێکدا دژایەتی نییە. تەکنیکێکە بۆ هەموو مرۆڤەکانی سەر زەوی، لە هەر کوێ بن.

**- دامەزراوەی دەیڤید لینچیش لەم بوارەدا کار دەکات؟**

* بەڵێ، دامەزراوەی دەیڤید لینچ بە مەبەســـتی زانیاریدان و فێرکردنی مەدیتەیشـــن دامەزراوەو لەو داهاتەی بە دەستی دێنێ، کەرەسە و ئامرازە پێویستەکان دەخاتە خزمەت هەر خوێندکار و فێرخوازێکەوە کە پێی خۆشـــە مەدیتەیشـــن بکات، یان هـــەر قوتابخانەیەک کە بیهەوێ ئەم خولـــە بۆ قوتابییەکانی بکاتەوە. تا ئێســـتا، لە ویلایەتە یەکگرتوەکان، بیست قوتابخانە و هەزاران خوێندکار پەروەردە کراون. بیســـت و نۆ وڵاتمان لە ئەمریکای باشـــوور پاراستووەو کۆمەڵێک بەرنامەشـــمان لە وڵاتانی ئەمریکای باشـــوور بووە. دوو وڵات لە ئەفریقای باشـــوور لە ژێر چەتری ئێمەدان و ئێســـتا لە ئەورپاش خەریکی کارین. خەڵکیش پێشـــوازی باشـــی لێ دەکەن، چونکە شێوازەکانی تریان تاقیکردۆتەوەو لایان وا نەبوو مەدیتەیشن وەڵام بداتەوەو سەرکەوتووبێت، بەڵام کە دیتیان قوتابخانەکان زۆر باش کاردەکەن، ئەوانیش هاتوون و خوازیارن لە قوتابخانەکانیاندا ئەم چالاکییانە ڕێک بخەن، چونکە بەڕاســـت ســـەرکەوتووەو مرۆڤ دەباتە قوڵترین توێژ و چینەکانی ژیانەوە.

**- جیهانی فیلمەکانی دەیڤید لینچ، لانیکەم چەند تایبەتمەندیەکی دیاریان هەیە، یەکیان کەڵکەڵەی «شوناس»ە. چ لە فیلمە سەرەتاییەکانتاندا وەک»پیاوی شێوە فیل» کە بە ڕوونی ئەم کەڵکەڵەیە دیارەو چ لە «ئینلەند ئیمپایەر» کە کەسـایەتی سـەرەکی فیلم، بە ڕواڵەت تووشی قەیرانی شوناس بووە، بۆچی ئەوەندە کەڵکەڵەی شوناستان هەیە؟**

* ئـــەوی ڕاســـتی بێت ئەم بیرۆکانەن کە ئێمە پێش دەخەن. هیـــچ کات من دەربارەی ناوەڕۆک یان هەڵهێنجانەکانـــی فیلمەکانم قســـەم نەکردوە. تەنهـــا بیرۆکەیەک دەگاتە زەینـــم و بەپێی ئەو بیرۆکە دەڕۆمە پێش، تەواو وەک ئەکتەرێک کە ڕۆڵ لە فیلمێکدا دەبینێت، ئەو ڕۆڵە بیرۆکەیەکە، هەموو کارم ئەوەیە بیرۆکەکان ببینم و ببیســـتم و هەســـتیان پێ بکەم. من بە دوو هۆکار عاشقی بیرۆکەکان دەبم. یەکەمیـــان لەبەر خـــودی بیرۆکەکە و ئەویتریان ڕێگایەک کە ســـینەما بتوانێ ئەم بیرۆکەیە دەرببڕێ. ئەمە بیرۆکەکانن من دەبەنە پێش، ڕەنگە خۆشـــم لە ســـەرەتادا لە مەبەســـت و ناوەڕۆکی بیرۆکەیەک کە دەگاتە زەینم نەگەم، بەڵام دەربارەی بیردەکەمەوەو هەر لەم ســـاتەدا کوت و پڕ شـــتێ دەردەکەوێ، مانایەک دەردەکەوێ. بەڵام بەمانەشەوە، من بۆ خۆم لێی دەگەم، وەک هەر بینەرێکی تر کە کاتێک فیلم دەبینـــێ، بـــۆ خۆی و لە ڕوانگەی خۆیەوە لێی تێدەگات، نەک بۆ ئـــەوان و لە ڕوانگەی ئەوانەوە. ئەگەر هەســـت دەکەی فیلمەکانم دەربارەی شوناســـن، زۆر باشە، منیش لام وایە، بەڵام ڕەنگە بۆ کەسێکی تر بە تەواوەتی شتێکی تر بێت.

**- ئایا لات وا نییە مرۆڤەکان تووشـی قەیرانی شـوناس بوون و هۆی هۆگری ئێوەش بە «شـوناس»هەر ئەمەیە؟ ژیانی مۆدێرن و قەیرانی شوناس پێکەوە گرێ دراو دەبینی؟**

* مرۆڤەکان هەردەم لە رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ قەیرانەکاندان، قەیران لەدوای قەیران. وەک دەزانی بە رواڵەت ژیان پڕە لە پشێوی، بەڵام لام وایە بۆ گەیشتن بە ئارامی رێگا چارەیەک بوونی هەیە.

- ئەم رێگاچارەیە چییە؟

* کلیلـــی ئارامـــی بۆ هەر مرۆڤێک، بە بـــاوەڕی من، ئەزموون کردنی قووڵتریـــن توێژەکانی ژیانە بەشـــێوەی مەدیتەیشـــنی باڵا، بەوەی کە رۆژی دوو جار پرۆڤەی بکەین. ئەو کاتەی راهێنانت دەســـت پێکرد و کات تێپەڕی، لەگەڵ ئەو نوورە ناکۆتایەو هۆش و بیری درەوشاوەو داهێنان و شادییدا رووبەڕوو دەبیتـــەوە کـــە لە دەروونـــی تۆدایەو ئەو کات دەزانی ژیان چەندە باشـــتر دەبێـــت. کلیلی ئارامی لەم جیهانەدا، ژیانە لەگەڵ ئەم هێزە ئەبەدیەدا، ئەم هێزە یەکدەســـتە، ژیانە لەگەڵ ئارامیدا، دروستکردنی گرووپی مەدیتەیشـــنە لە دنیادا. باوەڕکە ئەگەر وەها شتێ رووبدات، دەبینی کە شادی هەموو جیهانی گرتۆتەوە. بەم شـــێوەکارە، ئارامی راســـتەقینە دەردەکەوێ، چونکە ئاشـــتی و ئارامی، نەبوونی جەنگ نییە. ئاشـــتی نەبوونی شتە نێگەتیڤ و خراپەکانە لە جیهاندا. بە ژیانەوەی مەدیتەیشنی باڵا و پرۆڤە کردن لەســـەری دەتوانین ئارامی بگەڕێنینەوە بۆ مرۆڤەکان. بەژیانەوەی مەدیتەیشـــن، واتە ئەو هێزە سەرســـوڕهێنەرەی کە هی هەموو مرۆڤەکانە، رووناکی یـــەک بوون لەناو هەموو رەگەز و کەلتوورەکاندا دەبیندرێ و هەموو رەگەز و کەلتوورەکان رێزیان دەبێت بە لامانەوە. بە بوونی گرووپەکانی مەدیتەیشن، گرووپێک لە پســـپۆرانی لێهاتووی مەدیتەیشـــن کە بتوانن ئەم هێزە سەنترالەی شعور و تێگەیشتنی مرۆڤـــەکان زیندوو بکەنەوە، ئەم ئارامیە بەدی دێت. بەڵام دەزانی کێشـــە لە چیدایە؟ کێشـــە لێرەدایە ئەم مەدیتیتۆرە پســـپۆرانە لە وڵاتەکاندا دەگمەنن. لە باری ئامارییەوە تەنها کەمتر لە یەک لە سەدی مرۆڤەکانی هەموو وڵاتەکان وەها هێزێکیان هەیەو وزەیان ســـەنتراڵە. وزەی ســـەنتراڵ واتە شوێنێک کە هەموو هێزەکان لەوێدا کۆبوونەتەوەو بە ئاســـانی دەکرێ بەکاربهێندرێن. کە ئەم وزەیە ئازاد بکرێ، بە شـــێوەیەکی ســـەنتراڵ بە خێرایی رووناکی دەڕواتە پێش. چونکە هێزەکان لەم بەشەی وزەی سەنتراڵدا کۆبۆتەوە. هەر بۆیە، پســـپۆرانی لێزانی مەدیتەیشن، بە شـــێوەی گرووپ لەناو تازە فێر بوواندا پرۆڤە و راهێنـــان دەکەن، چونکە وزەی گرووپ زۆر زیاترە لـــە وزەی مرۆڤەکان بە تەنهایی، دەزانی دەکرێ چ بکرێ؟ دەکرێ گرووپ ســـاز بکرێ، یان تەنانەت قوتابخانە ســـاز بکرێ، تاقمێک لە قوتابییەکان ئەم تەکنیک و شـــێوە کارە پێشـــکەوتووە فێر ببن؟ هەروەها قوتابییەکانیـــش دەتوانن هەموو رۆژێ دوو جـــار ئەم راهێنانە بە گرووپ ئەنجام بدەن و بەم کارە تیشـــکی وزەکانیـــان بڵاودەبێتەوەو هەموو وڵات دەگرێتەوە. باوەڕکە، ئەم کارە زۆر زۆر ســـەرنج راکێش و ســـەیر و ســـەمەرەیە. هەر رۆژەو کەســـانێکی زیاتـــر خوازیاری ئەوەن ئەنجامی بدەن و پشـــتیوانی لێ دەکـــەن. زۆر قوتابخانە لە ئەمریکا خوازیاری سازدانی خولەکانی مەدیتەیشنی باڵان، چونکە بە چاوی خۆیان بینیویانە ئەم راهێنانە چەند بەکەڵکە بۆ قوتابییەکان. باوەڕ ناکەن، بەڵام مەدیتەیشنی باڵا، قوتابیانی مەترسیدار، تووڕەو خەمۆکی گۆڕیوەو ئەوانە هەمدیسان گەڕاونەتەوە بۆ قوتابخانەو جارێکی تر لەگەڵ ئەوانی تردا هاوکاری و هەڵسوکەوتیان کـــردوەو جارێکی تر رێزیان لە مامۆســـتاکەیان گرتووەو دەســـتبەرداری توندوتیژی بوون. باوەڕ ناکەن مەدیتەیشـــنی باڵا بەری بە چ خۆکوشـــتنگەلێک گرتووەو چ کەسانێکی لە خەمۆکی رزگار کردووە. ئەم وزەیـــە، وەزیەکە کە هەموو مرۆڤەکان هەیانەو کاتێک کەســـێک چالاکی دەکاتـــەوە، لە بنەڕەتدا وزەی نووســـتووی تەواو و بێئەندازەی خۆی چالاک کردۆتەوە و وزەی نووســـتوو و بێ ئەندازەی مرۆڤ، واتە زانینی راســـتەقینەو رووناکی بیر. پـــەروەردەو راهێنان، دەبێ ئەم وزە نووســـتووەی قوتابییان چالاک

بکەنەوەو باوەڕکەن بەوەی کە مەدیتەیشن ئەم کارە دەکات. کە مەدیتەیشن بکەن، فێری زانستی هۆش دەبن و لە دەرس خوێندنیشدا سەرکەوتووتر دەبن. دووجار پرۆڤە و راهێنانی مەدیتەیشنی بەرز لە رۆژدا و زینـــدوو کردنەوەی قووڵترین توێژەکانی ژیان و پـــەروەردە کردنیان، ئەنجامەکەی دەبێ بەهۆی زیاتر بوونی رۆژی توانایی داهێنان و شادی و ئەمەش واتە وزە جیاوازەکانی مرۆڤ زۆر دەبێ و مرۆڤەکان زیاتر و زیاتر عاشق دەبن. مەدیتەیشنی بالاّ بێ یەک چرکە وەستان، هەموو شتێک بەرەو باشە و بیرکردنەوەی پۆزەتیڤ دەباتە پێش.

**- بــە خوێندنــەوەی کارنامــەی دەرهێنەریــی ئێــوەو ئــەو وتووێژانەی کــە ئەنجامتــان داوە، پێدەچێ «ناکاوگــەری AD-LIB» دەورێکــی زۆری هەیــە لــە بەرهەمەکانتاندا. بۆ وێنە لــە دیمەنێکدا لە خۆڕا «لە ناکاو» شــتێک دەڵێن، یان چەند شــتێک لە چیرۆکەکە دەگۆڕێ. تا چەند «ناکاو» بێژی بە لاتانەوە گرنگە.**

* نە، من «ناکاوگەری» ناکەم، «لە ناکاو» بەو مانایەیە کە نازانی دەتەوێ چ بکەی و چی ئەزموون بکەی، بەڵام من دەزانم. کە بیرۆکەیەک بە زەینم دەگات، دەیبینم، هەســـتی پێ دەکەم و دەیبیســـتم و دەزانم راســـت دەمەوێ چ بکەم. کە بیرۆکەیەک بە زەینـــم دەگات، تەنها کارێ کە دەبێ ئەنجامی بدەم ئەوەیە ئەکتەرەکان لەگەڵ ئەو بیرەدا ئاشنا بکەم. تیمی پشتیوان، بەرهەمهێنەرانی دیمەن و هەر کەس کە لەگەڵم کار دەکات دەبێ لەگەڵ ئەو ئاشـــنا بێت. دەڕۆم و لەگەڵیان قســـە دەکەم و بیرۆکەکەمیان بۆ شـــی دەکەمەوە. پرۆڤە دەکەن و دۆخە جیاوازەکان تاقی دەکەنەوەو هەوڵ دەدەن لەگەڵ بیرۆکەکەدا رێکیان بخەن. کە هەموو شت لەگەڵ ئەو بیرۆکەدا رێکخرا، کە هەموو شت کەوتە سەر هێڵێک و کەوتە جووڵە، واتە کە هەموو شـــت کەوتە ژێر فەرمانی ئەو بیرەوە، دەتوانین بە باشـــی بیهێنینە چوارچێوەی سینەماوەو بە وەفاداری بمێنینەوە بۆی.

**- یانی هیچ کارێک لە «ناکاو» ئەنجام نادەن؟**

* نە، خۆ وتم، «لەناکاو» واتە نازانی چی دەکەی و نازانی چ شتێک بۆ بە ئامانج گەیاندن ئەزموون بکەی، بەڵام بیرۆکە بە ئێوە دەڵێت دەبێ چی بکەیت و دوای چی بکەوی.

**- بۆچـــی کە دەچیتە ســـەر دیمەنـــی وێنەهەڵگرتن، رەوتی کارکردن بە لاتـــەوە ئاڵۆزتر دەبێت؟ واتە لە پێشدا ناتوانی ئەو شتانە پێشبینی بکەی؟**

* نا، بەرلەوە ناکرێ پێشـــبینی بکرێن. کە خەریکی ســـازکردنی فیلمی، فیلم نامە تا ئەو کاتەی فیلمەکـــە کۆتایی نەهاتووە، تەواو نابێت. زۆر بیرۆکە لە زەینتدایە و ئەو بیرۆکانە دەکەیتە فیلمنامە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە فیلم تەواو بووە. کە بیرۆکەیەک دێ بە مێشکتاندا، تازە کار دەست پێدەکا و دەبێ بیکەی بە فیلم و بیهێنیتە پانتای ســـینەماوە. سینەما واتە دەنگ و دیمەن، پێکەوە دێن و کە خەریکی ســـازکردنی فیلمێکی بیرۆکەیەکی نوێ بە زەینتـــان دەگات، یان رووداوێکی باش روو دەدات، رەنگە هەموو شت کوتووپڕ بگۆڕێ. دەبێ بیخەیتە سەر فیلم نامەکەو بەجۆرێ بینووسیتەوە کە خودی ئەو بیرۆکەیەی بەدڵتە، بنووســـێتەوە. کە وایە فیلم نامەش تا ئەو کاتەی فیلم کۆتایی نەیەت کۆتایی نایـــە. کـــە دەڕۆیتە پێش، بیرکردنەوەی خراپ بە زەینت ناگات، لەبـــری ئەوە زۆر بیرکردنەوەی باش بە زەینت دەگات و ئەو کاتەیە مرۆڤ بە خۆی دەڵێت، ئەی خودا، ئەم بەشـــە بەجێماوە. دواتر بە جوانی

ئەو بەشە تاوتوێ دەکەیت و کەڵکی لێ وردەگری. هەمدیسان دەڵێمەوە تا فیلم تەواو نەبێت فیلمنامە تەواو نابێت.

**- بە رواڵەت «ئینلەند ئێمپایەر»تان بە بێ فیلمنامە ساز کردوە، ئەمە شتێکە زۆر جار لە زمانی ئێوەوە گێڕاویانەتەوە. دەکرێ دەربارەی بیرۆکەی «ئینلەند ئێمپایەر» قسە بکەی؟**

* نا، وا نییە، دەزانی من ڕاستی چیم کردوە؟ بیرۆکەیەکی زۆر باش بە زەینم گەیشت و دەستم کرد بـــە وێنە گرتن. بەڵام قەت بیرم لـــەوە نەدەکردەوە بڕیارە فیلمنامەیەکی تەواو کامڵ بێتە بەرهەم. بەڵام عاشـــقی ئەو ئایدیا سەرەتاییەم بووم و دەستم کرد بە وێنەگرتن. سەرەتا نووسیمەوە، واتە فیلمنامەی ئەو بیرۆکە ســـەرەتاییەم نووســـیوە و چەند ئەکتەرم هێنا و وێنەم گرت. دواتر کتوپڕ بیرۆکەیەکی تر بە زەینم گەیشـــت، هەمدیســـان نووسیمەوەو رۆشـــتم و وێنەم لێ هەڵگرت، بەڵام بیرۆکەی دووەم هیچ پەیوەندییەکی بە بیرۆکەی یەکەمەوە نەبوو، کتووپڕ بیرۆکەی ســـێهەم بە زەینمدا هات، نووســـیمەوەو رۆشـــتم وێنەم گرت، ســـەیر ئەوەیە ئەوەش هیچ پەیوەندییەکی بە دوو بیرۆکەکەی پێشـــترەوە نەبوو. کتووپـــڕ بیرۆکەی زۆر بە زەینمدا هات و ئەوانە بوون کە هەموو بیرۆکە پێشـــترەکانیان پێکەوە گرێ دایەوە. لە ماوەی نووســـینی فیلم نامەشـــدا ئەمە رووی دا. بەڵام لەبارەی «ئینلەند ئێمپایەرەوە» من بەرلـــەوەی فیلم نامەیەکـــی کۆتاییم هەبێت، دیمەن بە دیمەن وێنەم گرت و کـــە فیلم تەواو بوو، فیلم نامەکەش تەواو ببوو. تێدەگەی چی دەڵێم؟

**- واتە فیلم نامە دیمەن بە دیمەن تەواو دەبوو؟**

* بەڵێ، تەنها چەند لەتێک لە فیلمەکەم هەبوو و بەپێی ئەوە فیلم نامەکە تەواو بوو.

**- لـــە بنەڕەتـــدا چ روانگەیەکتان دەربارەی «فیلـــم نامە» هەیە؟ فیلم نامە بە لای ئێوەوە چ پێگەیەکی هەیە؟**

* ئەگـــەر بکـــرێ فیلم نامەکان بەر لە وێنەگرتن بە تەواوەتی بنووســـرێنەوە زۆر باشـــە، بەڵام بۆ مـــن، لانیکەم بۆ من، فیلم نامە تەنهـــا مادەیەکی خاوە. کە خەریکی خانوویەک ســـاز دەکەی، لەگەڵ نەخشەیەکی بیناسازی یان گەلاڵەیەکی خاودا سەرو کارت هەیە. ئەو گەلاڵە خاوە،ماڵەکەت نییە، تەنها گەلاڵەیەکی خاوە. کە خەریکی سازکردنی ماڵەکەی خۆتی، رەنگە بە خۆت بڵێیت: ئۆو، لام وابوو ئەگەر وا بێت باشترە، بەڵام ئێستا ئەمەم هەر پێ جوان نییە. پێم خۆشە ئەم ئاتەشگە (شۆمینە) لەولاوە دانێم نەک لەملاوە. کە شـــتێک لەبەرچاوتانە، دەیگۆڕی. فیلم نامەش شـــتێکی زۆر زۆر گرنگە، بەڵام هەموو شت نییە و فیلم نامە هەموو شت دیاری ناکات.

**- هـــۆکاری ئـــەوەی کە فیلـــم نامە نادەی بە ئەکتەر، ئـــەوە نییە کە بتەوێ ئەکتەریش هەمان هەســـتی هەبێت کە بینەر هەیەتی؟ واتە بە هەمان شـــێوە کە بینەر لە دیتنی شـــتێک، یان بیســـتنی شـــتێک، سەری سووڕ دەمێنێ، ئەکتەریش بە رادەیەک ئەم سەرسوڕمانە ئەزموون بکات؟**

* نا، ئەکتەرەکان کاری خۆیان دەکەن، دەبێ ئەو رۆڵەی پێیان دەســـپێردرێ بگێڕن. دەبێ لەگەڵ کەســـایەتی خۆیاندا ماڵئاوایی بکەن و رۆڵی تازە هەڵبژێرن و تا ئەو شـــوێنەش کە دەتوانن ئەو رۆڵە بە شـــێوەیەکی راستەقینە بگێڕن. کە وایە هەر لە بەر ئەمەیە، بۆ ئەوەی خۆیان لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا

ڕێک بخەن، دەبێ زۆر پرۆڤە و باس و وتووێژ بکەن. کاتێک لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا خۆیان ڕێک خست و بە باشـــی لە دەورەکەی خۆیان گەیشتن، شتەکانی تر بە شێوەی پەرچوو ئاسا دەڕواتە پێش و هەموو هۆش و زرنگیی ئەکتەر دەپشکوێت.

**- بــەڵام یەکێــک لە ئەکتەرەکان «تۆئین پیکس» لە وتووێژێکــدا وتبووی لە کاتی وێنە گرتندا، هیچ شتێکی دەربارەی ڕۆڵی خۆی نەدەزانی.**

* نا، ئەکتەرەکان بە باشی ئاگاداری ڕۆڵی خۆیانن، بەڵام ڕەنگە نەزانن هەموو چیرۆکی فیلمەکە بە چ ئاقارێکدا دەڕوات. زۆربەی کاتەکان خۆشم لە سەرجەم چیرۆکەکە بێ ئاگام و نازانم سەرەنجام بڕیارە چی ڕوو بدات. دەبێ چاوەڕوان بیت ســـەرجەم فیلمەکە کۆتایی بێت و دواتر بە تەواوی دەربارەی قســـە بکەیت. ئەگەر ســـەرجەم ئەم لەتانەی کە مەبەســـتمانە، لە شوێن خۆیاندا بن، ئەو کاتە دەکرێ هیوادار بین هەموو شـــت لە جێگای خۆیدایە. کە وایە پێویســـت ناکات ئەکتەر لە سەدا سەد ئاگاداری سەرجەم چیرۆکەکە بێت. ئەکتەر تەنها دەبێ ڕۆڵەکەی خۆی بە باشی بناسێت.

**- چیرۆکــی فیلمەکانــت هەندێ جار دەبن بە مەتەڵگەلێکی لــەت لەتەوە. لە بنەڕەتدا ئەو چیرۆکانەی لە فیلمەکانتدا دەیگێڕیتەوە هەندێ جار مەتەڵ و ڕەمز و ڕازی دژوارن کە هەڵهێنان و چارکردنیان کارێکی ئەســتەمە. مەبەســتی ئێوە لەم کارە، واتە دروســت کردنی ئەم پازڵانە، تەنها ســەرقاڵ کردنە یان کارێکی تایبەتت بۆ ئەم لایەنە مەتەڵییەی فیلمەکانت هەڵبژاردووە؟**

* نە نە، نە وا نییە. ئەم مەتەڵانە بۆ خوڵقاندنی جیهانێکن، بۆ خوڵقاندنی جیهانێک کە ڕێک لەگەڵ ئەو ئایدیایانەدا بێتەوە کە من عاشـــقیانم. ئەو کاتەی کە کار تەواو بوو و فیلم نامەی کۆتاییش ئامادە بوو، دەکرێ بیخوێنیتەوەو لە هەموو شت بگەی. ئێمە ئایدیا و بیرۆکەکان بە زمانی سینەما دەردەبڕین و بــە خوڵقاندنی جیهانێک، بینـــەر دەبەینە قووڵایی ئەو جیهانەو لەگەڵ ئەزموونی سەرســـووڕهێنەردا ڕووبەڕووی دەکەینەوە. ڕەنگە ئەو پازڵانەی کە باســـیان دەکەی، ســـەرقاڵ کەریش بن، بەڵام لە جیهانی ئـــەو فیلمەدا دەورێکی گرنگتریان هەیە و لەو جیهانە تازە خوڵقاوەدا، زیندوون. لە راســـتیا ســـینەما شتێکی بەهێزو توانایە.

**- چ چاوەڕوانییەکت لە بینەری فیلمەکانت هەیە؟ ئاخۆ چاوەڕێی ئەوەی بینەری سینەمای ئێوە کەسانێکی زیرەک و وریا بن؟ باشتر وایە بڵێین فیلمەکانت بۆ کێ ساز دەکەی؟ هەمان ئەو بینەرانەی لە دیتنی فیلمە ئاسانەکان چێژ وەردەگرن؟**

* لەگەڵ ژمارەیەکی جیاواز لە بینەردا ڕووبەڕووین. من هیچ چاوەڕوانییەکم نییە. ئەگەر ئەو شتەی کە خەریکم ســـازی دەکەم، بە لای منەوە شـــتێکی ڕێک و پێک بێت، کە وایە ڕەنگە ئەوانی تریش وەها هەستێکیان دەربارەی هەبێت. بەڵام وەها نییە کە من بە کەسێک بڵێم چۆن بیر بکاتەوە، یان چۆن بیر دەکاتەوە. من تەنها بیر لەوە دەکەمەوە ئاخۆ ئەو شتەی سازم کردوە بە لای خۆمەوە مانایەکی هەیە یان نا، هەڵبەت هیوادارم بۆ ئەوانی تریش مانایەکی هەبێت. خۆشـــم دەزانم بەشێک لە فیلمەکانم بەتایبەت «ئینلەند ئێمپایەر» زۆر دەرهەستە و زۆر کەس حەزی لێ نییە، بەڵام هەندێ کەسی تر بەڕاست شەیدای ئەو فیلمەن.

**- لات وا نییــە فیلمەكانــی دەیڤیــد لینچ ئەوەندە كۆددار و پڕ نهێنین كە بــە كردەوە تەنها ژمارەیەكی تایبەت بینەری هەیە و ژمارەیەكی زۆر لە جەماوەرە ئاساییەكانی لە خۆی دوورخستۆتەوە؟ ناترسی لەوەی جەماوەر لەدەست بدەیت؟**

* نا، ناترســم. چونكە ناتوانم شــتێك ســاز بكەم كە عاشــقی نیم و ئەم فیلمانەش ئەو ئیدە و بیركردنەوانەن كە من عاشــقیان بووم و دەبایە هەر بەو شــێوەیە سازم كردبان. مەبەستم چییە؟ ناچار بووم بەو شــێوەیە ســازیان بكەم. ئەگەر عاشــقی چیرۆكێك بم كە تێگەیشتن لێی ئاسانترە، هەڵبەت ئەگەر بەڕاستی عاشقی بم، دڵنیا بن ئەم چیرۆكە سادەیەش دەكەم بە فیلم.

**- یانی جەماوەر بەلاتەوە گرنگ نییە؟**

* با، گرنگە، بەڵام ئایدیاو و بیركردنەوە بەلامەوە شتێكی گرنگترە. بۆ من گرنگتر ئەوەیە ئەو ئایدیا و بیركردنەوەیە بە زمانی ســینەما دەرببڕم، بەو شێوەیەی خۆم پێم پەسەندەو وەك وتم دواتر هیوادارم ئەوانیش بە دڵیان بێت. بەڵام خۆشــم ئەم شــتە بە باشــی دەزانم كە ســینەمای من سینەمای بازاڕی هۆلیوود نییە.

**- بۆ هەست بە نزیكایەتی كردن لەگەڵ فیلمەكانتدا چ پێشنیارێكت هەیە؟ یان لات وایە دەرهێنەر دەبێ پێشنیارێكی هەبێ بۆ بینەرانی؟**

* بەڵێ، دەتوانم پێشــنیاری ئەوە بكەم دەســت بكەن بە مێدیتەیشنی باڵا و هۆش و خۆشحاڵی و داهێنان و تێگەیشــتن و زانیاری و فامیان گەشــە پێبدەن و گرنگتر لە هەمووان دید و بینینی خۆیان زیاتــر بكەن. زانســت لــە هەموو مرۆڤەكاندا هەیە، كــە وایە دەكرێ ئەزمونی بكــەن، دەبێ ئەو هێزە ســەنتراڵە زیندوو بكەنەوەو بە شێوەی ئەو تەكنیكە ســادەیە، باوەڕكەن، هەموو شت جوانتر دەبێت. ئەگــەر بینەر بتوانێ هێــزی «بینین»ی خۆی بەرز بكاتەوە ئەو كات دەتوانێ زۆر باشــتر و هەڵبەت ئاسانتر لە هەموو شت بگات.

**- ژمارەیەك لە بینەران، لانیكەم بەشێك لە هاوكارەكانی من لە ئێران، لایان وایە بۆ دیتنی فیلمەكانی ئێوە دەبێ كۆمەڵێ شت تێپەڕ بكەن، وەك ئەوەی بە باكگراوندێكیان هەبێت ئینجا فیلمەكانی دەیڤید لینچ ببینن. بۆ وێنە دەبێ پێشتر كۆمەڵێك فیلمیان دیتبێت، لەگەڵ كۆمەڵێك لە چەمكەكاندا ئاشنا بن.**

* نا، نا، هیچ وەها نییە. كێشە لێرەدایە خەڵك باوەڕیان بە تێگەیشتنەكانی خۆیان نییە. باوەڕیان بە هەستیان نییە. بۆتان باس دەكەم كە چۆن ئەم شتە روو دەدات. گریمان كەسێك لە ساڵۆنی سینەما دێتە دەر و من لەم فیلمە هیچ تێنەگەیشــتم! زۆر باشــە، ناوی ئەم كەسە دەنێم «سالی». سالی باس لەوە دەكات كە ئەو لەو فیلمە هیچ تێنەگەیشــتووە. بەڵام هەر ئەم ســالیە هاوڕێ لەگەڵ كیم و جۆن و چەند هاوڕێی تری، دوای فیلم دەڕۆنە كافتریایەك و دەســت دەكەن بە قســەكردن دەربارەی فیلمەكە. باب دەســت دەكات بە قســەكردن و بۆچوونی خۆی دەربارەی فیلمەكە دەردەبڕێ و كتوپڕ سالی دەڵێ، نە، نە ، نە بەو شێوەیە نییە كە تۆ باسی دەكەیت و دەست دەكا بە قسەكردن دەربارەی فیلمەكە. كە وایە ئەم بەسەرهاتە ئەوە دەخاتە روو سالی زیاتر لەوەی كە پێشتر خۆی باسی دەكرد و مافی بە خۆی دەدا لە فیلمەكە قسە بكات، لە فیلمەكە تێگەیشتووە.

**- لــە بەرهەمەکانتــا بــاوەڕت بە هەڵهێنجانــی دەروونشــیکاریانەو بە تایبەت دەروونشــیکارییەکانی «لاکان» هەیە؟**

* دەزانی کێشە لە چیدایە؟ دەروونشیکار و دەروونناس لە روانگەی خۆیانەوە چاو لە فیلم دەکەن و بە شــتگەلێکی تایبەت دەگەن. بەڵام هەموو ئەو شــتانەی کە ئەوان وەک هەڵهێنجانی خۆیان باســی دەکــەن، تایبەتە بە روانگــەی خۆیان، وەک روانگەی هەر بینەرێکی تر. کــە فیلمەکە دەبینن، بەپێی بیرکردنەوەی خۆیان تەفســیری دەکەن، وەک هەر بینەرێکی تر کە بەپێی بیرکردنەوەو هەســتی خۆی فیلمەکە تەفســیر دەکات. ئەوانیش وەک هەر بینەرێکی تر بەپێی هەســتیان، هەلهێنجان و تەفسیری تایبەت بە خۆیان هەیە و بەپێی ئەو هەستە دەربارەی فیلم دەنووسن و بەپێی ئەو هەستە لە فیلمەکە دەگەن. من لام وایە بەم شێوەیەیە.

**- کە وایە بە ڕای ئێوە دەروونشیکارەکان لە بینەرانی تر سەرتر نین؟**

* رەنگە شــتێک دەربارەی فیلمەکەم بنووسن کە خۆشم بەو شێوەیە بیرم کردبێتەوە. بەڵام ئەوەش هەیە کە رەنگە جۆرێکی تر تێگەیشتبێتن و جیاواز بێت لەگەڵ ئەو جۆرەی کە من تێدەگەم. ئیتر هەر ئەم شتانەیە کە جیهان دەباتە پێش. هەر ئەم شتانەیە جیهان دەکات بە شتێکی سەرسووڕهێنەر.

**- یان بە بیرکردنەوەکانی «ژاک لاکان» ئاشنا نیت؟**

* نا، من تەنها بەو ئایدیایانە ئاشنام کە خۆم بەدەستیان دێنم. تەنها شتێکیش کە دەیزانم ئەوەیە کە دەبێ عاشــقی ئەم ئایدیایانە بم و بە زمانی ســینەما دەریان ببڕم. ئەگەر هەســت بکەم وەفادارم بەرامبــەر بەو ئایدیایانــە، فیلم خۆی هارمۆنییەکەی پەیدا دەکات و ئەگەر ناوەرۆک و تیمی ســەرەکی باش بێت، ئەوا هارمۆنییەکەشــی باش دێتە دەســت. بە واتایەکی تر، رەنگە دە ساڵی تر من دانیشم و تەماشــای فیلمێکم بکەم کە دە ســاڵ پێشتر بەرهەمم هێناوەو هەندێ شتی نوێ لەو فیلمە بدۆزمەوەو تێگەیشتنم زیاتر بێت بۆی. ئەگەر لەگەڵ بیرکردنەوەکاندا بڕۆیتە پێش، بیرکردنەوەو ئەندیشەش هەموو شــتت پێ دەڵێ. کە وایە مرۆڤ نابێ زۆر شــت بخوێنێتەوە بۆئەوەی بێت و بە خۆی بڵێ، من دەمەوێ فیلم ســاز بکەم. فیلم دروست دەکەم، چونکە عاشــقی ئەو بیرۆکە دەبم کە بە زەینم گەیشتووەو وەک ماسییەکی تازە کە کەوتبێتە تۆڕەکەتەوە لە ئاو دەری دێنم.

**- ئەو نووسراوانەش کە «سلاڤۆی ژیژەک» دەربارەی فیلمەکانت نووسیویەتی، نەخوێندۆتەوە؟ بە تایبەت ئەو کتێبەی کە دەربارەی»شاڕێی ونبوو» نووسیویەتی.**

* نا نەمخوێندۆتەوە.

**- بەڕاســت؟ بــەڵام ئــەم کتێبە ناوبانگێکــی زۆری هەیەو هەرچــی بێت دەربارەی یەکێــک لە گرنگترین فیلمەکانی ئێوەیە.**

* نا، نەمخوێندۆتەوە. کە فیلمێک تەواو دەکەم، پێم خۆشە زیاتر لە هەر شتێک، بیرۆکەیەکی نوێ بۆ کاری دواترم بدۆزمەوە. (پێدەکەنێ) لێم تێدەگەی خۆ؟ (بە دەنگی بەرز پێ دەکەنێ) کە وایە کاتی زۆرم نییە بۆ خوێندنەوە و تەنانەت باوەڕ ناکەن ئەوەندەش زۆر خۆرکەی سینەما نیم، تەنها شتێک کە پێم خۆشە ئەوەیە کە کار بکەم.

**- هەنـدێ جار دوای دیتنی فیلمەکانت بە تایبەت»شـارێی ونبـوو» و « مالهالێند درایڤ» و «ئینلەند ئێمپایەر» ئینسان وا بیر دەکاتەوە زیاتر لەوەی کەڵکەڵەی «فیلم»ت هەبێت، کەڵکەڵەی هونەرت هەیە، بـە واتایەکی تر، فیلمەکانت زیاتر لـەوەی «فیلم»بن، بەرهەمێکی هونەرین. پێدەچێت لەم بەرهەمانەی دواییتدا کەڵکەڵەی جیا لە کەڵکەڵەی سـینەمات زیاتر بووە دەتەوێ لەگەڵ فیلمدا ئاوێتەیان بکەی؟ رای ئێوە لەم بارەوە چییە؟**

* کەڵکەڵەیەکی جیا لە کەڵکەڵەی فیلم! من بەر لە هەموو شتێک وێنەکێش بووم و تەنها شتێک کە پێم خۆش بوو، ئەوە بوو کە ببم بە شێوەکار. بەڵام وێنەکێشان منی بەرەو وێنەی جووڵەدار راکێشا و دواتر وێنەی جووڵەدار بردمیە ناو ســـینەماوە. ئەرێ، بەم شێوە بووم چوومە ناو جیهانی سینەماوە. وەک پێشتریش وتم، ئەوە ئیدە و بیرۆکەیە هەموو شت دیاری دەکات. کە وایە بەو شێوە نییە تۆ لەبەر خۆتەوە بڵێی ئەم فیلمە لەبەر هونەر یان لەبەر شــتێکی تر ساز بکەم. رۆژێک خەریکی پیاسە دەکەی کتوپڕ بیرۆکەیەک دێت بە زەینتدا و دەڵێی، ئای خوایە! دواتر عاشقی ئەو بیرۆکەیە دەبیت، جارێکی تر وەک پێشـــتر وتم «عاشقی» دەبیت، یەکێکیان بەبۆنەی خودی بیرۆکەکەو ئەویتر بە بۆنەی رێگایەک کە بە بۆچوونی ئێوە ســـینەما دەتوانێ دەریببڕێ. عاشـــقی بوویت و دەتەوێ سازی بکەی. زۆر باشە، مەدیتەیشـــن لەم رێگادا زۆر یارمەتی داوم. لەو کاتەوەی مەدیتەیشـــن دەکەم جیهانم زۆر زۆرتر خۆش دەوێ و ئیدەو بیرۆکەی زیاتر بە زەینم دەگا و تێگەیشتنم زیاتر بووە. ئیتر جیهان بەم شێوەیە جوان دەبێت.

**- کاری ســەیر و ســەمەرە، مرۆڤی ســەیر، دەنگی سەیر، شوێنی نامۆ و سەیر و تەنانەت زمانی سەیر لە فیلمەکانتدا ئامادەییان هەیە. لە بنەڕەتدا «کاری سەیر» چ شوێنگەیەکی هەیە لەلای ئێوەو بە تایبەت لە فیلمەکانتدا؟ بۆچی زۆر جار لەگەڵ شتگەلێکدا رووبەڕوو دەبینەوە کە ئاسایی نین و سەیر و سەمەرەن؟**

* هەمدیســـان، وەک پێشتر وتم، رەنگە فیلمەکانم ســـەیر بن، بەڵام خودی جیهان سەیرە. وا نییە؟ دەڵێن فیلمەکانی من ترســـناکن و توندوتیژیان تێدایە، بۆ مەگەر خودی جیهان بەم شـــێوە نییە؟ خۆ ئەمە شـــتێکی تازە نییە. چیرۆکەکان بەم شـــێوەن. وەک ئەو شتەی کە پێشتر وتم، سینەما جیهان بە وێنە دەکێشـــێ و رەنگدانەوەی جیهانەو ئەو کاتەی جیهان دەگۆڕدرێ سینەماش دەگۆڕدرێ. زۆر باشە، چاوێک لە رابردوو بکە، بڕوانە جیهان چەندە گۆڕاوەو دەی کە وایە سینەماش بە دوایدا گۆڕاوە.

**- ســەرەڕای هەموو ئاڵۆزییە چیرۆکی و فۆڕمییەکان، هەروەها جیانەکردنەوەی واقع لە خەون، بە زۆری دەوترێ لینچ بۆ هەر بەرهەمێکی چیرۆکێکی تایبەتی هەڵبژاردوە. وایە؟**

* بەڵێ، باس لەســـەر چیرۆک و چۆنییەتی گێڕانەوەیەتی. رەنگە چیرۆکێکی خراپت هەبێت، بەڵام زۆر بـــاش بیگێڕیتەوە، رەنگە چیرۆکێکی زۆر باشیشـــت هەبێ و ســـەرکەوتوو نەبیت لە گێڕانەوەیدا، پرســـی ســـەرەکی چیرۆک و چۆنیەتی گێڕانەوەی ئەو چیرۆکەیە. هەر چیرۆکێک توێژی جیاجیای هەیە و کۆمەڵێک توێژی روون و ئاشـــکرا بوونیان هەیە، هەندێ توێژی دەرهەســـتیش بوونی هەیە. سینەما هەردووکیانی لە خۆیدا هەڵگرتووە. چ توێژە شـــاراوەکان و چ توێژە دەرهەســـتەکان. من بەڕاســـت ئەو چیرۆکانەم پێ خۆشـــە کە یەکدەست دێن و دەگێڕدرێنەوە، بەڵام عاشقی لۆژیکی خەونیشم. دەرهەست بوونیشـــم زۆر پێ خۆشـــە. بە واتایەکی تر من عاشـــقی هەستەکانم و پێم خۆشـــە بزانم سینەما چۆن

دەتوانێ بەشـــێک لەم هەستانە بە وێنە بکێشـــێ و نیشانیان بدات. هەندێ لە شتەکان تەنها لە ڕێگای ســـینەماوەیە دەکرێ دەربڕدرێن و باســـیان لێ بکرێ. ئەو شـــتانەی کە دەربڕینیان لە ڕێگای وشەوە ئەستەمە، بەڵام سینەما دەریان دەبڕێ و باسیان لێوە دەکات.

**- بـــە زۆری لـــە فیلمەکانتـــدا ژنانێکی خەمۆک و نیگـــەران دەبینین. هەندێ جار رووحیـــە و زەینی ئەو ژنـــە خەمۆکیانەیـــە دەبـــێ بە تەوەری ســـەرەکی فیلم، بۆچی ئەم پرســـە بـــووە بە بابەتێکـــی گرنگ لە ناو فیلمەکانتدا؟**

* ئەم شـــتانە لەگـــەڵ ئایدیا و بیرۆکەدا دێن. کە لە ســـینەمادا ژنێک هەیە، خـــۆ ئەو ژنە هەموو ژنەکانی جیهان نیشـــان نادات. ئەو ژنە، تەنها ئەو ژنە تایبەتە نیشان دەدات، ئەو کەسایەتییە تایبەتە نیشـــان دەدات، ڕاســـتی ئەوەیە زۆر کەس هاتوون و وتویانە دەیڤید بەم شـــێوەیە دەربارەی ژنان بیر دەکاتەوە، یان دەیڤید بەم شـــێوەیە دەربارەی پیاوان بیر دەکاتەوە، بەڵام هیچ بەم شـــێوەیە نییە. ئەم کەسایەتییە تایبەتە سەر بەو جیهانە تایبەتەیە و لەگەڵ کۆمەڵێک کەسایەتی تایبەتی تر لەم جیهانە تایبەتەدا هەڵســـوکەوت دەکات. هەموو بەســـەرهاتەکە ئەمەیە. فیلم تەنها گرتەیەکە لە ژیان و هەموو کەسایەتییەکان و چۆنیەتی هەڵسووکەوت و ژیانیان بەپێی ئەو ئایدیا و بیرۆکەیە دیاری دەکرێ.

**- لات وایە سینەمای ئێوە دریژەی چ جۆرە سینەمایەکە؟ لات وایە دوای سینەمای ئێوە چ جۆرە سینەمایەک دەبینی؟ ئاخۆ قەت کەوتوویتەتە ژێر کاریگەری جیهانی سیریالیست «لوئیس بۆنۆئل»ەوە؟**

* مـــن تەنانـــەت زۆر باش بۆنۆئل ناناســـم تا ئـــەوەی کەوتبێتمە ژێر کاریگەریـــی ئەوەوە! هەموو فیلمەکانیشیم نەدیوە. هەڵبەت دەزانم زۆر کەس من لەگەڵ بۆنۆئل بەراورد دەکەن، رەنگە لەبەر ئەوەی بۆنۆئل سریالیســـت بووە، منیش بە سیریالیست دەزانن. بەڵام خۆ من بە تەواوی سیریالیست نیم. من لام وایە، فیلم ژانری جیاواز دەگرێتەوە. منیش عاشـــقی ئیدە و بیرۆکە سیریالیستیەکانم، وێنەکێشانی سریالیســـت و شتەکانی تر. بەڵام فیلمەکانی من تەنها ســـریالی نین و ژانری جیاواز دەگرنەوە. هەندێ جار خودی ژیان زۆر ســـریالی دەبێ و هەندێ جار ترســـێنەر و هەندێ جار خەمهێنەر. سینەما دەتوانێ هەموو ئەمانە لە چیرۆکێکدا بێنێ.

**- بـــەڵام تێمی «گۆڕانی کەســـایەتی» لە زۆربـــەی فیلمەکانتدا دەبینین. ئاخۆ ئەم تێمە دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری وەرگرتنی ئێوە لە «ئینگمار برێگمان»؟ بە تایبەت لەبارەی «مالهالنێد درایڤ» و وێکچوونەکانی گۆڕانی کەسایەتی لەو فیلمەدا لەگەڵ فیلمی «پێرسۆنا»ی برێگمان.**

* سینەما مێژووییەکی سەد ساڵەی هەیە. یانی ناکرێ فیلمێک ساز بکرێ و هیچ خاڵێکی هاوبەشی لەگەڵ ئەوانەی پێشتر ساز کراوە نەبێت. ئەمە بۆچوونی منە.

**- یانی ئەوە نییە کە کاریگەری برێگمانت لەسەر بێت؟**

* نـــا، ئەوەی هەیە ئیلهام وەرگرتنە لە کەســـەکانی تر. من لـــە «برێگمان» ئیلهامم وەرگرتووە، لە «فدریکۆ فلینی» ئیلهامم وەرگرتووە، لە «ســـتانلی کوبریک»، «ئالفرێد هیچکاک»، «ژاک تاتی» و «بیلی وایلدر»یش ئیلهامم وەرگرتووە. بەڵام باس لەســـەر ئیلهامە نەک کاریگەری وەرگرتن. من هەموو کات وتوومە زۆرترین کاریگەریم لە شاری فیلادلفیا گرتووە.

**- کە فیلمی «دە» لە (کان)دا نیشان درا، ئێوە لیژنەی داوەران بوون. راتان چییە دەربارەی سینەمای «عەباس کیارۆستەمی»؟ ئاخۆ ئێوەش وەک بەشێک لە دەرهێنەر و رەخنەگرەکان لاتان وایە فیلمەکانی کیارۆستەمی، وەرزێکی تازەن لە سینەما؟**

* لام وایە «عەباس کیارۆستەمی» دەرهێنەرێکی گەورەیە. سینەما زمانێکی جیهانییە و دەرهێنەرە گەورەکان هەر کامەیان دەنگی خۆیان هەیە. کە وەفادار بن بە دەنگەکەیان، بیرۆکەکانیان بە شــێوەی تایبەتی خۆیان تەفســیر دەکەن. شــێوەکاری تایبەت بە خۆیان هەیە، دەنگێکــی تایبەت بە خۆیان. سینەما بۆ یەکدەست کردنی جیهان رێگایەکی زۆری بڕیوە، بەڵام یەکدەست کردنی جیهان پێویستی بە زیندوو کردنەوەی قووڵترین توێژەکانی ژیان و وزەی سەنترال هەیە. ئەو هێزەی لەگەڵ خۆیدا ئاسوودەیی و ئارامی دێنێ. ئەو هێزەی روانین دەبەخشــێ بە مرۆڤەکان و ئارامێ دەگەڕێنێتەوە بۆ جیهان. چاو لە جیهان بکە! راز و نهێنێک هەیە بۆ ئێمەی مرۆڤەکان. ئێمە جیهانێکین لە بنەماڵەکان و ئێســتا کاتی ئەوەیە وزەکانمان یەک بخەین و لە ئارامی و ئاسوودەگیدا بژین.

**- بیســتمان ئەو کاتەی کیارۆســتەمی بۆ فیلمی «تامی گێلاس» خورمای زێڕینی کانی بردەوە، ئێوە دژ بەو بڕیارەی لیژنەی داوەران بوون و بە ئاشکرا ئەم دژایەتییەی خۆتان نیشان داوە. بەڕاست وا بوو؟**

* قسەیەکی تەواو بێ بنەمایە و هیچ وا نەبووە.

**- کارکردن بە «کامێرای دیجیتاڵ» چ کارکردێکی لەگەڵ خۆیدا بە دیاری بۆ هێناوی؟ جیاوازی شــێوەی کەڵــک وەرگرتنی ئێوە لــە «تەکنۆلۆژیای دیجیتاڵ» و کەڵک وەرگرتنی کیارۆســتەمی لەم تەکنۆلۆژیە لە چیدا دەبینی؟**

* نازانم جیاوازی ئەم دوانە لە چیدایە. من عاشــقی تەکنۆلۆژیای دیجیتاڵم. ئێســتا هەموو جیهان بووە بە دیجیتاڵ. فیلم «کاســێتی فیلم» ئیتر بە لای منەوە مردوە. منیش رووم هێناوەتە دیجیتاڵ، ئێستا ١٠ساڵیشە دەنگ دیجیتاڵی بۆتەوە، وێنەش دیجیتاڵی بۆتەوە. زۆر باشە، ئەگەر کێشەیەک نیە با ئێمەش بە دیجیتاڵ کار بکەین. رێگایەکە بۆ وێنە گرتن و رێگایەکی باشیشە. هەم دەکرێ ماوەیەکی زۆرتر وێنە بگیردرێ، هەم دەکرێ «عەدەســەی» ئۆتۆماتیک بەکاربێنیت، هەم روناکی باشــی هەیە. هێزی ئینسانی کەمتریشی دەوێ. خۆشم دەتوانم بەم تەکنۆلۆژیە کار بکەم. دوای کار زۆر ئاسان دەکرێ هەندێ گۆڕان ســاز بدەی لە فیلمەکەدا، نە لەت دەبێ، نە پیس دەبێت. روونیشــە. بەڵام پێشتر، هیچ کات دوو فیلم (کاســێتی فیلم) وەک یەک نەبوون، بەلای منەوە کاتی ماڵئاوایی کردنێکی جوانە لەگەڵ جیهانی کاسێتدا. ئێستا جیهان جیهانی دیجیتاڵییە.

**سەرچاوە:**

HTTP://SIBEGAZZADE.COM/MAIN/?P=169:
HTTP://SIBEGAZZADE.COM/MAIN/?P=170

# مرۆڤ لە سایەی دیموکراسیدا
# گفتوگۆیەك لەگەڵ ژان باشلەر

**لە فارسییەوە: کارزان محەمەد**

ژان باشلەر لە ساڵی (١٩٣٧) لە ئەیالەتی (لۆرن)ی فەرەنسا لەدایک بووە. خوێندنی باڵای لە زانکۆکانی ستراتسبۆرگ و پاریس لە کۆلیژەکانی مێژوو، جیۆگرافیا و سۆسیۆلۆجیا تەواو کردووە. نامەی دکتۆراکەی ئەو کە لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆلۆژییە لەبارەی خۆکوژیی، یەکێکە لە بەناوبانگترین توێژینەوە لەم مەیدانەدا و بەشێکە لە سەرچاوە نەگۆڕەکانی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەمبارەیەوە ئەنجام دەدرێت. ئەم کتێبە کە لە ساڵی (١٩٧٥)دا چاپ کراوە، یەکەمین بەرهەمی (باشلەر) نییە. ئەو بەرلەوەش، بە نووسینی سێ کتێب دەربارەی (سیاسەتی ترۆتسکی- ١٩٦٨)، (دیاردە شۆڕشگێڕییەکان- ١٩٧٠) و (ئاخێزگەکانی سەرمایەداری- ١٩٧١)، خۆی وەک توێژەرێکی راستەقینە، دووربین و بیرقوڵ بە تیۆرسێنەکانی سۆسیۆلۆژیا، زانستی سیاسی و ئابوریی ناساندبوو. ناوبراو نامەی دکتۆراکەی خۆی بە سەرپەرشتی (ریمۆن ئەرون)ی بیرمەندی ناودار تەواو کردووە.

تائێرە رەوتی سەرەکیی توێژینەوەکانی باشلەر لەڕووی تۆمارکاریی قوتابخانەیەکی فەلسەفەی سیاسییەوە کە بێجگە لە کتێبە ناوبراوەکان و هەروەها کتێبەکانی (ئایدۆلۆژیی چییە؟- ١٩٦٧) و (هێزی بێخەوش- ١٩٧٨) بە کتێبی (دیموکراسییەکان- ١٩٨٨) کۆتایی هاتووە. ئەم کتێبەی دوایی یەکێکە لە دیارترین دەزگای فەلسەفەی سیاسی کە لەماوەی ئەم سەدەی دوایی خراوەتەڕوو، چونکە هەم لەڕووی تیۆرییەوە خاوەنی بناغەیەکی پتەوە و هەم لەڕووی پشبەستن بە زانیارییە مێژوویی، ئەتنۆگرافی و سۆسیۆلۆژییەکانەوە کەم وێنەیە.

باشـــلەر کە کاری داڕشتنی تیۆرێکی گشتی دەربارەی مێژوو خستۆتە بەرنامەی کارەکانی خۆیەوە، ئاشنای چەندین زمانیشە لە ڕیزیاندا فارسی، زۆرینەی بەرهەمە ئەدەبییە کلاسیکییەکانی زمانی فارسی بەباشی دەناسێت.

***تۆ لە نوسـینە جۆراوجۆرەکانی خۆتدا و بەتایبەتی لە کتێبی (دیموکراسـییەکان) جەختت لەسەر ئەم خاڵە کردۆتەوە کە دیموکراسی سیستەمێکی سیاسی (سروشتی)ی مرۆڤە. گرنگی ئەم گوتەیە لە دیدی بیری سیاسییەوە لای هیچ کەسێک شاراوە نییە و مەبەستی من لە ئەنجامدانی ئەم گفتوگۆیە، ڕوونکردنەوەیەتی بـۆ ئـەو خوێنەرانەی کە ئاشـنای بەرهەمەکانـی تۆ نین. پێتوایە بـۆ خسـتنەڕووی وردی بابەتەکە دەبێ لەکوێوە دەست پێبکەین؟**

–بۆ تێگەیشـتن لەم بابەتە، دیارە دەبێ لە پێناسـی سیاسەتەوە دەسـت پێبکەین. چالاکییەکانی مرۆڤ لە مەزهەب، سیاسـەت، ئابووریی... بەگوێرەی ئەو کێشـانەی کە دێنە سەرڕێی مرۆڤ و بەپێی ئەو ڕێگەچارەسـەرانەی کە بۆیان دەدۆزرێتەوە، فۆرمەڵە دەبێت. ئەو کێشـەیەی کە سیاسـەتی تیادا لەدایک بووە، ناکۆکییە. تایبەتمەندێتی مرۆڤ لە پەیداکردنی ناکۆکیدایە لەگەڵ هاوچەشنەکانی خۆیدا، ناکۆکییـەک کە ئەنجامی ئازادییەکانی ئەوە، چونکە لەوێدا کە ڕەفتاری مرۆڤ زادەی پەیڕەویی لە هیچ جۆرە بەرنامەڕێژییەکی خۆرسـکی نییە، هەرکەسەو دەبێ بەشێوەیەک مرۆڤبوونە تایبەتییەکەی خۆی دابهێنێت و فرەچەشـنی کە زادەی ئـەم هەلومەرجەیە، هەندێکجار دەرەنجامی دژیـەک دێنێتەئاراوە. کورتەکەشـی ئەمەیە کـە مرۆڤەکان نە دەربارەی ناوەنـدە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییـەکان (مەزهەبی، هونەریـی، ڕەگەزیی، خۆراکسـازی...) پێکەوە ڕایەکی یەکگرتوویان هەیە و نە دەربارەی دابەشـکردنی خواسـتە دەگمەنەکانی وەک هێز، سـامان و ڕێزی کۆمەڵایەتی، لەو شوێنەدا کە مرۆڤ هەم توڕەو هەم هۆشمەندە و دەتوانێ بۆ پیادەکردنی بیروباوەڕەکانی خۆی، سود لە زۆرەملێ و تەڵەکەبازی وەربگرێت، لەوانەیە کاری ناکۆکییەکان بەرەو شەڕ بڕوات کە ئامانجەکەی لەناوبردنی لایەنی بەرامبەر بێت. مەسەلەی سیاسەت بەڕێوەبردنی ئەم ناکۆکیانەیە.

***ئەم کارە چۆن دێتەدی؟**

–هەر یەکەیەکی سیاسـی لە سیاسـەتی دەرەوەیدا، سـود لە توندوتیژی و تەڵەکەبازیی وەردەگرێت تا مەترسـییەکان لاببات، چ بە لەناوبردنی یەکەکانی تر، چ بە سەرنجڕاکێشـانیان و چ بە دروستکردنی هاوسەنگییەک کە لە پەلاماردان دەیانگێڕێتەوە. دوائامانجی ئەم کارەش، سەقامگیرکردنی ئاشتییە.
بۆ لابردنی ناکۆکییە ناوخۆییەکان، تەنها ڕێگاچارەسـەری ڕاسـت و دروستی لابردنی ناکۆکییەکان، خستنەڕووی ڕێگاچارەسەرێکی دادپەروەرانەیە. دیارە لەم دۆخەدا، دوائامانج دادپەروەرییە.

***تۆ لەم پێشەکییەوە، چۆن دەگەیتە دیموکراسی؟**

–دەبێ ئەوە ببینین کام بنەمای سیاسـی، دەرفەتی گەیشـتن بە ئاشـتی و دادپەروەریی فەراهەم دێنێ. هەڵبەتە لەبەرئەوەی تەوەرەی باسـەکەی ئێمە لێرەدا دیموکراسییە، تەنها باس لە دادپەروەریی دەکەین.
کێشـەی بنچینەیی هەموو کەسـێک، پارێزراوبوونییەتی لە توندوتیژی و فرتوفێڵی کەسـانی تر، بەڵام نەک بە باجدانی لەدەسـتچوونی ماڵومولْکی خۆی یاخود چاوپۆشی لە بیروباوەڕ و حەزو ئارەزوو

و خواستەکانی خۆی بکات. بەڵام لە هەمانکاتدا ئەگەر وادابنێین تاکەکانی کۆمەڵگا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان چاوپۆشی لە توندوتیژی بەرامبەر ئەوانی تر بکەن، ئەوا هەر لە دوو مەسەلەدا ناچارن پەنا بۆ توندوتیژی ببەن، یەکێکیان لە بەرامبەر پێشێلکارانی یاسا و ئەوی تر لە بەرامبەر دوژمنە دەرەکییەکاندا. بۆ ئەم جۆرە کارەش هەمووان دەبێ یەکبگرن، بەڵام ئەم هەلومەرجەش خاڵی نییە لە مەترسی، چونکە هەمووان ناتوانن لە هەموو کاتێکدا بەهەموو شتێک بگەن. بەمشێوەیە لەوانەیە سەرجەم هێزەکە لەدەستی گروپێکی کەمدا کۆببێتەوە کە هەر لە بنەڕەتەوە بەرپرسیاری پیادەکردنی ئەو هێزەن و خەڵک لە بەرامبەر ئەو کەسانەدا تەسلیم ببن کە خۆیان پڕچەککردووە

*** چۆن دەتوانرێ ڕێگە لە هاتنەئارای ئەم هەلومەرجە بگیردرێت؟**

–مەبەستی تۆ ئەمەیە کە چۆن دەتوانرێ لەگەڵ دوورکەوتنەوە لە تۆتالیتاریزم، دادپەروەریش بەرقەرار بکرێت. وەڵامی ئەم پرسیارە تەنها دەبێ لە جۆری پەیوەندی دەسەڵاتەکەدا بەدوایدا بگەڕێین. لەبنەڕەتدا، هێزی کێشمەکێشم لەنێوان ئیرادەی فەرمانده و ئیرادەی فەرمانبەردایە. دەبێ هەر لێرەدا ئەوە وەبیر بهێنینەوە کە فەرمانبەر بنەمای هێزە نەک فەرماندەیی، چونکە ئەگەر یەکەمیان نەبێ دووەم هیچ مانایەک ناگەیەنێت. فەرمانبەریی لە سێ شتەوە پەیدا دەبێت: ترس، شەیدایی و لۆژیک. تاکڕەویی لە ملکەچی بۆ ترس سەرچاوە دەگرێت و دیموکراسیش لە ملکەچی بۆ لۆژیک.

ئەگەر کەسێک لە دیموکراسیدا مل بۆ بڕیارەکانی حکومەت کەچ بکات، لەبەرئەم هۆیەیە کە ملکەچییەکەی بەقازانجی خۆی دەبینێت. لە بنچینەدا هەرکاتێک گەیشتن بەئامانج پێویستی بە سوودوەرگرتن لەو توانستانە هەبێت کە لە هەمووماندا نییە، بەرژەوەندییەکانی هەموومان واپێویست دەکات کە ملکەچی کەسانی شایستە ببین.

لەبەرئەم هۆیە، لە دیموکراسیدا دەسەڵاتێکی سنوردار بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەکەسانێک دەسپێردرێت کە چاوەڕێی شایستەییان لێدەکرێت.

***مەبەستی خۆتان لە (بەرژەوەندییەکان) ڕۆشنتر بخەڕەروو؟ لەبەرئەوەی بەگشتی هەرکاتێک قسە لە بەرژەوەندی دێتەئاراوە، سەرنج بەرەو بەرژەوەندییە ئابورییەکان دەچێت.**

–بەرژەوەندی بە مانا بەرفراوانەکەی ئامانجێکە کە هەموو کەسێک بە دەستبردن بۆ کارێکی دیاریکراو بەدوایدا دەگەڕێت. بێگومان بەرژەوەندییەکان جۆراوجۆر و بێشومارە و هەر ڕۆڵگێڕێکی مەیدانی کۆمەڵ یاخود هەر گروپێک لەو یەکەیەدا، بەشوێن ئامانجگەلێکی زۆردا دەگەڕێن و شوێنکەوتەی بەرژەوەندییەکی جۆروجۆرن، بەڵام لەوێدا پێناچآ کە سەرجەم بەرژەوەندییەکان لەناو ئەو یەکەیەدا دەستەبەر بکرێن. دەتوانرێ بەو کۆمەڵە بەرژەوەندییەی کە هەر کەسێک لەپێناو خۆیدا هەڵیدەبژێرێت و ئەو ڕیزبەندییەی لەنێویاندا ئەنجامی دەدات، ناوی بەرژەوەندی خودیی لێبنرێت. بەدڵنیاییەوە هەموو کەسێک تا ئەو کاتەی ڕێساکانی دیموکراسی نەبەزاندبێت، ئەوا لە بەدیهێنانی بەرژەوەندییە خودییەکانی خۆیدا ڕێگەپێدراوە.

***ئایا بەرژەوەندی تاکەکان لێرەدا کۆتایی پێدێت؟**

–نەخێر. نابێ (بەرژەوەندییە هاوبەشەکان) کە بەشێکە لە بەرژەوەندییە خودییەکانی هەموومان، لەیاد بکەین. پێشتر ئاماژە بۆ هەردوو بنەماکانیان کرا کە ئاشتی و دادپەروەریی بوون، لەوێدا کە یاسا

بنەمای دادپەروەرییە، دەبێ سزای پێشێلکارانی یاسای بۆ زیاد بکرێت.

***ڕێگەی دەستڕاگەیشتن بە بەرژەوەندییە خودییەکان و بەرژەوەندییە هاوبەشەکان کامەیە؟**

-بەرژەوەندییە خودییەکان، چ بەدیهێنانیان لە چوارچێوەی یاسادا ئەنجام بدرێت یاخود نا، ئەوا هەر جۆراوجۆر و دژیەکن. تەنها ڕێگا، ئاشتکردنەوەیانە و ئازادکردنیانە لە ڕووبەڕووبوونەوەی یەکتردا ئەویش لە ژینگەیەکدا کە لە توندوتیژی بەدووربێت، جۆرە هاوسەنگییەکیش لەنێوانیاندا دروست ببێت و ببێتەمایەی پەیدابوونی جۆرە نێوانداریەک. ئەو چەشنە ژینگەیە بەمانا فراوانەکەی وشە دەتوانرێ بە (بازاڕ) ناوببرێت. بەڵام دەبێ ئەمەش بڵێین کە (بەرژەوەندی نێوەنداریی) لەسەر خواستی هەموومان نییە و لەوانەیە بەپێی ئینتیمای کەمینە یاخود تەنانەت زۆرینەش نەبێت.

لەهەمانکاتدا گەیشتن بە بەرژەوەندییەکی هاوبەش، بەبێ بەشداریی هەموو خەڵک یاخود نوێنەرە هەڵبژێردراوەکانیان شیاوی وەدیهاتن نییە. وادابنێ ئەگەر یاسا نەبێت، هەر کەسێک یاخود هەر گروپێک بتوانێ کەسانی تر دەستگیر بکات و سزایان بدات، ئەوا چ ژینگەیەک دروست دەبێت.

***پەیوەندی ئەم دوو ڕێبازە لەگەڵ دیموکراسیدا چییە؟**

-تایبەتمەندی بنچینەیی دیموکراسی لێرەدایە کە هەرچی پەیوەندی بە بەرژەوەندی خودی و نێوەندکارییەوە هەبێت، بە بەرژەوەندی تایبەت (PRIVATE) هەژمار دەکرێت، هەرچییەکیش پەیوەندی بە بەرژەوەندی هاوبەشەوە هەبێت ئەوا بەرژەوەندی گشتییە (PUBLIC).

***بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پێناسەی کە تۆ بۆ دیموکراسی خستتەڕوو، لە چ ڕوویەکەوە دەتوانرێ ئەم سیستەمە بە سروشتی هەژمار بکرێت؟**

-بەداخەوە وشەی سروشتی زۆر ئاڵۆزە، بەڵام بەکارهێنانیشی هەڵە نییە. مەبەستی من لە جەختکردنەوە لەسەر گونجانی دیموکراسی لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا، ئەمەیە کە زۆرترین چانس بۆ هێزی پراکتیزەکردنی لایەنە پۆزەتیڤەکانی سروشتی مرۆڤ فەراهەم دەکات.

سیستەمە سیاسییەکانی تر ئەم چانسە بە سروشتی مرۆڤ نادەن کە لە هێزەوە ببێتە کردار، بەتایبەتی دیکتاتۆریی کە سروشتی مرۆڤ بەپێی ئاستی جیاواز زیندان دەکات، برینداری دەکات و بە کورتی گەندەڵ و لەسەر ڕێگەی خۆی لایدەدات، بەڵام سروشتیبوونی دیموکراسی بەم مانایە نییە کە بەرقەراربوونەکەی بەشێوەیەکی سروشتی ئەنجام دەدرێت یاخود ڕۆڵەکەی لە هەموو شوێنێکدا بەیەکسان پیادە دەکرێت. مێژوو، بەلایەنی کەمەوە لە ماوەی ئەم (١٠،٠٠٠) دە هەزار ساڵەی دوایی، بە پێچەوانەی ئەم وێنایەوە دەنگی داوە.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمەی کە بۆچی دیموکراسی وێڕای سروشتیبوونەکەشی، تا ئەم ئەندازە دەگمەنە دەبێ ئاماژە بۆ ئەو هەلومەرجە مێژووییەی بکرێت کە لە دەرەوەی ئیرادەی مرۆڤدا بووە. ئەگەر هەنگاو بنێینە سەرڕێگای پیادەکردنی دیموکراسی لە کۆمەڵگاکاندا، چوار مەرجی پێویست بۆ دیموکراسی بەرچاو دەکەوێت.

-پەیدابوونی یەکە سیاسییەکان کە چەندین سەدە بەردەوام بن.

-نەهاتنەئارای ئیمپراتۆرییەت، چونکە ئیمپراتۆریەتەکان بێگومان سیستەمێکی سیاسی نادیموکراسیانەیان هەیە.

-بوونی ناوەندگەلێکی جۆراوجۆر و دەسەڵاتداری بڕیاردان لەهەر یەکەیەکی سیاسیدا، ئەو ناوەندانەی کە لەسەرپێی خۆیان راوەستابن و بتوانن رێگە لە گەشەکردنی بێسنووری هێزی ناوەندی سیاسیدا بگرن تا هێزی کاروباری تایبەتی لەدەست دەوڵەت بپارێزێت.

-هاتنە بەرهەمی فەزیلەتەکان، نرخاندنی تاکەکەس و رێزی نێوان هاوڵاتیان.

نابێ ئەوە فەرامۆش بکرێت کە دیموکراسی، زۆرترین ئەرک لەئەستۆ دەگرێت و ئەگەر تاکەکەس تواناى پێکهێنانی گروپ، بەشدارییی لە بڕیاردانە بەکۆمەڵەکان و پاشەکشێکردن بەو کەسانەی کۆمەڵگا هەڵدەخەڵەتێنن نەبێت، ئەوا دیموکراسیش بەردەوام نابێت.

***تێڕوانینتان دەربارەی (بەهاوتا هەژمارکردنی دیموکراسی لەگەڵ حکومەتی زۆرینە)دا چییە؟**

-ئەم هەڵەیە لە ئەوانی تر باوترە. هەندێ کەس وا ئازادیی بیروڕا شیکار دەکەن کە دەتوانن هەموو بیروباوەڕەکان بخەنە بەردەم هەڵسەنگاندنی گشتیانەوە و دوای ڕاپرسییەکی گشتیانە دەربارەی ئەو بیروباوەڕانە، هەمووان دەبێ مل بۆ خواستی زۆرینە کەچ بکەن.

کێشەکە لێرەوە دەست پێدەکات کە چۆنییەتی گەیشتن بە بەرژەوەندیی هاوبەش بەهۆی ئاڵۆزیی مەسەلەکە و هەروەها وابەستەبوونی بە ئایندەیەکەوە کە ئێمە ئاگامان لێی نییە، هێندە ئاسان نییە. لەم دۆخەدا سەرجەم ئەو بیروباوەڕانەی کە لەمبارەیەوە بەرجەستە دەکرێ، لە ڕوانگەی سیاسییەوە ڕەوایە و ڕاپرسییەکی ڕەسمی یاخود ناڕەسمی بۆ دەستنیشانکردنی (زۆرینە) ئەنجام دەدرێت. بەڵام بڕیاردانی زۆرینە تەنها دەربارەی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان ڕەوایە و فراوانکردنی بۆ بەرژەوەندییە خودییەکانیش شیاوی قبوڵکردن نییە.

لەمبارەیەوە دووەمین رێبازی ڕاست و دروست مامەڵەی ئازادانەی کاڵا، وتە، بیرە...هتد. بۆنمونە لەوانەیە هەموو کاتێک لە بازاڕی بیرکردنەوە زانستییەکاندا زۆرینەی پسپۆڕان ئینتیمایان بۆ تیۆرێکی تایبەت هەبێت، بەڵام ئەم زۆرینەیە زادەی ڕاپرسییەک نییە و بیروباوەڕەکانی خۆیان بەسەر کەمینەدا ناسەپێنن. دەستوەردانی دەوڵەتیش لەم جۆرە کاروبارانەدا، بەتەواوەتی ناقۆڵایە.

یاسایەک کە ناوەرۆکەکەی دەستنیشانکردنی هەقیقەتێکی ماتماتیکیانە بێت، تەنانەت ئەگەر لەڕووی زانستییەوە بنەمایەکی ڕاستودروستی هەبێت، سەپاندنی هەر ناڕەوایە.

**سەرچاوە:**

HTTP://WWW.ROSHANGARI.COM

# گفتوگۆ لەگەڵ جەعفەر پوینده

لە فارسییەوە: هادی محەمەدی

کۆمەڵناسـی ئەدەبیات چییە؟ کاری تۆژینەوەی زانکـۆکان لە چ دۆخێکدایە؟ چۆن دەتوانین لە نوسینی تێزی خوێندکاریدا کێشە کۆمەڵایەتییەکان راڤە بکەین؟ داهێنانـی فەرهەنگی چییە؟ رێژەگەرایی و رەهاگەرایی لە هونەردا لە چ باوەڕێکەوە سـەرچاوە دەگرن؟ فاکتی مێژوو لە تۆژینەوەی کۆمەڵایەتیدا چ رۆڵێکی هەیە؟ ... ئەم پرسـیارانە بابەتی سـمینارێکی خوێندکارانی بواری کۆمەڵناسـی بوو لەگەڵ جەعفەر پوینده.

**- خوێندکاران بۆ نوسینی تێزەکانیان لەگەڵ زانکۆ تووشی کێشە دەبن. چۆن دەکرێ ئەم کێشـەیە چارەسـەر بکەین و چەندین تێز بنووسـین کە هەندێ کێشـە چارەسـەر بکات؟**

* ئێمە لە زۆر بواری زانسـتی و توێژکاریدا کێشەمان هەیە. ئەم پرسە نە هەر کۆمەڵناسـی، بەڵکو زۆربەی بوارەکان دەگرێتەوە. بۆ نموونە ئێمە لە مێژووشـدا کێشەمان هەیە. لەبەرئەوە لە حکومەتی وڵاتانی جیهانی سێهەم سیستمی سانسۆر بـەکار دێنن. بۆ نموونە ئەگەر بتانەوێ لە بزاڤی مەشـروتە بکۆڵنەوە، هەم دەبێ بەرهەمەکانـی "ئادمیـت" بخوێننەوە و هەم بەرهەمەکانـی دژبەرانی، هەم دیدگای لایەنگرانی شـێخ فضل اللـە بخوێننەوە و هەم دیدگای نەیارانـی، تا تێبگەن کە داسـتانی مەشروتە و مەشروعە چی بووە. ئەوجار دەبینن کە روانگەکان بەتەواوی ناکۆکن و لەم نێوەدا گەیشتن بە هەقیقەت ئێجگار دژوارە...

**- کەوابــوو بــۆ ئەنجامدانی وەها کارێک لەگەڵ چەندین ئاســتەنگ دەبینەوە. یان ســەرچاوەی مێژوویی بڕواپێکراومان نییە، یان ئەو بەرهەمانە کە چاپکراون سانســۆر کراون. تەنانەت بەرهەمی ئەدەبیش. ئایا فێربوونی زمانی بیانی کێشەکان چارەسەر دەکات؟ یان ئێوە ڕێگایەکی تر شک دەبەن؟**

* فێربوونی زمان سودی زۆری هەیە: دەتوانن بەرهەمی ئۆرژینالّ بەبێ سانسۆر بخوێننەوە، دەتوانن لە زۆر بەرهەم سود وەربگرن کە تەرجومە نەکراون و...

**- ئەی لە ناسینی مێژوودا چ کێشەیەکمان لەبەردەمدایە؟**

* کێشـــەی مەزنی ئێمە خودی مێژووە. ســـەرچاوەمان زۆرە. بۆ وێنە دەربارەی شۆڕشـــی مەشروتە سەرچاوەی زۆرمان هەیە... بەڵام کێشە لەوەدایە کە زەینی ئەکتیڤمان نییە. سەنتێزمان نییە. ئەم وڵاتە نزیکەی ٤٠٠- ٥٠٠ ســاڵە داهێنانی فەرهەنگی بەخۆوە نەدیوە. لە مەلا سەدرا بەملاوە هیچ بیرمەندێکی گەورەمـــان نەبـــووە. ئەمە کێشـــەیەکی مەزنی ئەم ٥٠٠ ســاڵەیە. بەڵام بە هەرحالّ ئێـــوە دەتوانن بە سودوەرگرتن لە سەرچاوەی بیانی تۆژینەوەکانتان ئەنجام بدەن...

**- چۆن دەبێ کەسێتی ئەدەبی پێناسە بکەین؟ ئایا کەسێتی ئەدەبی دەبێ لە بوارێکی تایبەتی ئەدەبیاتدا کاری کردبێت، وەک شێعر یان ڕۆمان؟ بۆ وێنە چۆن دەبێ شەریعەتی پێناسە بکەین؟**

* شەریعەتی یەکێکە لە بیرمەندانی مەزنی هاوچەرخی ئێران.

**- کەسێکی بیرمەندە، بەڵام ئایا دەکرێ بە هونەرمەندی بزانین؟**

* نا! هونەرمەند نییە. خوشی وەها بانگەشەیەکی نەکردووە. پێویستە بزانین کە داهێنانی فەرهەنگی دوو بەشـــە: ئەگەر پێوەندی بە چەمک و کانســـێپتەوە هەبێ، دەبێتە "فەلسەفە"، بەڵام ئەگەر فۆرمی فانتازیک بخولقێنێ، بە "هونەر" پێناسە دەکرێت؛ وەک نیگارکێشی، شێعر و موسیقی و ...

**- داهێنانی کولتوری یانی چی؟ داهێنەری کولتوری کێیە؟**

* لە وڵاتی ئێمە داهێنانی فەرهەنگی زۆر کەمە و دەتوانین بە پەنجەکانی دەست داهێنەران بژمێرین. چەند ڕۆماننوســـمان هەیە؟ چەند شاعێری گەورەمان هەیە؟ چەند بیرمەندمان هەیە؟ بەڵام لەبەرئەوەی هونەرمەندانی گەورە یان بیرمەندانی گەورە وردبینتزن و زۆرینەی وشیاری شیاوی سەردەمی خۆیان لە بەرهەمەکانیاندا دەگێڕنەوە، ئاسانتر دەتوانین بەرهەمەکانیان ڕاڤە بکەین، لەچاو هونەرمەندێکی دەرەجە 3. ئەم مێتۆدە لەمەڕ هونەرمەندانی کەم مایە زۆر کارساز نییە. بۆ نمونە لەمەڕ شاعێرانی ژن، من پێم خۆشە خوێندکاران شێعرەکانی فروغ ڕاڤە بکەن. ئاخر فروغ پێشەنگی شاعیرانی ئێرانە. یەکێ لە پێنج یان دە شاعیری گەورەی ئێرانە و کەس ناتوانی حاشا لەم ڕاستییە بکات. چ لایەنگران و چ نەیارانی. لە بواری ئەندێشەشدا تەنیا چەند بیرمەندێکی گەورەمان هەیە کە یەکیان شەریعەتییە. من پێم وایە ئەگەر شـــەریعەتی بە دروســـتی ڕاڤە بکرێت زۆر گرێ کوێرە و تاریکی مێژووی هاوچەرخمان ڕۆشن دەبێتەوە. من پێم خۆشە خوێندکاران وەها کارێک بکەن و لەم بوارەدا شێلگیرانە تێبکۆشن. ئەلبەت مەبەستم ئەوە نییە کە بە نوسینی وتارێکی سادە شەریعەتی ڕەت بکەنەوە یان ستایشی بکەن.

**- یانی ئێوە باسی جۆرێک لە کۆمەڵناسی کولتور دەکەن.**

* مەبەســتم کۆمەڵناسی کولتورە . کە ئەگەر بە وردی باسی بکەین، دەبێتە کۆمەڵناسی فەلسەفە، یان کۆمەڵناسی هونەر، یان ئەدەبیات.

ئێمە نابێ لە ئاســت کێشــەکان کۆڵ بدەین و ناهۆمید بین. چونکە بەدرێژایی مێژوو هەروا بووە . لە هیچ قۆناغێکدا دۆخی ســەردەم بــە دڵی هونەرمەندان و بیرمەندان نەبــووە . دیوانی حافظ بڕە لەم شــتانە: "ئاسمان کەشتی هونەرمەندان دەشــکێنێ". یانی بە درێژایی مێژوو زەمین و ئاسمان کەشتی هونەرمەندانیان شــکاندووە . ئەم پرســە تەنیا تایبەت بە ئێســتا نییە . یانی پێتان وانەبێ کە ئەگەر وەها کارێک دەســت پێبکەن، یارمەتیتان دەدەن و کارئاســانیتان بۆ دەکــەن. من خۆم بە چاوی خۆم دیم. نە زانکۆکان و نوســەران و رەخنەگرانی دەرەوەی زانکۆش ئەو کتێبەی گوڵدمەنیان نەنرخاند. کڕ و کپ بێ دەنگ بوون، حاشــا لە یەک وشە . ئەمە لە کاتێکدایە کە کتێبەکە پرستیژی جیهانی هەیە . بە وتــەی جلال ئال احمد ئێوە ئەگەر لەم وڵاتەدا کاری فەرهەنگی بکەن، وەک ئەوەیە "جیهاد بکەن". یانی ئاســمان و زەمین دەبن بە دوژمنتان و تەنیا بە فیــداکاری و لەخۆبردوویی دەتوانن کارەکەتان ئەنجام بدەن. نامەوێ ناهۆمێدتان بکەم. بەڵام سەرەڕای هەموو کێشە و ئاستەنگەکان دەبێ ئەم کارە بکەین... بە راســتی دەبێ لە خۆببوێرن. چونکە ئێستا لە ئێراندا تیراژی کتێبە باشەکان گەیشتۆتە هەزار دانە . یانی ئەگەر کتێبێکی باش هەزار دانەی لێ بفرۆشــرێ، هەموان خۆشــحاڵ دەبن. ئێوە لە وەها دۆخێکدا کار دەکەن. ئێستا من نزیکەی هەزار پەڕە بابەتم هەیە، سەرەڕای ئەوەی زۆربەی ناشران دەمناسن، بەڵام کەســیان ناوێرن چاپی بکەن. بەڵام من ناهومێد نابم و دەڵێم دیســان دەبێ درێژە بە کار و تێکۆشــان بدەین... یانی دەبێ بزانن کاری بەرهەمهێنانی فەرهەنگی لە ئێراندا رەونەقی نییە . باشترین نوسەران و وەرگێڕان دەستیان لە کار هەڵگرتووە ...

ئێســتا تێدەکۆشم هەندێ خاڵی گرنگ و مێتۆدۆلۆژیکی کە لە نوسینی تێزی کۆمەڵناسیدا دەتوانێ یارمەتیتان بدات باس بکەم. پێم وایە باشترە لە پێشدا گرنگترین پرسەکانی فێرکاری باس بکەم. یەکەم خاڵ، نابێ کۆمەڵناســی لە مێژوو جیا بکەینەوە . ئەگەر خاوەن دیدگایەکی مێژوویی نەبین، ناتوانین تۆژینەوەکەمان بە باشــی ئەنجام بدەین. ئەڵبەت ئەمە بــە مانای ئەوە نییە کە رەهەندی دایمی و بان مێژوویی بەرهەمی ئەدەبی پشتگوێ بخەین. دووهەم خاڵ؛ دابەشکردنی قۆناغەکانی تۆژینەوە؛ شیکاری دەروونی و شیکاری بێروونی. گوڵدمەن قۆناغی یەکەم بە قۆناغی تێگەیشتن ناودێر دەکات، لەم قۆناغەدا ئێمە سەربەخۆ لە هەر دیاردەیەک تێدەکۆشین لە بەرهەم تێبگەین و پاشان پێکهاتەی بنەڕەتی فۆرم و ناوەرۆکی بەرهەم بناسین، کەوابوو دەبێ دوو یان سێ جار بەرهەمێک بخوێنینەوە . چونکە بە یەک جار خوێندنەوە ناتوانین هەموو پرســێکی بەرهەمێک بناسین. بەتایبەت شاکارە ئەدەبییەکان لە پێکهاتەدا ئاڵۆزن، لە فۆرمدا ئاڵۆزن، تەنانەت بۆئەوەی لە کوندی کوێر تێبگەن دەبێ دوو ســێ جار بیخوێننەوە تــا لێی تێبگەن. بەڵام شــیکاری وردبینانــە دەبێ چەندین جار بیخوێننەوە . ئەمە قۆناغی شــیکاری دەروونی، یان بە وتەی گوڵدمەن قۆناغی تێگەیشــتنە . ئەم قۆناغە هەمیشــە بەشــێوەی ناتەواو راڤە کراوە . یانی هەمیشە بەشێک لە بەرهەم راڤە کراوە، بەڵام دەبێ گشتێتی بەرهەم راڤە بکەین، ئێستا چ بەرهەمێکی تایبەت بێت، یان ســەرجەم بەرهەمەکانی هونەرمەندێک بێت، دەبێ تێکڕای بەرهەم یان ٨٠ لە سەدی راڤە بکەین. نە ئەوە کە تەنیا بەشێکی کەمی بەرهەم راڤە بکەین. ئەمە خاڵێکی گرنگە . کاتێ قۆناغــی یەکەم، یان شــیکاری دەروونی تەواو بوو، ئەوجار دێین ئــەم پێکهاتەی بچووکە، یانی دنیای

بچووکی بەرهەم لە دنیای گەورەتریدا دەگونجێنین. لێرەدا بە دووهەمین قۆناغی تۆژینەوە دەگەین کە بریتییە لە "قۆناغی شرۆڤەکاری" یان شیکاری بێروونی. لێرەدا پێوەندی پێکهاتەی بەرهەم لەگەڵ دیاردە کۆمەڵایەتییەکان شرۆڤە دەکەین. کەس ناتوانێ حاشا لە پێوەندی داهێنانی فەرهەنگی لەگەڵ دنیای کۆمەڵایەتی بکات. بەڵام چۆنیەتی ئەم پێوەندییە گرنگە. هیچ بیرمەندێک ناتوانێ بڵێت داهێنانی فەرهەنگی و هونەری هیچ پێوەندی بە دنیای کۆمەڵایەتییەوە نییە. بەڵام روونکردنەوەی چۆنیەتی ئەم پێوەندییە لە بواری فەلسەفە و تیۆری ئەدەبیدا ئاڵۆزترین باسی وروژاندووە. بیری زاڵی ئاکادمیک و دەرەوەی ئاکادمی ئەم پێوەندییە بەشێوەی مکانیکی راڤە دەکات، یانی داهێنانی فەرهەنگی راستەوخۆ لەگەڵ دۆخی کۆمەڵایەتی و بەتایبەت دۆخی ئابووری پێوەند دەدات. یان بە وتەیەکی تر، داهێنانی فەرهەنگی وەک بەشێک لە سەرخان، بە رەنگدانەوەی راستەوخۆی ژێرخان دەزانێت. هەتا ئەمڕۆ چ لە زانکۆکان و چ لە دەرەوی زانکۆکان، وەها دیدگایەکی میکانیکی زاڵ بووە. بە وتەی گوڵدمەن تەنانەت لە تۆژینەوەی مارکسیستیدا کە باسی سەرخان و ژێرخان دەکەن روانگەی میکانیکی زاڵ بووە. بەڵام دواتر ئاشکرا بوو کە پێوەندی بەرهەمی فەرهەنگی و هونەری لەگەڵ دنیای ئابووری کۆمەڵایەتی، ئێجگار ئاڵۆز و ناڕاستەوخۆ و پڕنێوەنجییە. یانی چەندین ئەڵقەی پێوەندی دەپێوێ پاشان پێوەندی پێکدێنێ. ئەگەر بەرهەمێک رەنگدانەوەی راستەوخۆی دۆخی کۆمەڵایەتی بێت، بەرهەمێکی ئێجگار نزمە و لە ئاستی دروشمداندا دەمێنێتەوە کە یان لایەنی سیستمی زاڵ دەگرێت یان دژایەتی دەکات. وەها بەرهەمێک ناتوانێ بەرهەمێکی نەمر و رەسەن بێت، چونکە نوسەر رەنج و شەونخونی بۆ نەکێشاوە. ژانی پێوە نەگرتووە. تەنیا بەشێوەی سادە پرس و روداوی ئاسایی رۆژانەی باس کردووە. کەوابوو دەبێ بزانین کە پێوەندی نێوان داهێنانی کولتوری و دنیای ئابووری کۆمەڵایەتی ئێجگار ئاڵۆز و پڕنێوەنجییە ... لە بابەتەوە دوو رەوت بە لاڕێدا دەچن: گرووپێک لە هونەرمەندان و بیرمەندان دەڵێن بەرهەمی هونەری تەواو سەربەخۆیە و هیچ جۆرە پێوەندییەکی لەگەڵ دۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی زەمانە نییە و؛ گرووپی دیکە دەڵێن بەرهەمی ئەدەبی هونەری رەنگدانەوەی راستەوخۆی سەردەمی خۆیەتی. دەبێ هەر لە سەرەتادا جیاوازی خۆمان لەگەڵ ئەم دوو رەوتە دیاری بکەین و ئاکامەکانی ئەم دوو روانگە لە کارو تۆژینەوەدا وشیارانە دەربخەین... بۆ نمونە لە وڵاتی خۆماندا ئەم بیرە زاڵە: دەڵێن لەم وڵاتەدا شۆڕشێکی مەزن و جەنگێکی مەزن رووی داوە، بۆچی هونەرمەندان ئەم جەنگ و شۆڕشە بەشێوەی هونەری نانەخشێنن. یانی پێیان وایە کە دیاردەی کۆمەڵایەتی دەبێ راستەوخۆ ببێت بە بەرهەمی هونەری. وەها شتێک قەت ئیمکانی نییە. نمونەی زۆر لەمەش مەزنتر لە وڵاتانی بلوکی کۆمۆنیستیدا روویدا و بەتەواوی تووشی شکست هات. تایبەتمەندییەکی زاتی هونەر ئەوەیە کە لە دۆخی ئێستا واوەتر دەچێ، یانی لە راستیدا لەبەرئەوەی هونەر لە دۆخی ئێستا واوەتر دەچێ و لەئاست دۆخی "واقێع" دۆخی "ئایدیال" دێنێتە ئاراوە، ناکرێت لە قاڵبێکدا بیگونجێنین. هەر بەو هۆیە کە ریالیزمی سۆسیالیستی تێکشکا، هەر ریالیزمێکی تر بە هەر پاشبەندێکەوە تێکدەشکێت. چونکە هونەرمەندێک کە بیەوێ دۆخی ئێستا ستایش بکات لە بناغەدا خیانەت بە هونەری خۆی دەکات. سەرەڕای ئەمەش دۆخی ئێستا دۆخێکی ئاڵۆز و پڕ ناکۆکییە. هەر دۆخێکی مێژوویی ئاوسی ناکۆکی و گۆڕانە. لە هەر قۆناغێکدا و لە ژیانی هەر مرۆڤێکدا، "واقعیەت" و "ئایدیال" لە تەنیشت یەکتر لە کێشەدان. لە ژیانی هەر مرۆڤێک و لە مێشکی هەر کەسێکدا سەنتێزێک لە واقعیەت و ئایدیال لە ئارادایە. کەوابوو ئەگەر بڵێین وەرن دۆخی ئێستا ستایش بکەن یاسای بنەڕەتی ژیان (ناکۆکی و گۆڕان) رەت دەکەینەوە. ئەمە بیرە هەر لەو روانگەوە سەرچاوە دەگرێ کە هونەر بە رەنگدانەوەی راستەوخۆی دۆخی سەردەم دەزانێت و هونەر

لەئاست سیاسەت ملکەچ دەکات...

ئەم دیدگا تووشی شکست هاتووە، چونکە لەگەڵ سروشتی هونەر لە ناکۆکیدایە. هونەرمەند وردبینە و هەموو رەهەندێکی جوانی و دزێوی راستییەکان دەبینێ... یانی ئەگەر ئێوە هەموو راستییەکان بڵێن هەنـــدێ کـــەس لێتان زیز دەبن. چ لـــە نێو بنەماڵە، چ لە دەڤەری ئاکامێـــک و چ لە بواری ئابووری و سیاسیدا. یانی باسەکان بەتەواوی باسی ئابستراکت نین، بەڵکو لەگەڵ ژیانی رۆژانەمان لە پێوەندیدان... یانی ئەگەر کۆمەڵناســـی کولتور بناســـین، دۆخی ژیانی رۆژانەمان دەگۆرێت. یانی ئەگەر بەم دیدگایە تەیار بن، پێوەندی شەخســـی خۆشتان دەگۆردرێت. ئێســـتا با بگەرێینەوە بۆ چۆنیەتی پێوەندی نێوان بەرهەمی هونەری و دنیای کۆمەڵایەتی. ئەمە ئاڵۆزترین بەشی ئەم باسەیە و هەر لێرەدایە کە جیاوازی روانگەکانی لـــوکاچ، گوڵدمەن، باختین و کوهلێر دەردەکەوێت. ناتوانین هەموو دیدگای ئەم بیرمەندانە لە ســـمینارێکدا باس بکەین. بۆیە دەڵێم وریا بن گرێی کوێری پرســـەکە هـــەر لێرەدایە، نە هونەر بە دیاردەیەکی تەواو رەها بزانن و نە بە رەنگدانەوەی پەتی دۆخی سەردەمی بزانن.

**- ئەگەر هونەر بە دیاردەیەکی رەها بزانین تووشی چ کێشەیەک دەبین؟**

* ئەم شـــتە پێچەوانەی راستییەکانە. یانی چونکە هەموو راستییەکان لەبەر چاو ناگرێت، ناتوانێ دیاردەی هونەر راڤە بکات. یانی هونەر بەدەر لە کات و شوێن دەبینێت و ناتوانێ هونەرێکی تایبەت کە لە ســـەردەمێکی تایبەتدا پەیدا دەبێت، راڤە بکات. ئێمـــە وەک کۆمەڵناس و توێژەری بواری ئەدەبیات دەمانـــەوێ روونی بکەینەوە کە بۆچی فلان رێبازی هونـــەری لە قۆناغێکی مێژوویی تایبەتدا لە ئێران پـــەرە دەگرێـــت؟ بۆچی ئەندێشـــەی عیرفانی لە قۆناغێک لـــە مێژووی ئێراندا گەشـــە دەکات؟ بۆچی هونەرمەندان روو دەکەنە عیرفان؟ ئێمە دەبێ ئەم دیاردانە بەشـــێوەی مێژوویی و سۆســـیۆلۆژیک راڤە بکەیـــن. چونکە هەر قۆناغێک خاوەن تایبەتمەندی خۆیەتی، ئەگەر شـــیکاری مێژوویی بەکار نەبەین، ناتوانین پرسەکان وەڵام بدەینەوە. لە راستیدا هونەر خاوەن سەربەخۆیی رێژەییە. من هونەر بە شتێکی رەها نازانم. کەوابوو دەبێ بزانین کە هونەر خاوەن سەربەخۆیی رێژەییە و لە رووداوەکانی رۆژانە واوەتر دەچێت. چۆن؟ ئاخر هونەری رەسەن هەروەک وتم: "زۆرینەی وشیاری شیاو دەنەخشێنێ، نەک وشیاری درۆینە". یانی ئەگەر وشیاری درۆینە (DISINFORMATION) بەیان بکات، دەبێتە هونەرێکی نزم و بێ بایەخ. هونەرێک لە هەموو میدیاکانی جیهانەوە بڵاودەکرێتەوە، ئەڵقەکانی تەلەفیزیۆن، گۆڤاری پڕ تیراژ و کتێبی پڕ تیراژ و هتد. هەموو ئەمانە ئاســـتی نزمی وشـــیاری درۆینە دەردەخەن و ناتوانن وەک بەرهەمی نەمری هونەری بمێننەوە. هەموویان مێژوویان بەســـەرچووە، بەر لە بڵاوبوونەوە مردوون. هیچ کەس دووبارە چاپیان ناکاتەوە... بەڵام هونەرمەندی رەسەن تێدەکۆشێ مانای شاراوەی ئاکار و رەفتاری خەڵکانـــی هاوچەرخی خۆی راڤە بکات و گەوهەری راســـتییەکان بناســـێت. ئێمە لە یەکەم ســـەرنجدا ناتوانین هیچ دیاردەیەک بەتەواوی بناســـین. لێرەدا پرســـی "زات" و "هێما" دێتە ئاراوە. یانی پرســـی فەلسەفی و لۆژیکی: هێمای دیاردەیەک نیشانەکان دەردەخات بەڵام خودی زات دەرناخات. بۆئەوەی زاتی دیاردەیەک بناســـین دەبێ لە هێماوە دەســـت پێبکەین تا بە گەوهەری بگەین. دەبێ کۆمەڵێک فاکتەر لەبەرچاو بگرین تا بە زات بگەین. کاتێک کە دەسەڵات دەیەوێت خۆی بەسەر هونەردا بسەپێنێ، مرۆڤ دەیەوێ بەرەو هونەری رەها بچێت، بەڵام ئەم رەوتەش ناتەواوە و ناتوانێ هیچ پرسێکی کۆمەڵایەتی راڤە بکات. بەڵام مێتۆدی مێژوویی ســـەلماندوویەتی و توانیویەتی سەرهەڵدانی رۆمانی مێژوویی راڤە بکات. رۆمانی مێژوویی لە سەردەمێکی تایبەتدا لە ئەوروپا پێکهات و پەرەی سەند و هەموو وڵاتانی گرتەوە.

هیچ کەس نەیتوانیوە بە دیدگای فۆرماڵ ئەم دیاردە راڤە بکات. بەڵام لوکاچ بە شـــیکاری مێژوویی ئەم پرسەی راڤە کردووە و کتێبەکەی پرستیژی جیهانی هەیە... تەنانەت ئەو کەسانەش کە نەیاری لوکاچن ناتوانن حاشـــا لە گرنگی ئەم کتێبە بکەن. هەمویـــان دەڵێن کتێبێکی مێژوویی و گرنگە کە چۆنیەتی پێوەنـــدی دیاردە مێژووییەکان لەگەڵ دۆخی کۆمەڵایەتی ســـەردەمی خۆی روون دەکاتەوە. لوکاچ قەت هونەر بە رەنگدانەوەی راستەوخۆی دۆخی کۆمەڵایەتی نازانێت.

**- لەم نێوەدا ئەڵقەکانی نێوەنجی نێوان هونەر و دۆخی کۆمەڵگە چ رۆڵێک دەگێڕن؟**

– پرسی ئەڵقەکانی نێوەنجی ئاڵۆزترین بەشی ئەم باسەیە... لەمەڕ نێوەنجی گوڵدمەن بە گەڵاڵەکردنی پرســـی "جیهانبینـــی" هەنگاوێکی گەورەی هەڵگرت. یانی گوڵدمەن دێـــت لەنێوان دۆخی کۆمەڵایەتی و داهێنانی کولتوری هونەریدا، پرســـی جیهانبینی دەگونجێنێ، ئـــەو دەڵێ جیهانبینی نیوەی داهێنانی کولتوری پێکدێنێ. پرسی جیهانبینی پرسێکی ئاڵۆزە کە هەندێ لە بیرمەندان راڤەیان کردووە. رەنگە هێگل، وێبر یان لوکاچ تان خوێندبێتەوە. وەک وتم ئێمە لە هەموو بارودۆخێکدا لەگەڵ دوو جۆر وشیاری بەرەوڕوو دەبین. وشـــیاری درۆیین و وشـــیاری راســـتین. هونەرمەند یان بیرمەند دێت مانا و کارکردی وشـــیاری و ئاکاری خەڵکی ســـەردەمی خۆی دەنەخشـــێنێ و راڤەی دەکا و دەڵێ ئەم هەستە یان ئەم ئەندێشەیە چ مانایەکی هەیە. بە رای گوڵدمەن هەموو کار و کردارێکی مرۆڤ ماندارە و ئەرکی بیرمەند ئەوەیە ئەم مانایە بناسێ و راڤەی بکات. لێرەدا لە زانست نزیک دەبینەوە. بەڵام ئەم باسە کاتێ دەڕواتە پێش و لە جیهانبینی نزیک دەبێتەوە، ئاڵۆزتر دەبێت. جیهانبینی لە ئایدیۆلۆژی بەرزترە. ئایدیۆلۆژی زیاتر وشیاری درۆینە بەیان دەکات.

خاڵێکی گرنگتر ئەوەیە کە ســـوژە/ بکەری راستەقینە داهێنانی کولتوری و بە وتەی گوڵدمەن هەر کردارێکـــی ئینســـانی یان تاکە یان کۆمەڵە. لەم بابەتەوە لە مێـــژوودا دوو روانگەمان هەیە. هەندێ لە بیرمەندان، وەک رەوتی رۆمانتیســـیزم پێیان وایە بکەری راستەقینە تاکە و هونەرمەند تاکێکی بلیمەت و ناوازەیە. بەڵام دیدگایەکی ترمان هەیە کە پێی وایە سوژەی راستەقینەی داهێنانی هونەری، کۆمەڵە. ئەمە پرسێکی ئێجگار گرنگە و لە دژی روانگەی زاڵە. بۆ نمونە ئێمە هەموو دەڵێین فردەوسیی شانامەی نووسیووە. بەڵام بەپێی ئەم دیدگایە فردەوسیی شانامەی نەنووسیوە. خولقێنەری راستەقینەی شانامە فردەوســـیی نییە... یانی بەپێی دیدگای گوڵدمەن هونەرمەند و بیرمەندی گەورە رەمز و هێما و چەمک و کاتێگۆرییەکانیان لە جڤات و سەردەمی خۆیان وەردەگرن. یانی دۆخی کۆمەڵایەتی ئێستای ئێران من نەمخولڵقاندووە، تۆ نەتخولڵقاندووە... شـــاکاری بـــەرزی هونەری پوختەی هەموو بەرهەمەکانی مێژووی پێـــش خۆیەتی. یانی هەر بەرهەمێک کاریگەری بەرهەمەکانی پێشـــووی پێوە دیارە. یانی هونەرمەندی مەزن لە بوارەکەی خۆیدا شـــارەزایی بەرینی هەیە و مێژووی پێش خۆی بە وردی دەناســـێت. یانی لە راســـتیدا هونەرمەند هەست و ســـۆز و چەمک و ماناکان لە گرووپێکی کۆمەڵایەتی وەردەگرێ کە خۆی ئەندامی ئەو گرووپەیە. پاشـــان هەست و سۆز و وشیاری ئەم گرووپە بەتۆکمەترین شێوە دەردەبڕێت. هونەرمەندی مەزن زۆرینەی وشـــیاری شـــیاوی چین یان توێژێکی کۆمەڵایەتـــی بەیان دەکات. لە هیچ کۆمەڵێکدا هەموان پرسەکان وەکو یەک نابینن. یانی هەر کەس یان گرووپێک بەپێی پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی پرسەکان دەبینێ. چونکە پێگەی گرووپەکان جیاوازە، دیدگاشیان جیاوازە. لەمەڕ سوژەی کۆیی، گوڵدمەن بە پێڕەوی لە لوکاچ گرنگترین سوژە لە مێژوودا بە چین و گرووپی کۆمەڵایەتی دەزانێ. یانی دەڵێ: "بەدرێژایی مێژوو جیهانبینییەکان زۆرینەی وشیاری شیاوی گرووپ یان چینە جیاوازەکان بەیان

دەکـــەن.“ لێرەدایە کە توێژەر دەبێ ئەو کاتێگۆرییانـــە کە بناغەی بەرهەمیان پێکهێناوە دیاری بکات. یانی لە پێشـــدا شـــیکاری دەروونی بکات. پاشـــان بێت چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی خۆی بناسێت، مێژووی چڤاتی خۆی بناسێ و بتوانێ چەمک و ڕەمزەکانی بەرهەم لەگەڵ جیهانبینی گرووپێکی تایبەت پێوەنـــد بدات و بڵێت جیهانبینی فلان گرووپ لە بواری فۆرمی فانتازیکدا ئەم بەرهەمەی خوڵقاندووە. ئەگـــەر خوڵقێنەری بەرهەمی هونەری بە تاک بزانین، ناتوانین چۆنیەتی گرســـان و پێکهاتنی بەرهەم ڕاڤە بکەین.

**- هەم ســوژەی تاکی و هەم ســوژەی کۆیی هەردوو ڕۆڵی گرنگ دەگێڕن. بۆچی ئێوە هەموو شتێ بە سوژەی کۆیی دەزانن؟**

* من قەت نامەوێ گرنگی ســـوژەی تاکی پشـــتگوێ بخەم. سەرەنج بدەن ڕۆڵی سوژەی کۆیی روون و ئاشـــکرایە، یانی بەهای هونەرمەندی مەزن لـــە پێکهێنانی ئەوپەڕی تۆکمەییدایە. پرس و کاتێگۆری و کێشـــەکان لە ســـەردەمی خۆی وەردەگرێ. لێرەدا سوژەی ئەم چەمک و کێشە و پرسانە، کۆمەڵگەیە. ڕۆڵی تاک لێرەدایە کە مانا بەم شتانە دەبەخشێ. لێرەدا ڕۆڵی تاک دێتە ئاراوە. من قەت حاشا لە وەها ڕۆڵێک ناکەم. وەک وتم ســـوژەی راســـتینی داهێنانی کولتوری، کۆمەڵگەیە. یانی ڕۆڵی تاک لەوەدایە کە چەمک و پرســـەکان لە کۆمەڵگە وەردەگرێ و فۆرم و تۆکمەیی پێدەبەخشێ. یانی ماتریاڵی خاو لە سەردەمی خۆی وەردەگرێ.

**- ئەگەر کەسێک وەک ڕەوتی ڕۆمانتیک ڕۆڵی سـوژەی تاکی بە گرنگ بزانێت، ئایا دەتوانێ کۆمەڵناسی ئەدەبیات بەکاربێنێت؟**

* نا! بەتەواوی حاشـــا لە کۆمەڵناســـی ئەدەبیات دەکات. بۆ ئەو ئەم دیدگا هیچ مانایەکی نییە. چونکە ئەو ڕۆڵی کۆمەڵ و کۆمەڵگە بەتەواوی پشتگوێ دەخات.

وشـــیاری درۆینە شتێکی نەگۆڕ نییە و هەندێجار لەپڕ دەگۆڕدرێت. گوڵدمەن لە بواری سیاسەت و وشـــیاری درۆینەدا نمونەیەک دێنێتەوە: ٥ مانگ بەر لە ئۆکتۆبری ١٩١٧ کە شۆڕشی روسیا سەرکەوت، لە شـــوراکانی کرێکاریدا ئەم باســـە لە ئارادا بـــوو کە ئایا زەمین هی جوتیار بێت؟ یان بە شـــوراکان بدرێت؟ ئەو کات هەموو خەڵکی روسیا هاودەنگ نەبوون کە هەموو دەسەڵاتێک بە شوراکان بدرێت. یان لایەنگری تزار بوون، یان لایەنگری دەوڵەتی کرنســـکی. ٥ مانگ دواتر ئەم وشیارییە درۆیینە بەشێوەی پێچەوانە دەرکەوت. ٨٠ لە سەد لەو خەڵکە کە دەیانوت با کرنسکی لەسەر دەسەڵات بێت، دەنگیان بە شـــوراکان دا. ئەو کات کە لێنین ڕێبەری شۆڕش بوو و لە هەموو ڕێبەران پێشەنگتر بوو، گوتی ئێستا دەبێ دروشمی خۆمان بگۆڕێن و هەموو دەسەڵات بە شوراکان بسپێرین. ئەم دروشمە گرتی و سەرکەوت. ئەم دروشـــمە لەو کاتەدا ئەوپەڕی وشیاری شیاوی خەڵکی روسیای دەردەبڕی. بەڵام کاتێ کە گوتیان: با زەمینەکان بەپێی سیستمی هاوبەش بەڕێوە ببەین. گوتی نا. گوتی وەها دروشمێک زۆر لە وشیاری جوتیاران سەرترە. جوتیار ئەگەر زەمینی نەبێت ئیتر جوتیار نییە، دەبێتە کرێکار. یانی جوتیار ناتوانی ئەم شتە هەرس بکات.

یانی لێنین کە ڕێبەری سیاســـی واقعبین بوو زۆرینەی وشـــیاری شیاوی خەڵکانی سەردەمی خۆی ناسیبوو. لە ژیانی ڕۆژانەی خۆشماندا ئەم جۆرە شتانە دەبینین. زۆر جار نابێ هەندێ شت بە هەندێ کەس بڵێین، کە قەت لێی تێناگەن. چونکە لە ئاســـتی وشیاری ئەوان واوەترە. یانی کاتێ لەگەڵ دایک

و باوکتان باسێک دەکەن و هەلومەرجی فیکری و کۆمەڵایەتی ئەوان لەبەرچاو ناگرن، ئێوە هەڵە دەکەن نەک ئەوان. چونکە زەینی ئەوان بەجۆرێک راهاتووە کە زۆر شت وەرناگرێت...

### - چۆن دەتوانین چەمکی بنەڕەتی بەرهەم بناسین؟

* کاتێک بەرهەمێکی هونەری دەخوێننەوە دەتوانن چەمکی سەرەکی لەودا دیاری بکەن. بۆ نمونە لە دیوانی حافظ دا چەمکی سەرەکی "رند" و "رندی" یە. حافظ خۆی بە "سەرقافلەی رندانی جیهان" دەزانێت. چەمکێکی سەرەکی دیکە "سالوس و دووڕوویی"یە. ئەم چەمکانە لە زۆربەی شێعرەکاندا دووپات دەبێتەوە. چەمکێکی تر ناکۆکی نێوان شێخ و رندە. یانی دژایەتی شێخ و رند پەرستی. چەمکی دیکە، گرنگیدان بە عەیش و شادییە. حافظ لایەنگری عەیش و خۆشییە. لە زۆربەی شیعرەکانیدا ئەم چەمکە دەبینرێ و بە زۆری دووپات دەبێتەوە. بەمجۆرە بە چەندین جار خوێندنەوە دەتوانین چەمک و کاتیگۆری سەرەکی بەرهەمی هونەری فیکری دیاری بکەین.

بۆ تۆژینەوەی هەر بەرهەمێک دەبێ زانیاری بەرینی مێژوویمان لە سەردەمی خوڵقانی هەبێت. دەبێ لە هەموو بوارەکاندا شارەزا بین. بۆ نمونە داڤینشی مرۆڤێکی سیاسەتڤان، ماتماتیکزان، ئەرشیتیکت، پەیکەرساز، نیگارکێش، شاعیر، عاشق و ... بووە. یانی هەموو ئەو بوارانە کە ژیانی مرۆڤ پێکدێنن، لەودا کۆبوبوونەوە. بەم هۆیە تا دنیا دنیایە، داڤینشی داڤینشییە. چونکە مرۆڤێکی هەمەلایەنە بوو. یانی هونەرمەندان و بیرمەندانی گەورە، مرۆڤی کامڵ بوون. لە سیاسەت، ئەدەبیات، فەلسەفە و ئستاتیکدا شارەزایی وردیان هەبوو، لە هەموو بوارێکدا شارەزا بوون و هەموو پرسەکانی مێژوو و سەردەمی خۆیانیان ناسیوە تا توانیویانە بە جێگایەک بگەن.

### سەرچاوە:


تا دام اخر، منتخب اثار و گفتوگوهای پوینده، نشر چشمه.

# سەبارەت بە عەلمانیەت
# چاوپێکەوتن لەگەڵ پرۆفیسۆر مایك كینگ

سازدان و وەرگێڕانی : عەزیز ڕەئووف

دکتۆر مایک کینگ پســپۆرە لە بواری عەلمانیەت و ئایینەکاندا. ئەو مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی کێنت. کینگ لە ساڵی ١٩٥٣ لە لەندەن لەدایک بووە. خاوەنی چەندیــن کتێبی بەنرخـــە لە بواری عەلمانیەت و چەمکی عەلمانیەت. پرۆفیســۆر کینگ لەڕێی پرســیارەکانی ئێمەوە کە بە ئیمەیڵ ئاراســتەمان کردبوو، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە ئامادەبوو بەڕوونی وەڵاممان بداتەوە. ئەو لەم چاوپێکەوتنەدا لەسەر بەرهەمەکانی خۆی و پێناســەی چەمکی سێکولاریزم و بوونی ئەم چەمکە لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا هەڵوێستە دەکات.

*** ســێکولاریزم بە چ مانایەک دێت؟ دەتوانی کۆنسـێپتی سـێکولاریزمەمان بۆ شــی بکەیتەوە؟**

مایک کینگ: پێناســەی سێکولاریزم بە شێوەیەکی فراوان پەیوەندی بە ژینگەی کۆمەڵگــەوە هەیە و دوو شــت دەبێــت ڕوو بدات: یەکەمیــان وەدەرنانی ئایین لە بەشداری حکومەت و بەڕێوەبردندا (واتە لە ژیانی زۆرینەی خەڵک)، دووەم، گرەنتی ئازادی ئاینی، ئەمەش بەو مانایەی کە باوەڕ لە کۆمەڵگەدا ئازاد بێت. ئەمە بەشێوە گشــتییەکەی پێناسەی ســێکولاریزمە. بەڵام بەنســبەت منەوە کەمێک زیاتر لەو پێناسەیە بە پێویست دەزانم، ئەویش ئەوەیە کە ئایین بەشێوەیەکی فراوان دەبێت لە کەلتوری کۆمەڵگەدا نادریار بێت. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە بەبۆچوونی من بوونی

ئایین بەمانای مەترسییەکی سەرتاپاگیرە لەسەر مشتومەڕەکان لەڕێی ڕۆمان و تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ڕۆژنامە و فیلمەکانەوە. هەر ئەمەشە وادەکات کە جیاکاری لەنێوان سێکولاریزم و ئایینەوە ببینین.

*** تۆ لە کتێبی (سێکولاریزم: بنەما شاراوەکانی بێباوەڕی) باستان لە چەمک و ماناکانی سێکولاریزم کردووە، دەکرێ لەبارەی ئەو کتێبەتانەوە بۆمان بدوێیت؟**

مایک کینگ: ئەو کتێبە بەرهەمی زیاتر لە بیست ساڵی پرسیارەکانمە سەبارەت بە بناماکانی عەقڵی سێکولار. لەو کتێبەدا باسم لە بێباوەڕی و سێکولاریزم کردووە لە مێژووی خۆرئاوادا کە بووەتە هۆی گەشەکردنێکی نائاسایی یەکخواپەرستی «MONOTHEISM».

*** ئێوە چۆن و کەی وەک سێکولارێکی هیومانیست دەرکەوتن؟**

مایک کینگ: لە هیچ شوێنێکدا من بانگێشتی ئەوەم نەکردووە کە سێکولارێکی هیومانیستم، بەڵکو زیاتر من وەک هیومانیستێکی پۆست سێکولار ناسراوم. زاراوەی پۆست سێکولار یەکێکە لەو زاراوانەی کە من دەساڵ پێش ئێستا بەکارم هێناوە، ئەمەش وەک بەکارهێنانێک بۆ کردنەوەی ئەو پرسیارانەی کە کەم تا زۆر پەیوەندیان بە ڕۆحەوە هەیە، بۆ پاراستنی ژینگەی سێکولار و بیرکردنەوەی ڕەخنەیی. من لە کتێبی «POSTSECULARISM: THE HIDDEN CHALLENGE TO EXTREME RELIGION» کێشەکانی سێکولاریزم و چەمکی «بێباوەڕی نوێ»م شیکردۆتەوە.

*** سێکولاریزم هەمیشە وەک دیاردەیەکی ڕەخنەیی بۆ پرۆسەی مۆدێرنیزم دەکرێت قسەی لەسەر بکرێت. بەڵام گەر من پرسیارەکەم بە شێوەیەکی تر بکەم و بیبەستمەوە بەئایینەوە، دەڵێم بەبۆچوونی ئێوە چ پەیوەندیەک لەنێوان ئایین و سێکولاریزمدا هەیە؟**

مایک کینگ: مێژووی پەیوەندی نێوان ئایین و عەلمانیەت بریتیە لە پەیوەندیەک لێوانلێو لە ململانێی ناپێویست. یەکێک لە ئامانجەکانی سێکولاریزم ئەوەیە کە بەشێوەیەکی سەرەکی بیریارانی سەدەی ڕۆشنگەری کاریان لەسەر کردووە و نەیانویستووە گورز لە ئایین بدەن، بەڵکو ویستویانە ئایین لەگەڵ مۆدرێرندا بگونجێنن، یان بەشێوەیەکی تر ئەوان بە مەفهومێکی عەقڵانی مامەڵەیان لەگەڵ ئەو دوو چەمکەدا کردووە. ڕەتکردنەوەی ئایین لەلایەن دەوڵەتە نوێیەکانی ئەوروپاوە ( بەبۆچوونی من) شکستی جیهانبینی نوێی ئایین بوو لەو سەردەمەدا.

*** بەبڕوای ئێوە بزوتنەوە ئیسلامییە نوێیەکان دەتوانن بیرکردنەوەی ئێمە سەبارەت بە چەمکەکانی خۆرئاوا بەتایبەتی سێکولاریزم بگۆڕن؟**

مایک کینگ: من بزوتنەوە ئیسلامییەکان وەک بزوتنەوەگەلێکی سیاسی دەبینم نەک ئایینی. بۆمن ئەوە گرنگ نییە بزوتنەوەکان کریستیانین، موسوڵمانن یان بودین، یاخود هەر ئاینێکی ترن. کاتێک ئایین تێکەڵ بە ئامانجە سیاسییەکان دەبێت، هەرچۆنێک بێت دەبێت چاوەڕێی چەندین قەیرانیش بکەین. لەبەرئەوە من دوو وەڵامم بۆ پرسیارەکەی ئێوە هەیە. بمبورە ئەگەر بەڕێزتان هاوسۆز بن بە ئایین، من دەتوانم ئەوە بڵێم کە ئاینی ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی لە ململانێیەکی بەردەوامدابووە لەگەڵ سێکولاریزم و تەنانەت بوخزەکانی دژ بە سێکولاریزم هەمیشە بەئاشکرا دەرکەوتووە. بەڵام لەلایەکی ترەوە کاتێک من ئایین دەبینم وەک بوونێکی توندڕەو «بە هەر شێوەیەک بێت»، سەرباری

ئەوەش من هەمیشـــە وا لە سێکولاریزم گەیشـــتووم کە دژ بە توندڕەویەتە. بەڵام بە هەر ڕێگەیەک بێت خۆرئاوا دەخوازێت بە شێوەیەک لە شێوەکان تیۆرەکانی خۆی تاقی بکاتەوە.

*** پەیوەندی نێوان فۆرمی نوێی دەسەڵات و پرسیارەکانی لەبارەی ئایین و مافەکانی مرۆڤ و سێکولاریزم چییە، بە بەراورد بە دەسەڵاتی ئیسلامیستەکان لە کۆمەڵگەدا؟**

مایک کینگ: ئەوە پرســیارێکی گرنگە! بەڵام بەبۆچوونی من زۆرێک لە لێکۆڵەرەوان ڕاســت دەکەن کە دەڵێن ئێمە لە سەردەمی شەڕی ساردەوە هاتووین و فۆرمەکانی دەسەڵات کە ئێستا بە «ناسنامەی سیاســی» ناوزەد دەکرێت بەشــێکی دانەبڕاو بووە لە فەزای کۆمەڵایەتی. ئەمەش بەو مانایە دێت کە دەســەڵاتی ڕەها شەڕی ســاردی بەتەواوی بلۆک کرد و کردی بە چەند گروپێکی بچوکتر. هەموو ئەمانە وایکرد کە ئارەزووی سەرهەڵدانی گروپی ئایینی، ڕەگەزی ناسنامەی نەتەوەیی لە سەرهەڵدانی بیرۆکەی «کۆتایی مێژوو»دا بکرێت کە یەکسانە بە کاپیتالیستی لیبرال دیموکراسیەت.

*** تاکو ئێستا هیچ پەرچەکردارێکی فەندامێنتاڵی لە نوسینەکانتدا بەدی کراوە؟**

مایک کینگ: بەدرێژایی ئیشـــکردنەکانم هەوڵی ئەوەم نەداوە باس لە فەندامێنتالیســـتەکان بکەم. تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە کارەساتی ١١ی سێپتەمبەر ڕوویدا و منیش وەکو زۆرێک لە نوسەران بەرامبەر بە فەندامێنتاڵیستەکان نیگەران بووم.

*** ئایا هیچ ئومێدێک بۆ سەرهەڵدانی کۆنسێپتی سێکولاریزم لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا هەیە بەجۆرێک کە مافەکانی مرۆڤ و مافی ئافرەتانی تێدا دەستەبەر بێت؟**

مایک کینگ: بەڵێ، بێگومان ئومێد هەیە. زۆرێک لە سەرکردە کارامەکانی وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان کار لەســەر مۆدێلی خۆرئاوا دەکەن و بەو شێوەیە مامەڵە دەکەن وەک ئەوەی لە خۆرئاوادا سیاسیەکان کاری لەسەر دەکەن، (نمونە لویز لولا سیلڤا و پەروێز موشەرەف). پرسیار لێرەدا ئەوەیە کە چی دەبێتـە هــۆی یارمەتیدانـــی ئەم دۆخە؟ بەبڕوای من ئەگەر خۆرئاوا بەشـــێوەیەکی نەرم و نیان بۆچوونی لەمەڕ جیهانی ئیسلامی تەفسیرەکانی پەرە پێبدات، بێشک دەتوانن لە جیهانی ئیسلامیدا جۆرێک لە هەوادار بۆخۆیان دەستەبەر بکەن و مافەکانی مرۆڤ و مافی ئافرەتانیش لەو کۆمەڵگانەدا ببێتە دەرکەوتەیەکی تەواو پێویســـت. ئەمەش لەبەرئەوەی کە لەو کۆمەڵگانەدا «نەریت» لەسایەی ناسنامەیەکی کەلتوریدا درێژە بە مانەوەی خۆی دەدات.

*** بەبۆچوونی تۆ نەبوونی سێکولاریزم لە زۆرێک لە وڵاتاندا هۆکارە بۆئەوەی ئێمە خۆمان لە سەردەمێکدا ببینینەوە کە ناوی بنێین ململانێ لەنێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا؟**

مایک کینگ: پێناســەی «خۆرهەڵات» بەنســبەت منەوە هەڵگری ئیشکالی گەورەیە. ئێستا کە لە خۆرئاوا باس لە خۆرهەڵات دەکەیت ڕاســتەوخۆ بیرت بۆ ئیســلام دەچێت. بەڵام وەک لێکۆڵەرەوەیەکی ئایینی «خۆرهەڵات» بەنســبەت منەوە دەگەڕێـتەوە بۆ سنوری خۆرهەڵاتی ئێران، لەبەرئەوەی هەرسێ ئایینی بودی و کریســتیان و ئیســلام ســێ ئایینی خۆرهەڵاتین. بەڵام ئەگەر تۆ مەبەســتت ئیسلام و خۆرئاوایە، من ئەوە دەڵێم کە لە ڕۆمانی «تیرۆریست»ی جۆن ئەپدیک باس لە زۆرێک لە ونبووەکانی جیهانی ئیســلامی دەکات، لەوانــە هەڵبژاردنی جۆرێک لە توندوتیــژی و ونکردنی پایەکانی دیالۆگ و

لێکتێگەیشـــتن. بەبڕوای من کۆنسێپتی «بەیەکداکێشـــان» گونجاوە، من پێشنیار دەکەم ئەم چەمکە ببێتە هۆی ئەوەی کە ئێمە بتوانین لەیەکتری بگەین.

*** لە وڵاتە تازەپێشـکەوتووەکاندا بەر لەوەی کار بە سیسـتەمی دەسـەڵاتێکی سـێکولار بکرێت چانسی فەندامێنتالیستەکان فراوانتربێت بۆ ئەوەی دەسەڵات بگرنە دەست. هاوڕای لەگەڵم؟**

مایک کینگ: بەبۆچوونی من هێزە فەندامێنتالیستەکان لە واقیعێکی فرە کەلتوردا گەشەیان کردووە و زیاتر تموحی سیاســییان هەیە و ئەوان ئێســتا لەبەردەم شکستی باوەڕی ئاینیدان. لەکاتێکدا ئەوان دەتوانن لەڕووی سیاسییەوە پێشکەوتن بەخۆیانەوە ببینن، بۆنمونە بوونی کێشەی فەلەستین و دەرکردنی هێزەکانی خۆرئاوا لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاســت. ئەم دوو نمونەیە دەتوانرێت جارێکی تر لێکجیابکرێنەوە. بــەڵام حەماس و حیزبوڵا (بۆ نمونە) بەردەوام دەبن لە گرتنەدەســتی دەســەڵات تا ئەو کاتەی دەتوانن دوو شــت بەدەست دەهێنن: دەسەڵاتێکی سەربازی کە لەسەر یاسای ئیسلامی دامەزرابێت و دووەمیش پێشنیارکردنی کەمکردنەوەی گەندەڵی کۆمەڵایەتی و ئەلتەرناتیڤێکی سیاسی تر لە ناوچەکەدا، لەسەر ئەو مۆدێلەی کە خۆیان باوەڕیان پێیەتی.

*** سوپاس جەنابی پرۆفیسۆر، دەتوانم لە دواین پرسیاردا سەبارەت بە کاری تازەتان بپرسم؟**

مایک کینگ: ســوپاس بۆ ئێوەو بۆ وروژاندنی ئەو پرســیارە گرنگانە. من ئێســتا لەســەروبەندی تەواوکردنی کتێبێکدام لەبارەی عەلمانیەتەوە، ئەو کتێبەش «POSTSECULARISM» کە پێشتریش ئاماژەم پێدا.

* «جۆن كالڤن» و جیهانی سروشتی

لەعەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

* ڕەگەز پەرستی چییە؟

لاس

* شاتوبریان، شیعر و ترس

مارک فومارۆلی

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

* ڕەهەندەکانی ڕیفۆرمی ئایینی لە ئەوروپا

سەردەم

* ماكیاڤیلی سێبەری شەیتان لەسەر زەوی

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانیع

* چلەمین فێستڤاڵی نێو نەتەوەیی شیعری لە شاری ڕۆتردامی هۆڵەندە

سەردار فەتاح ئەمین

* فرانز كافكای نامەكان و خوان ڕۆڵفۆ و پاتریک ساسكەند و ئەم سەردەمەی ئێستامان

ڕەبیع جابر

لە عەرەبییەوە: سەردەم

* چاوپێكەوتنێک بە ژیان و بەرهەمەكانی نوسەری پیرۆیی ماریۆ ڤارگاس یۆسا

لە فارسییەوە: دڵشاد خۆشناو

# "جۆن کالْڤن" و جیهانی سروشتی

له عەرەبییەوە:
شوان ئەحمەد



DAVIS A. YOUNG
JOHN CALVIN AND THE NATURAL WORLD
UNIVERSITY PRESS OF AMERICS 2007
P. 260

نوسەری ئەم کتێبە لێکۆڵیار «داڤیز یۆنگ»ە کە پسپۆڕە لە بواری تیۆلۆژیاو پرسی ڕیفۆرمی ئایینی لە ئەوروپا. لەم کتێبەیدا باس لە کەسایەتی یەکێک لەو گەورە ڕیفۆرمیستە ئاینیانە دەکات کە لە سەدەی شازدەهەمدا کاریگەریان لەسەر کیشوەری ئەوروپا بەجێهێشت، ئەو کەسەش ڕیفۆرمیستی فەرەنسی «جۆن کالْڤن»ە، کە لە دوای «مارتن لۆتەر»ی ئەڵەمانی بە دووەم

ڕیفۆرمیســـت ئەژمار دەکرێت. کەواتە بابزانین ئەم «جۆن کالڤن»ە کێیە؟

لە وەڵامی ئەم پرســـیارەدا نوســـەر دەڵێت: (جۆن کالڤن ســـاڵی ١٥٠٩ لە شاری نویۆن لە باکوری فەرەنســـا لە دایک بووە. هەر لەوێشدا گـــەورە بـــووەو ئەو شـــارەش بـــە ئیمانداری بەناوبانگ بووە. باوکی بەرپرســـی ئایینی ئەو شـــارە بووە، هەر بۆیە کوڕەکـــەی توانیویەتی خوێندنی بەبێ کێشـــە تەواو بـــکات، ئەمەش بـــە پێچەوانـــەی منداڵانـــی دیکـــەی میللەتی فەرەنســـاوە بووە. وەکی ئاشکرایە فەرەنسا لەو کاتەدا بەسەر سێ چینذا دابەش بوو بوو: چینی خانەدان و بنەماڵە ئۆرســـتۆکراتیەکان، چینی پیاوانـــی ئایینی، لەگەڵ خەڵکی ڕەش و ڕوتدا. لە ناو ئەمانەشـــدا تەنهـــا چینی یەکەم خاوەن دەســـەڵات بوو، بەڵام لە ڕێی پاڵپشـــتی چینی دووەمەوە کە پیاوانی ئایینی بوون). پاشـــان «جۆن کالڤن» لە ســـەرەتای تەمەنی لاوێتیدا و بە مەبەستی تەواو کردنی خوێندن ڕودەکاتە پاریـــس. لەوێدا تێکەڵ بە کوڕ و کاڵی بنەماڵە ئۆرســـتۆکراتیەکانی فەرەنســـا دەبێت و سود لە هاوڕێیەتیـــان دەبینێت، بۆ ئەوەی بتوانێت قۆناغەکانـــی خوێندن تەواو بـــکات، بەڵام لەو کاتەدا خوێندنگـــەکان و تەنانەت زانکۆکانیش هـــەر هەمویان ئایینی بوون و کڵێســـا پاوانی کردبوون. واتە فەرەنسا لەو سەردەمەدا هێشتا لە ســـەدەکانی ناوەڕاســـت نەهاتبـــووە دەرێ. وەکی ئاشـــکرایە ئەدیبی بەناوبانگ «ڕابیلێ» بەردەوام لاقرتێی کڵێســـای دەکـــرد و گاڵتەی بـــەو قوتابخانـــە ئایینیانەش دەکرد کە ســـەر بە کڵێســـا بوون، چونکە بە بـــڕوای ئەو ئەو قوتابخانانە دواکەوتون و جگە لە دەمارگیری و جەهل هیچی تر بەرهەم ناهێنن.

شـــایەنی باســـە بیریارێکی مەزنی دیکەی وەک «ئێراســـموس»یش ڕەخنەی گاڵتەجاڕی ئاڕاستەی کڵێسا و خوێندنگە ئایینیەکان دەکرد. «ئێراسمۆس» بە میری سەردەمی ڕێنیسانس دادەنرا. ڕێنیســـانس لەو ســـەردەم و زەمانەدا دەستی پێکردبوو، دەنگدانەوەشی گەیشتبووە فەرەنســـا، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو وڵاتە هێشـــتا لە تاریکی سەدەکانی ناوەڕاست پاک بۆتەوە. ئەمە شتێکە دوای ماوەیەکی زۆر دێتە دی.

لەم ســـەروبەندەدا «جـــۆن کالڤن»ی لاو، هێـــدی هێـــدی لـــە بیروبۆچونی ڕێنیســـانس خوازەکان نزیک دەبێتـــەوە، هەروەها بە بڕوای ڕیفۆرمیســـتێکی ئایینی گەورەی وەک «مارتن لۆتەر»یش ئاشـــنا دەبێت و سەرســـام دەبێت پێی. دواجـــار ئەمانە هانـــی دەدەن بۆ ئەوەی ڕێگەی ڕیفۆرمی ئایینـــی بگرێتە بەرەو وەکی «مارتـــن لۆتەر» لە ڕۆماو ڤاتیکان یاخی بێت. بەڵام دەبوو بەر لەوەی دەســـت بەو پرۆســـەیە بکات، خوێندنی زانکۆی تـــەواو بکات. بۆ ئەو مەبەستەش باوکی لە پاریسەوە گواستیەوە بۆ ئۆرلیـــان و بورگ، چونکە لـــەوێ دوو زانکۆی گەورە و دیار دامەزرابوون.

لەوێدا خوێندنی یاســـا تـــەواو دەکات و بە کەسێکیش ئاشنا دەبێت کە کاریگەری گەورە لە ســـەری جێدێڵێت، ئەو کەسەش «میلیشیۆ رولمار»ە. ئـــەم پیاوە بە ڕەچەڵـــەک ئەڵمانی بوو، ئاگاداری بیروبۆچونـــە ڕیفۆرمخوازەکانی «لوتەر» بوو کە خەریک بوو بە نهێنی دەهاتە فەرەنســـاوە. «ولمـــار» توانـــی «کالڤن» بەو بیروبۆچونە تازانە ئاشـــنا بکات و هانی بدات، بـــەرەو ئەقڵانیەتی ئایینـــی بچێت و خۆی لەو بیروباوەڕە دۆگما و چەقبەستووانەی سەدەکانی ناوەڕاست ڕزگار بکات.

هـــەر لەدوتوێی ئەم کتێبەدا نوســـەر باس

لەوەش دەكات كە: (كالڤن دوای مردنی باوكی لە ساڵی ١٥٣١، هەستی بەوە كرد كە لە دەست ئەو فەرمان و مۆجیاریانە قوتاری بووە كە لە سەرشانی باربوون. شایەنی باسە یاسای تەنها لەبەرخاتری باوكی خوێندو خۆی دڵی پێوە نەبوو، بەڵام دوای ئەوە ئازاد بوو حەزی بە چیە ئەوە بخوێنێت. ئەوەی حەزیشی پێی بوو ئەدەبی جوان و قەشەنگ بوو، وەك چۆن لە سەرەتادا بە میری ئەدەبی كۆنی یۆنانی و رۆمانی ئیراسموس سەرسام بوو، تەنانەت لە رابەری ریفۆرمی ئایینی مارتن لوسەریش زیاتر پێی سەرسام بوو، بەڵام لە بواری ئەدەبیاتدا سەركەوتنێكی ئەوتۆی چنگ نەكەوت، لەبەرئەوە رویكردە خوێندنی بابەتە ئایینی و تیۆلۆژیەكان. دوای ئەوە وەك سەرجەم ریفۆرمیست و بیریارە مەزنەكان، دوچاری قەیرانێكی روحی هات، بەڵام دوای ئەوەی ئەو رێگایەی دۆزیەوە كە بە دوایدا دەگەڕا، ساڵی ١٥٣٣ لەو قەیرانە دەربازی بوو. ئەو كات هەستی بە ئارامی كرد و سوپاس یەزدانیكرد بۆ ئەو نیعمەتە، نیعمەتی رزگاربون لە دەست بیروباوەڕ كۆن و بەسەرچووەكانی كڵێسا و گەیشتن بە بیروباوەڕێك و ئیمانێكی تازە).

پاشان رووداوێك هاتە پێش كە بووە مایەی ئەوەی «كاڵڤن» جیابونەوەی خۆی لەگەڵ كڵێسای كاتۆلیكیدا رابگەیەنێت و لە فەرەنسا هەڵبێت، ئەو رووداوەش ئەوە بوو «كاڵڤن» وتارێكی نوسی كە پڕی بوو لە بیروباوەڕە نوێیەكانی «ئیراسموس» و «لوتەر» و پێشكەش بە سەرۆكی زانكۆی سۆربۆنی كرد، تا لە بەردەم ئاپۆرەیەك لە پیاوانی ئایینی و مامۆستایانی زانكۆ و خەڵك و خوای وڵاتدا بیخوێنێتەوە. لەسەر ئەمە دەسەڵاتی باڵای ناو كڵێسا فتوای تەكفیركردنی دەركرد و سەرۆكی زانكۆشی سەركۆنەكرد و بەشەریكە تاوانی ئەوی دانا. بە بیستنی ئەم بڕیارە «كاڵڤن» ناچار بوو یەكەم جار پاریس بەجێ بهێڵێت و ڕووبكاتە یەكێك لە شارەكانی دیكەی فەرەنسا و لەوێ لای یەكێك لە هاورێكانی خۆی بشارێتەوە. لە شاری «ئەنگۆلیم» كتێبخانەیەكی گەورە و گرانی دۆزیەوەو نوقمی دنیای خوێندنەوەی كرد كە دواجار بووە مایەی ئەوەی یەكەمین كتێبی خۆی بنوسێت بە ناوی (دروستبوونی ئایینی مەسیحی) كە كتێبێكی گرنگ و بەناوبانگ بوو. ئەم كتێبە بیرو بۆچونی ریفۆرمخوازانەو تازەگەرانەی لە خۆگرتبوو كە دژ بە بیروباوەڕە كۆن و دۆگماكانی كڵێسا بوون. هاوكات كتێبێك بوو بەسەر فەلسەفەی هیومانستی سەردەمی رێنیسانس و بەسەر لێكدانەوەی نوێی ئایینی مەسیحیدا كرابووەوە.

شایەنی باسە «كاڵڤن» هەر بە نوسینی ئەم كتێبەوە دانەكەوت، بەڵكو ئەوە دەسپێكی هەوڵێكی بەرفراوان بوو بۆ بەگژا چونەوەی بیروباوەڕی تەقلیدی و دەست گرتنی ئەوانەی دەیانویست لەو تەوقە ئاسنینەی كڵێسا قوتاریان بێت. شوێن كەوتوانی «كاڵڤن» بۆ دڕدان بەو شەوەزەنگە، ناچار بوون بە ئاشكراو لە ڕێی بڵاوكردنەوەی بیروڕاكانیانەوە لەسەر دیوارەكانی پاریس و شوێنەكانی دیكەی هەوڵەكانیان بخەنە گەڕ.

ئەم كارە شا «فرانسوای یەكەم»ی شێت گیركرد و فەرمانی دا بە ڕاوەدونان و دەسگیركردنی هەموو ئەوانەی لە دژی كڵێسان. بۆ ئەم مەبەستەش دادگاكانی پشكنینی دروستكرد و گومان لێكراوانیشی لە ئاگردا سوتاند. یەكەم قوربانی ئەم پرۆسەیەش بازرگانێكی دەوڵەمەند بوو كە یەكێك بوو لە دۆستە دڵسۆزەكانی «جۆن كاڵڤن»، بەڵام ئەم زوڵم و ستەمكاریە

نەیتوانی ئـــەو بزوتنەوە چاکســـازیە ئاییندیە ســـەرکوت بکات کە «کالْڤن» لە فەرەنســـادا دەستی پێکردبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە زیاتر تاوی سەند و تەنیەوە. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە ژمـــارەی لایەنگرانی ڕۆژبەڕۆژ زیادی دەکرد. لەگـــەڵ زیادبوونی فشـــار لەســـەر «کالْڤن»، ناچار بوو فەرەنســـا جێ بهێڵێت و لە شـــاری ستراســـبۆرگەوە ڕوبکاتە وڵاتی سویسرا، لەوێ لە شـــاری جنێڤ مایەوە. ســـەرەتاوای دەزانی مانـــەوەی لـــە جنێڤ بـــۆ شـــەوێک دەبێت و وێستگەی پشویەکی کورتخایەن دەبێت، بەڵام دواجار ئەو شـــارە بوو بە پایتەختی ڕیفۆرمی ئایینی پرۆتستانتی.

وەکـــی ئاشـــکرایە بـــۆ شـــوێن کەوتوانی «کالْڤن»، جنێڤ وەکـــی ڕۆماوایە، واتە چۆن ڕۆما پایتەختی ڤاتیکان و کڵێسای کاتۆلیکیە، بەو جـــۆرەش جنێف پایتەختـــی «کالْڤن» و کڵێسای پرۆتستانتیە. دواتر لە نێوان ئەم دوو کڵێسایە یاخود لە نێوان ئەم دوو ئاینزا مەزنەی مەسیحیەتی ئەوروپیدا، شەڕێکی خوێناوی و بێئامـــان بەرپا دەبێت و نزیکەی دوو تا ســـێ ســـەدە دەخایەنێت کـــە ملیۆنەها کەس دەبنە قوربانی.

نوسەر قسەکانی بەم شـــێوەیە کۆتایی پێ دێنێت و دەڵێت: (جۆن کالْڤن مرۆڤێکی مەزن بوو. بەبـــێ ئەو ڕیفۆرمی ئاییندـــی لە ئەوروپا ســـەر نەدەکـــەوت. گومانی تێدا نییـــە مارتن لوتـــەر لەو مەزنتر و بەهێزتر بوو. بیریشـــمان نەچێت بۆ یەکەمجار لوتەر دەستی بە ڕیفۆرمی ئایینی کرد، بەڵام کالْڤن شـــوێن پێی هەڵگرت و کاروانـــی گەیاندە مەنزڵ و پایەکانی ئاینزای پروتســـتانیەتی چەســـپاند. ئەمڕۆکە دەڵێین شارەکەی کالْڤن، خەڵکی دەست بەجێ دەزانن مەبەست شاری جنێڤە).

## سەرچاوە:

بيان الكتب — ٢٠٠٨/٢/١٣.

# ڕەگەز پەرستی چییە؟

لاس



ئەگەرچی ئەوە مۆدێرنەیە کە ناو لە ڕاسیزم دەنێت، بەڵام وەک دیاردەیەک ڕاسیزم یاخود ڕەگەزپەرستی بەرهەمی مۆدێرنە نییە و داهێنراوی ئەو نییە. چەمکی ڕەگەزپەرستی لە نێوان ماوەی دوو جەنگی جیهانی و لە ساڵی ١٩٣٣دا دێتە ناو فەرهەنگی زمانی فەرەنسییەوە، بەڵام بە ئاوڕدانەوە لە مێژوو دەتوانین ئەم دیاردەیە لە ناو تەواوی شارستانیەتە دێرین و ناسراوەکاندا ببینین، بە تایبەتیش لەو شارستانیەتانەدا کە نوسینیان زانیووە. بۆ نمونە گریکیەکان تەواوی گەلانی دیکەیان بە (بەربەری) ناونوس دەکرد، ئیتر ئاستی ژیاریان هەرچۆنێک بوایە.. شارستانیەتی ئیسلامیش، لای خۆیەوە ئیشکالیەتی عەرەب و عەجەمی هەبووە. لە شارستانیەتی ئیسلامیدا، پێوەری ڕەگەزپەرستی ڕەگەزنەبووە، بەڵکو ڕەنگی پێست بووە، واتە ئەوانیتر تەنها ڕەش پێستەکان بوون.

لە دنیای ئەمڕۆدا و بە هۆی هەڵوێستی ڕەخنەگرانەی مۆدێرنە لەو

دیاردەیە، هیچ کەسێک تەنانەت ئەوانەشی تا سەر ئێسقان ڕەگەز پەرستن، قایل نین ئەو سیفەتەیان بدرێتە پاڵ.

لەگەڵ گەڕانەوەی جارێکی دیکەی دیاردەی ڕەگەزپەرستیدا، بەڵام لە بەرگە کلتوریەکەیدا، بەریانێکی دیکەی گەورەی ڕەخنەگرتن لە دیاردەکە هاتۆتەوە ئارا کە نوسەران و ئازادیخوازان و ئەکتیڤستە سیاسیەکان و کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، بە شێوازی جۆراوجۆر بەشداری تێدا دەکەن.

کتێبی (ڕەگەزپەرستی چییە؟)، بەشداریکردنی قەڵەمی ڕۆشنبیر و ئەدیبێکی وڵاتانی جیهانی سێهەمە، لە ڕەخنەگرتن لە دیاردەی ڕاسیزم و دەرەنجامە ترسناکەکانی لەسەر پێکەوە ژیانی کلتورە جیاجیاکان.

ئەم کتێبە ئەدیب و نوسەری مەراکیشی «تاهیربن جەلۆن»، بە زمانی فەرەنسی نوسیویەتی و لە زمانی کچە منداڵەکەیەوە لەو دیاردەیە دەدوێت، لە کۆمەڵگە فەرەنسی ئەمڕۆدا.

کتێبەکە باس لە چەمکێکی ئاڵۆز دەکات، بەڵام بە زمانێکی ئێجگار سادە و ساکار. نوسەر ویستویەتی بەو زمانە ساکارە خەوش و زیانەکانی ئەو دیاردەیە نیشان بدات و ئایدیۆلۆژیای ڕەگەزپەرستی بداتە بەر ڕەخنە، چونکە پێیوایە هەڵکشانی ئەم دیاردەیە لە دنیای ئەمڕۆدا، بە خراپ دەکەوێتەوەو زیان لە هەموو لایەک دەدات. مەسەلەیەکی وا گەرپەرەبسێنێت، دەرگا لەسەر شەڕی کلتورەکان و پێکدادانی شارستانیەتەکان دەکاتەوەو درزێکی گەورە لە نێوان ئینسانەکاندا دروست دەکات. ئەمەش وا دەکات جیهان ببێتە جێگەیەک بۆ ململانێی خوێناوی، لە بری ئەوەی شوێنێک بێت بۆ پێکەوە ژیان و پێکەوەبوون و گوزەراندنی ژیان بە شێوەیەکی ئاشتیانە و دوور لە جیاوازی ڕەگەزی و کلتوری.

# شاتوبریان، شیعر و ترس




مارك فومارۆلی

لە عەرەبییەوە:
هەورامان وریا قانع


دانەری ئەم کتێبە (شـاتوبریان شـیعر و تـرس) توێـژەری گەورەی فەرەنسـا «مـارک فومارۆلی»یە کە ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسـایە. لە کتێبە بەناوبانگەکانی پێشتری ناوی ئـەم دوو کتێبە دێنیـن: (ململانێ لەنێوان کۆنخوازان و تازەگەراندا ۲۰۰۰)، (کاتێ ئەوروپا بە فەرەنسـی قسەی دەکرد ۲۰۰۱).

دانـەر لـەم کتێبە تـازەو قەبارە گەورەیەدا قسە لەسەر ژیانی یەکێک لە ئەدیبە مەزنەکانی مێژووی فەرەنسا دەکات، ئەویـش «شـاتوبریان»ە. ئاشـکرایە «شـاتوبریان» لە نێوان هەردووسەدەی هەژدەهەم ونۆزدەهەمدا ژیاوە، لێـرەوە ئەو هەڵگیرسـاندنی شۆڕشی فەرەنسی ساڵی ۱۷۸۹ بینیوە کە زۆربەی نەوەکـەی بە ئاگری ئەو

شۆڕشە سوتان و کاتێ شۆڕش پێینایە قۆناغی دووەمەوە، واتە ئەو قۆناغەی پێیدەوترێت قۆناغی ترسء تیرۆر، بەشی هەرە زۆری ئەندامانی خێزانی «شاتوبریان» کوژران.

ئەوەی دەیەوێ ئاگاداری ڕوداوەکانی ئەو ماوە دژوارەی مێژووی فەرەنسا بێت، با ئەم کتێبە بخوێنێتەوە. چونکە دانەر لەم کتێبەدا تەنها قسە لەسەر «شاتوبریان» ناکات، بەڵکو قسە لەسەر بەشی هەرە زۆری ئەو کەسایەتییە مێژووییانە دەکات کە لەو سەردەمەدا ژیاون، بەڵام لە میانەی پەیوەندیان بە «شاتوبریان»ەوە قسەیان لەسەر دەکات.

کتێبەکە کراوە بە چوار بەشەوەو هەر بەشەش کراوە بە چەند نەسکێکەوە، بۆ نمونە بەشی یەکەم ئەم ناونیشانە لەخۆدەگرێت: سەدەی شۆڕشەکان. تێیدا دانەر قسە لەسەر ڕۆشنگەری و دژە ڕۆشنگەری دەکات، مەبەست لە یەکەمیان نوسینی فەیلەسوفەکانی وەک «دیدرۆ»و «ڤۆڵتێر»و «دالامبێر»و «ڕۆسۆ»و ئەوانی دیکە دەکات، بەڵام مەبەست لە دووەمیان ئاقارە کۆنەپارێزەکانە کە لەیەککاتدا دژ بە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری و شۆڕشی فەرەنسی بوون. دواتر دانەر هەر لەم بەشەدا قسە لە پەیوەندی نێوان «شاتوبریان»و وەزیرە زۆرزانەکەی «ناپلیۆن» دەکات، واتە «تالێران». هەروەها باس لە پەیوەندی «شاتوبریان» بە فیکری «ڕۆسۆ»و نوسینەکانییەوە دەکات و باس لەوە دەکات چۆن سەرەتا «شاتوبریان» زۆر سەرسام بووە بە «ڕۆسۆ» کەچی دواتر لێی هەڵدەگەڕێتەوە.

بەشی دووەمی کتێبەکە ئەم ناونیشانە لەخۆدەگرێت: (ئێستا ئەو کەسێکی دیکەیە)، دانەر لێرەدا قسە لەسەر ئەو شتە دەکات پێدەڵێت گەنجیەتی شاعیرو پیریەتی جیهان، هەروەها قسە لەسەر پەتای سەردەم دەکات کە توشی زۆربەی هەرە زۆری ئەدیب و شاعیرەکان ببوو، جگە لەوە باس لە پەیوەندی «شاتوبریان» بە شاعیری ئینگلیزی بەناوبانگ لۆرد «بایرۆن» دەکات.

بەشی سێیەمی کتێبەکە ئەم ناونیشانە لەخۆدەگرێت: (نۆبەرەی یاداشتەکان)، مەبەست لە یادەشتەکانی «شاتوبریان»ە. هەرچی بەشی چوارەمی کتێبەکەیە تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر هاوسەردەمە نزیکەکانی «شاتوبریان».

بەکورتییەکەی ئەم کتێبە پڕە لە شتی دەگمەن و هەواڵ و توێژینەوەی بەکەڵک کە وادەکات چێژ لە خوێندنەوەی وەربگیرێت، هەر ئەمەشە وادەکات ئەم کتێبە ببێتە یەکێک لە سەرچاوە سەرەکییەکان لە کتێبخانەی فەرەنسیدا.

لە واقیعدا ئەم کتێبە لەسەر بابەتەکەی وەک باشترین کتێبی ساڵی ٢٠٠٣ هەڵبژێردرا. پرۆفیسۆر «مارک فومارلۆنی» لە دەستپێکی کتێبەکەدا شتێکی ئاوا دەڵێ: ئەوەی لێرەدا دەیڵێم خەڵکی توشی سەرسوڕمانێکی زۆر دەکات، من پێموایە «شاتوبریان» کە لە ساڵی ١٧٦٨ لەدایکبووەو ساڵی ١٨٤٨ کۆچی دوایی کردووە، نەدەبووە نوسەرێکی بەناوبانگ و ناودار وەک ئەوەی ئێستا دەیناسین، گەر ئەو ڕوداوە توندوتیژو ترسناکانە نەبونایە کە لەمیانەی شۆڕشی فەرەنسیدا ڕویاندا. لێرەوە لەوانەیە کارێکی خراپ باشەی لێبکەوێتەوە، مەسەلەکە هەرچۆنێک بێت ئەوە ڕوداوە تراژیدیاکانە پیاو دروست دەکات. «شاتوبریان» لە سوپای پاشایەتیدا ئەفسەر بووە، دەیتوانی تەواوی ژیانی لەژێر سایەی سیستمی پاشایەتیدا بەسەربەرێت، گەر شۆڕشی فەرەنسی ڕوینەدایەو هەموو شتێکی تێکنەدایە. گەر ئەو شۆڕشەو

ڕوداوەکانــی ڕوياننەدايە ئەوا «شــاتوبريان» نەدەبووە نوسەرێکی گەورە.

«شــاتوبريان» لەنێــوان ســاڵانی ١٧٩٣-١٧٩٤ يەکەم کاری کوشــتن و تۆقاندنی بەناوی ئازادييــەوە بينی، پاشــان دەڕوات بۆ لەندەن. لەوێ لە مانای ترس و تۆقاندنی شۆڕشــگێڕانە تێگەيشــت و دەرکــی بــەو ڕەنگدانەوانە کرد کــە لەو تــرس و تۆقاندنە شۆڕشــگێڕانەيەوە دەردەچــن. لەوێ وەک مەنفييــەک وابوو، هيچ پارەوپوولێکــی نەبــوو، نەخۆش بــوو، لەلايەن ليژنــە شۆڕشــگێڕەکانی پاريســەوە فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەرچووبوو. هەر لەوێ ڕۆژ بەڕۆژ کەوتــە گوێگرتن و بەدواداچوونــی هەواڵەکانی شــۆڕش، کوشــتنی «لويسی شــازدەهەم»ی بيست کە سەری لەژێر مەقسەڵەکە لێکرايەوە، هەروەها کوشــتنی «ماری ئەنتوانێت»يشــی بيســت. جگە لــەوە هەواڵــی کوشــتنی برا گەورەکــەی و هاوســەرەکەی و براکانی ديکەی بيست. دروست ئالەوکاتەدا بۆئەوەی ڕووبەڕوی هەموو ئەو کارەســات و نەهامەتيانە ببێتەوە، بڕيــاردەدات بەوپــەڕی ســنگ فراوانييــەوە گوزارشــتيان لێبــکات. بەم شــێوەيە دەبێتە شــاعيرێکی گەورە ياخود دەبێتە نوســەرێکی گــەورە بەبــێ ئــەوەی بەخۆی بزانــێ ياخود بەبێ ئەوەی پێشــتر خەونی بەوەوە بينيبێت. «شــاتوبريان» لە ســاڵی ١٧٩٧ لــە لەندەن کتێبەکــەی: (وتارێکی مێژوويــی، ئەخلاقی، سياسی لەســەر شۆڕشەکان) بڵاوکردەوە. ئەوە يەکەم کتێبی بوو کە گەواهيدەری توانا ئەدەبی و شيعری و فەلسەفييەکەی بوو. ئەو کتێبە لە قووڵايی ناخی خۆيەوە هاتبووە دەرەوە.

دواتــر دانــەر بــەردەوام دەبێــت و دەڵێ: بەڵام ئــەو ترس و تيرۆرەی لە نێوان ســاڵانی ١٧٩٢-١٧٩٤دا ڕويــدا، بە تەنهــا نەبووە هۆی لەناوبردنــی ژمارەيەکــی زۆری مــرۆڤ ياخود سەر لێکردنەوەيان لەژێر مەقسەڵەکەدا، بەڵکو بووە هۆی ئەوەی ســنورێکی بۆ خۆشــباوەڕی ئەخلاقی و مێژوويی ڕۆشــنگەری فەرەنســی دانا. ئاشــکرايە فەيلەســوفانی ڕۆشــنگەری ڕاســتەوخۆ پێش هەڵگيرســاندنی شۆڕشــی فەرەنســی، ڕێگايان بۆ بەرپابونی شۆڕشــەکە خۆشــکردو لەو بڕوايەدابــوون دوای ڕوخاندنی سەردەمی پاشايەتی کۆن، ئەوا عەقڵ و زانست و سيســتم ســەردەکەوێت، ئەو فەيلەسوفانە لــەو بڕوايەدابــوون دوای هەرەســهێنانی فێندەمێنيتاڵيزمــی مەســيحی و دەمارگيری ئاينی، ئيــدی دواڕۆژی مرۆڤايەتی دواڕۆژێکی پرشــنگدار دەبێــت. وەلێ ئەوان پێشــبينی ئەوەيان نەدەکرد قوتابييەکانيان، لە شۆڕشگێڕە فەرەنســييەکان، بەنــاوی عەقڵەوە شــێوازی تيرۆرکردن بەکاربهێنن! لــەو بڕوايەدانەبوون شــۆڕش کە بەناوی ڕۆشنگەرييەوە بەرپابببوو، ببێتە هۆی ڕودانی ئەو هەموو قەســابخانەيە. ئالێرەدا گرفتێکی ترســناک ڕويــدا، ئالێرەدا دوفاقييەک ڕويدا کە چارەسەرکردنی ئەستەمە، ئەوەيش ئەوەيە ئايا دەکرێ عەقڵ ببێتە هۆی ڕودانی کوشــتنی شــێتانەو دەمارگيری؟ ئايا ڕۆشنگەری دژ بەخۆی بووەوەو پێچەوانەی خۆی بووەوە؟. ئەمە ئەو پرسيارە بوو کە «شاتوبريان» لەخۆی دەکرد، بەڵام ئەو تەنها کەســێک نەبوو ئەو پرسيارە بکات.

دواتــر دانــەر باس لــە پەيوەنــدی نێوان «شــاتوبريان»و «جان جاک ڕۆسۆ» دەکات و دەڵێ: شاتوبريان هەر لە سەرەتای گەنجييەوە بەرهەمەکانــی «ڕۆســۆ»ی خوێندوەتەوەو بە مامۆستاو فێرکەری خۆی داناوە. «شاتوبريان» بــە درێژايی ژيانــی بيری لە «ڕۆســۆ»و لە فيکری «ڕۆسۆ»سەبارەت بە ژيان و سياسەت

و پـــەروەردەو ئایـــن کردۆتەوە. لـــەم بارەیەوە «شـــاتوبریان» دەڵێ ئەوە کتێبەکانی ڕۆســـۆ بوون هۆشـــیاری منیـــان پێکهێنـــاو وایانکرد ئەم کەســـەی ئێســـتام لێدەرچێت. لە ڕاستیدا «شـــاتوبریان» لە هەموو کەســـێک زیاتر لە فیکری سەرەکی «ڕۆسۆ» گەیشتووە. «ڕۆسۆ» پێیوابوو ناکۆکییەکی ڕەها هەیە لەنێوان مرۆڤی سروشتی و مرۆڤی کۆمەڵگایەکی گەندەڵی پڕ لە نفاق و دووڕوویی و ساختەکاری، مرۆڤ دوای ئەوەی پێینایـــە ناو ژیانـــی کۆمەڵایەتییەوەو بەدەر لە ویستی خۆی ناچاربوو درۆو بوختان و سازشبکات، ئیدی بەرائەت و ڕاستگۆیی خۆی لەدەستدا.

جگە لەوە «شاتوبریان» لە «ڕۆسۆ»وە فێری مانـــای ژیان و خۆشەویســـتی ژیان بوو، فێری ماناکانی یەکســـانی و دادپەروەری بوو، فێری ئەوە بوو هاوســـۆزبێت لەگەڵ هەموو ئەوانەی ئەشـــکەنجە دەدرێن و ئێـــش و ئازار دەچێژن. هەمو ئەوانەو زیاتریش لە «ڕۆسۆ»وە فێربوو. هەروەها لێیەوە فێری نوســـینی سەرنجڕاکێش و ڕۆمانســـیانەش بـــوو، فێـــری ئەوەبـــوو بە شێوازێکی نایاب بنوســـێت. «شاتوبریان» بۆ دژایەتیکردنی ئەو فەیلەســـوفانەی ڕۆشنگەری کە دژ بە ئاینی مەســـیحی بوون، پشـــتی بە نوســـینەکانی «ڕۆســـۆ» بەســـت. ئێمە ئەمە دەڵێین و دەزانین کە «ڕۆسۆ» مەزنی و قووڵی بۆ سۆزی ئاینی پاک و بێگەرد گەڕاندەوە. گەرچی هەموو فێدەمێنتاڵیستە مەسیحییەکان دژ بە «ڕۆسۆ» بوون و تەنگیان پێ هەڵچنیبوو.

«ڕۆسۆ» پێغەمبەری دیموکراتی سروشتی بوو، لەدژی هەموو ئەو پێشـــکەوتنە مادییانە ڕاوەســـتا کە لەگـــەڵ خۆیدا پێشـــکەوتنێکی ڕۆحـــی یاخود ئەخلاقی نەدەهێنا. دروســـت ئا لـــەم خاڵەدا گەر بێت و لەگەڵ فەیلەســـوفانی دیکەی ڕۆشـــنگەری لە نمونـــەی «ڤۆڵتێر»و «دیدرۆ»و بەشـــێوەیەکی گشتی فەیلەسوفانی ئێنسـایکلۆپیدیادا بەراوردی بکەین، نەمری و فەردانیەتی ئەو دەردەکەوێت. «ڕۆســـۆ» پێش ئـــەوەی لادانەکانـــی تازەگەری و ڕۆشـــنگەری ڕوبدەن، ئەو بە ماوەیەکی زۆر درێژ پێشبینی ڕودانی ئەو لادانانەی کردبوو. ئەو پێش ئەوەی تازەگەری دروســـتببێت و پێـــش ئەوەی ببێتە سیســـتەمێکی سیاســـی و فیکری سەرکەوتوو، ڕەخنەی لێ گرتبوو. بە کورتییەکەی «ڕۆسۆ» ئەوەی زۆر زۆر دوور بوو بینی.

«شـــاتوبریان» لەو باوەڕەدابوو «ڕۆســـۆ» هیچ بەرپرســـیار نییـــە لەو ماوە پـــڕ ترس و تیرۆرەی کە شۆڕشـــی فەرەنسی تێیکەوت کە بەشێوەیەک لە شێوەکان شۆڕشی فەرەنسی لە فیکری ئەوەوە لەدایک بوو. چونکە «ڕۆســـۆ» کەسێکی ناسک و میهرەبانە و ناکرێ لە فیکری ئەوەوە حەزی کوشتن و سەربڕین بێتەبەرهەم. ئاشکرایە فەیلەســـوفانی ڕۆشنگەری خەونیان بە ڕوخاندنـــی جیهانی کۆن و دروســـتکردنی جیهانێکی نوێ لەســـەر داروپـــەردوی جیهانە کۆنەکە دەبینی. بەپێی بیروڕای «شاتوبریان» ئەو خەونەی فەیلەسوفان کە هەموو عەقیدەکانی تێکشکاند، ئەو خەونە بووە هۆکاری هاتنەئارای تیـــرۆرو توندوتیژی شۆڕشـــگێڕانە. بەداخەوە «جان جاک ڕۆسۆ» لە بەدیهێنانی ئەم خەونە بەدوور نییە. لەبەر ئەم هۆیەیە «شاتوبریان» دەستبەرداری «ڕۆسۆ»ی بیرمەند دەبێت، وەلێ تەنها پەیوەندی خۆی لەگەڵ «ڕۆسۆ»ی ئەدیب یان شاعیر هێشـــتەوە. «شاتوبریان» پێیوایە «ڕۆسۆ» لە سەدەی هەژدەهەمدا زمانێکی تازەی داهێنا، زمانێک پێشتر بوونی نەبووە، زمانێک ڕۆدەچێتـــە ناو ناخی دڵەوەو مرۆڤ لە قووڵایی کەینونەیدا هەژانێکی توند دەیهەژێنێت.

ڕەنگە هیچ کەسێک وەک «هۆڵدەرلین» ڕۆسۆی خۆشنەویستبێت و لەوانەیە هیچ کەسێکیش وەک ئەو لە ڕۆسۆ نەگەیشتبێت، بەڵام لەژێر ئەم ناونیشانە شیعرییە جوانەدا: (گەنجیەتی شاعیرو پیریەتی جیهان)، پرۆفیسۆر «مارک فۆمارولی» دەڵێ: (پێش میلفیل و ڕامبۆو کۆنراد، شاتوبریان لە کتێبی (یاداشتەکانی ئەودیوی گۆڕ) ڕۆژانی گەنجیەتی گەڕاندوەتەوە. لە واقیعدا بەهاری ژیانی مرۆڤایەتی و وەرزەکانی خۆشەویستی، هەموو کاتێ شاعیری خۆیان هەبووە). دواتر دانەری ئەم کتێبە بەشێکی نایاب بۆ بابەتی (پەتای سەردەم) دادەنێت، هەموو سەردەمێک کێشەی خۆی یان نەخۆشی خۆی یاخود پەتای خۆی هەیە. دانەر لە پەرەگرافێکدا بە ناونیشانی (لەناو دڵی تاریکییەوە) دەڵێ: (لە فەرەنسای سەدەی هەژدەهەمدا ململانێی نێوان کۆن و تازە تەقییەوە، ئەم ململانێیە لە سەدەی حەڤدەهەمەوە مابووەوە. جەنگی نێوان کاهینە مەسیحییەکان و فەیلەسوفان دەستیپێکرد، لەو جەنگەدا هەموو جۆرە چەکێکی سوک و قورس بەکارهێنرا. فەیلەسوفەکان کاهینەکانیان بە دەمارگیرو فێندەمێنتاڵیستی چەق بەستوی تاریکبین تۆمەتبار دەکرد، لەبەرامبەردا کاهینەکان فەیلەسوفەکانیان بە بێئیمان و کافرو خاوەن مەیلی ماددی تۆمەتبار دەکرد) تەنها «جان جاک رۆسۆ» دژی هەردوو بەرەکەبوو، ئەمەش دوای ئەوەی ڕێگای سێیەمی گرتەبەر، ڕێگایەک لە توانایدا هەبوو نێوان ئیمان و عەقڵ یاخود نێوان دڵ و عەقڵ ئاشتبکاتەوە. لەبەر ئەمەیە «شاتوبریان» سەرسامبوو پێی، گەرچی دواتر لەلایەنی فیکرییەوە لێی دووردەکەوێتەوە. لە ڕاستیدا ئەوە «ڕۆسۆ» بوو توانی پێشبینی ئەو ڕوداوانە بکات کە دواتر ڕودەدەن. «ڕۆسۆ» دەیزانی لە ماوەیەکی نزیکدا شۆڕش لە فەرەنسادا بەرپادەبێت، پێش ڕودانی شۆڕش بە نزیکەی بیست ساڵ لەسەر ئەو بابەتەی نوسیوە. «ڕۆسۆ» خاوەنی هەستێکی مەزن بوو، ڕادارێکی ناوەکی هەبوو وایلێدەکرد ئەو شتانە ببینێت کە بەچاوی ئاسایی نابینرێن، ئەمەش خەسڵەتی بیرمەندە گەورەکانە لە مێژودا.

لەبەر ئەمەیە «شاتوبریان» لە کتێبی یەکەمیدا دەربارەی شۆڕشەکان ستایشێکی زۆری «ڕۆسۆ» دەکات و بە «هیراقلیس» یاخود بە «ئەفلاتون»ی تازەگەرانی دادەنێت. «ڕۆسۆ» جگە لە بلیمەتییە فکرییەکەی مەوهیبەیەکی لەڕادەبەدەری لە نوسین و لە شێوازی نوسیندا هەبوو، شێوازێک هەرچییەک بکەیت و بکۆشیت ناتوانیت خۆت لە کاریگەرییەکەی ڕزگاربکەیت. لێرەوە چونکە «شاتوبریان» دەیویست ببێتە نوسەر تاکو گوزارشت لە نەهامەتی و لە ئازارەکانی بکات، ئەوا هیچ هاوڕێیەکی لە «جان جاک ڕۆسۆ» باشتر دەستنەدەکەوت. لەبەر ئەم هۆیە «شاتوبریان» لە کتێبەکەی دەربارەی شۆڕشەکان خێرا خێراو بێ پچڕان ئاماژە بۆ «ڕۆسۆ» دەکات. «شاتوبریان» کاتێ ئەو کتێبەی نوسی تەمەنی تەنها ٣٠ ساڵ بوو.

«شاتوبریان» هەموو کتێبەکانی «ڕۆسۆ»ی وشە بە وشە یاخود لە بەرگەوە بۆ بەرگ دەزانی، ئەو گەرچی دواتر دەستبەرداری «ڕۆسۆ» دەبێت وەک بیرمەندێکی سیاسی، بەڵام وەک ئەدیب و وەک هونەرمەند بەوەفابووە بۆی.

دواتر دانەر بەردەوام دەبێت و دەڵێ: گەرچی «نیچە» لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا هەژانێکی گەورەی خستەوە، بەڵام ناکرێت بەراوردی بکرێت لەگەڵ ئەو هەژانەی

که «ڕۆســـۆ» پێش ســـەدەیەک لـــەو مێژووەوە خســـتییەوە، چونکە فیکری «نیتچە» تەنها گەشتە نوخبەی جیهان، وەلێ فیکری «ڕۆسۆ» گەشتە قوولایی ناخی میللەت.

بەڵام ئاخۆ «شاتوبریان» کەی بۆ یەکەمجار کتێبەکانی «ڕۆســـۆ»ی خوێندەوە؟ سەبارەت بە وەڵامـــی ئەم پرســـیارە دانـــەری کتێبەکە ئاوا دەڵێ: لەنێوان ســـالانی ١٧٨٤-١٧٨٥ کاتێ تەمەنی ١٦ ســـاڵ بووەو دوای مردنی «ڕۆسۆ» بە شەش ساڵ. ئاشکرایە کتێبی دانپیانانەکانی «ڕۆســـۆ» کە دوای مردنی و لە نێوان سالانی ١٧٨١-١٧٨٩ بڵاوبـــووەوە، وەک ئینجیل وابووە بۆ نەوەی «شاتوبریان». ئەو نەوەیە هەمویان بە هەڵپەو بە پەرۆشییەکی زۆرەوە ئەو کتێبەیان خوێندووەتەوە، ئەو کتێبە شـــاکارێکی نایابی ئـــەو ماوەیەی ئەدەبی فەرەنســـی بوو. دەکرێ بڵێین کاتێ «شاتوبریان» یاداشتەکانی خۆی بەناونیشـــانی (یاداشـــتەکانی ئەودیوی گۆڕ) نوسی، لاسایی «ڕۆسۆ»ی کردووەتەوە. کتێبی (یاداشـــتەکانی ئەودیوی گۆڕ) بەناوبانگترین کتێبی «شـــاتوبریان»ەو لە هەندێجاردا هیچی لـــە کتێبـــی دانپیانانەکانی «ڕۆســـۆ» کەمتر نییە.

دواجـــار دانـــەری ئـــەم کتێبـــە «مـــارک فۆمارولی» دەڵێ: ئەم کتێبەی من بریتی نییە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ژیانی «شاتوبریان»، پێش مـــن خەڵکانێکـــی دیکە بەشـــێوەیەکی نایاب بەسەرهاتی «شاتوبریان» یان نوسیوە، ئەمەی مـــن بریتییە لە شـــیکردنەوەی کتێبە بەناوبانگەکەی (یاداشتەکانی ئەودیوی گۆڕ)و ئـــەو بارودۆخـــە مێژووییەی تێـــدا ژیاوەو ئەو بارودۆخەی کتێبەکەی تێدا نوسیوە.

لە ڕاستیدا «شـــاتوبریان» لە تەمەنی ٣٤ ســـاڵیدا ناووناوبانگـــی دەرکرد، ئـــەوەش ئەو کاتە بوو کە ساڵی ١٨٠٢ کتێبی (عەبقەریەتی مەسیحی) نوسی، ئەم کتێبە «شاتوبریان»ی گەیاندە پلەی نەمری، وەک چۆن لە ســـەدەی ڕابردودا «ڤۆڵتێر» لە ڕێگەی نوســـینی کتێبی (ســـەدەی لویســـی چواردەهەم)و «ڕۆســـۆ» لە ڕێگەی کتێبی (وتارێک دەربارەی زانســـت و هونـــەرو هیلۆیـــزی نوێ) گەشـــتبونە پلەی نەمری.

«شـــاتوبریان» دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسا «ناپلیۆن» لە هەرەتی سەرکەوتن و نەمریەکەیدا بناسێت و سەرەتا زۆر لێی نزیکبوەوە، کەچی دواتـــر «ناپلیۆن» لێـــی تورەدەبێت و دووری دەخاتەوە. کاتێ دەســـەڵات لە «شـــاتوبریان» تورەدەبێـــت، ئیدی ئەویـــش دەڕواتە ناوچەی (شاتری مالبری) دەرەوەی پاریس و دەڕوات بۆ ناوچەیەکی جوان و دڵڕفێنی وەک ناوچەی (دۆڵی گورگەکان)و لەوێ بە تەنهـــا دەژی. بەڵام ئەم تورەبونەی دەسەڵات لە «شاتوبریان» هەمووی خـــراپ نەبوو، چونکـــە ئـــەو دوورکەوتنەوەیە دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخساند زۆر بنوسێت.

تاکو ئێستاش خانووەکەی لەوێ دەرگای بە ڕووی میوانەکانـــدا کراوەتەوە، ئەمە دوای ئەوە دێت کە خانوەکەی لەوێ بووەتە مۆزەخانە.

ئەم کتێبە لە بڵاوکراوەکانی (فالوا- پاریس ٢٠٠٣).

**سەرچاوە:**

ماڵپەڕی ئیمپراتۆر،

WWW.ALIMBARATUR.COM

٢٠٠٩/١/٣

# ڕەهەندەکانی ڕیفۆرمی ئایینی لە ئەوروپا

سەردەم




بزوتنەوەی چاکسازی ئایینی لە ئەوروپا، بە یەکێک لە قۆناغە ناوازەو گرنگەکانی ئەو کیشوەرە ئەژمار دەکرێت. گرنگی ئەم قۆناغە بەڕادەیەکە، کە کلیلی تازە بوونەوەی خۆرئاوایە و سەرەتایی کۆتایی مێژوی دورودرێژی سەدەکانی ناوەڕاستیشە.

بۆ تێگەیشتن لە مێژوی هاوچەرخی ئەوروپا، دەبێت سەرەتا بە بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئایینی دەست پێ بکەین، چونکە ئەم بزوتنەوەیە بوو بە بەردی بناغەی مۆدێرنەی ئەوروپی و بوو بە دەسپێکی قۆناغێکی نوێ لە مێژوی هاوچەرخی ئەوروپیدا.

ئـــەم بزوتنەوەیـــە ئەگەرچی لە ســـەرەتای دەسپێکردنیدا، هەراو زەنایەکی گەورەی نایەوەو بە گران لەســـەر خەڵکی ئەو کیشوەرە کەوت، بەڵام دواتـــر دەرەنجام و ئاکامی گەلێک گرنگی لێکەوتـــەوە، کە تا ئێســـتاش کاریگەریەکانی بەردەوامن.

ئەم بزوتنەوەیە لە سەدەی شازدەداو لە ئەوجی ستەمکاری و گەندەڵبونی کڵێسای کاتۆلیکیدا بە دەرکەوت، ڕێبەرانیشی بریتیبوون لە "مارتن لۆتـــەر" و "جـــۆن کاڵڤن" و "ئیراســـموس". بە گژاچونەوەی دەسەڵاتی کڵێساش لەو قۆناغەدا کارێکی هەراو ئاسان نەبوو، بۆیە لە سەرەتاوە "لۆتـــەر" و هەوادارانی بۆ چاکســـازی ئاییدنی، ڕووبەڕوی فشـــارێکی گەورەی پیاوانی ئاییدنی و زۆربـــەی زۆری دەســـەڵاتداران و کۆمەڵگـــە بوونەوە. تا ئێستاش مێژونوسان باس لە دزێوی و نا مرۆڤایەتی ئەو ڕەفتارو تاوانانە دەکەن کە لەو کیشـــوەرەدا دژ بە پرۆتستانت مەزهەبەکان کراون.

لە زۆر زمانـــی زیندوی جیهاندا بە کتێب و وتارو لێکۆڵینەوە، ئەم قۆناغە گرنگەی مێژووی مرۆڤایەتی بەســـەر کراوەتەوەو زۆری لەســـەر نوســـراوە، بەڵام ئەوە بـــۆ یەکەمجارە بە زمانی کـــوردی و بەو شـــێوە ئەکادیمی و هەمەلایەنە، ئـــاوڕ لەم بابەتە زیندووە بدرێتەوە. ئەم کتێبە قەوارەکەی 179 لاپەڕەیەو نوسەرەکەی پشتی بە ژمارەیەکی بێشومار سەرچاوە بەستووە.

جگە لە پێشەکیەکی تێرو تەسەل، لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە:

-بەشـــی یەکەمیان، باس لـــە هەلومەرجی ئەوروپا دەکات بەر لە سەرهەڵدانی بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئاییدنی.

-دووەم بـــەش، تایبەتە بە ســـەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئاییدنی.

-بەشی سێیەمیش، باس لە ڕیفۆری ئاییدنی و ئەنجامەکانی دەکات، لەسەر ژیانی ئابوری و سیاسی و کۆمەلایەتی.

# ماکیاڤیلی، سێبەری شەیتان لەسەر زەوی

لە عەرەبییەوە:
هەورامان وریا قانیع




ناوی کتێب: ماکیاڤیلی سێبەری شەیتان لەسەر زەوی
نوسینی: مەجدی کامل و ئەحمەد نائیف
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای کتێبی عەرەبی، حەڵەب ۲۰۰۸
ژمارەی لاپەڕە: ۲۰٦ لاپەڕەی گەورە

نوسەری کتێبەکە باس لە ژیانی ماکیاڤیلی دەکات کە لە ۳ ئایاری ساڵی ١٤٩٦ لە شاری فلۆرەنسا کە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئیتالیاوە لەدایکبووە. ماکیاڤیلی ناوی «نیقۆلا دی بێرناردۆ ماکیاڤیلی»یە، ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ خێزانێکی خانەدانی (توسکانی)، ئەندامانی خێزانەکەیان بۆ چەندین دەیەی

دوورودرێژ پلەوپایەی بەرزیان وەرگرتووە، بەو هۆیەوە کەوتونەتە ناو گێژاوی ژیانی سیاسی فلۆرەنسا، تەنانەت خێزانی باپیرە گەورەکەی لە ساڵی ١٢٦٠ لە شارەکەی خۆیان دەرکراون. پێش ئەوەی ماکیاڤیلی لەدایک ببێت، بارودۆخی دارایی خێزانەکەیان خراپ بووە، ئەمەش هەندێ کاریگەری لەسەر هەڵسوکەوتی ماکیاڤیلی هەبووە.

دانەری کتێبەکە «مجدی کامل»پێیوایە «ماکیاڤیلی» لە ئامێزی سیاسەت و ڕۆشنبیریدا گەورە بووە، چونکە باوکی پارێزەرێکی بەناوبانگ و دایکی شیعردۆست بووە. «ماکیاڤیلی» بە گوێرەی ئەو سەردەمەی تێیدا ژیاوە خوێندنێکی باشی خوێندووە، یاساو مێژووی خوێندووە. لە تەمەنی حەوت ساڵیدا دەستی کردووە بە فێربونی زمانی لاتینی کە لەو سەردەمەدا زمانی زانست و ڕۆشنبیری بووە. لە سەرەتای گەنجیدا مەیلی بەلای ئەوەدا ڕۆشتووە هەردوو ڕۆشنبیری کۆن و تازە بخوێنێتەوە، لێرەوە وتارەکانی وتاربێژو نوسەری ڕۆمانی ناسراو «شیشرۆن»ی خوێندوەتەوە. بەرهەمەکانی «ئەرستۆ»ی بەسەرکردووەتەوە. بە بایەخەوە کتێبەکانی هەردوو پێشەنگانی ڕێنیسانس «دانتی»و «بترارک»ی خوێندوەتەوە. وەلێ بەلای دانەری کتێبەکەوە قوتابخانەی سەرەکی «ماکیاڤیلی» شەقامەکانی شاری فلۆرەنسا بوون، ئەو شەقامانەی گەورەترین بلیمەتەکانی ڕێنیسانسی لە نمونەی «دانتی»و «لیۆناردۆ دافنشی»و «مایکل ئەنجلۆ»و ئەوانی دیکەی، بەخشییە جیهان. لەو سەردەمەدا شاری فلۆرەنسا بە چالاکییە سیاسییە فراوانەکانی کە تایبەت بوون بە نوخبە، لە شارەکانی دیکەی ئیتالیا جیاوازتر بوو. بەپێی قسەی دانەری کتێبەکە بێت «ماکیاڤیلی» دوو چاوی بریقەداری هەبووە، لێیانەوە بە شێوەیەکی ورد شتەکانی دەبینی. باڵایەکی مامناوەندی هەبووە، دوو لێوی وردو ناسکی هەبووە کە زەردەخەنەیەکیان خستۆتەڕوو، زەردەخەنەیەک ئەوەی دەرخستووە کە لە قووڵایی ناخی «ماکیاڤیلی»دا ڕوویدەدا. سەرچاوەکان کاتێ بەو شێوەیە باس لە»ماکیاڤیلی» دەکەن، ئەوا پشتئەستورن بەو نوسینانەی کە هاودەمەکانی لەسەریان نوسیوە، هەروەها پشتئەستورن بەو تابلۆیانەی کە هەندێ لە وێنەکێشەکانی سەردەمی ڕێنیسانس وێنەی «ماکیاڤیلی»یان کێشاوە. جگە لەوە «ماکیاڤیلی» بەوە ناسراوە کە بەخێرایی تێبینی شتەکانی کردووەو کاریگەری لەسەر گوێگرانی هەبووە، هەروەها توانایەکی باشی هەبووە بۆ قسەکردنی جدیی و گاڵتەئامێز لەسەر هەموو ئاستە جیاوازەکان، هەر لە داربڕی گوندەکەیانەوە بۆ شازادەکانی ئیتالیاو لەوانیشەوە بۆ پاشاکانی ئەوروپا. «ماکیاڤیلی» لە هەموو حاڵەتەکاندا هەوڵیداوە کەسێکی خۆشەویست بێت و لە دڵی خەڵکانی دیکەوە نزیک بێت.

دانەری کتێبەکە «مەجدی کامل» لە وەسفکردنیدا بۆ «ماکیاڤیلی» دەڵێ «ماکیاڤیلی» کەسێکی خۆشەویست بووەو تابڵێی دڵسۆزو بەوەفا بووە بۆ هاوڕێکانی، لە ژیانیدا دوور بووە لە دڵڕەقی، هیچ یەکێک لە بلیمەتەکانی سەردەمەکەی لە مەسەلەی (سەراحەت)دا شانیان لە شانی نەداوە. لەپاڵ ئەوەشدا کەسێکی گومانکەرو دودڵ بووە، ئەمە جگە لەوەی یەکێک بووە لەوانەی ڕاوی ئافرەتی کردووەو عاشقی شتی جوان بووە، وەلێ ئەو هەرگیز ڕێگەی بەوەنەداوە بەهاکان لەدەستبدات و هەرگیز کارێکی واینەکردووە ژیانە خێزانییەکەی تێکبچێت. دانەری

کتێبەکـــە پێیوایـــە گەرچـــی «ماکیاڤیلی» خاوەنی توانایەکـــی باش و فیکرێکی تیژ بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشـــدا بە زوویی لە حوکمەت و لە ناوەندی سیاســـی فلۆرەنســـادا شـــوێنی شـــیاوی خۆی بەدەستنەهێنا، هۆکاری ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتـــەوە «ماکیاڤیلی» ئامرازێک یاخود وەســـیتێکی دەستنەکەوتووە کە وابکات بیگەیەنێتە ســـەر شـــانۆی ڕوداوەکان، کاتێک گەشتە بەردەرگای ئەو شانۆیە، تەمەنی ببووە ٢٩ ســـاڵ و خەڵکانی دیکە پێش ئەو شـــوێنە هەستیارەکانیان گرتبوو.

دانـــەر لەم کتێبەیدا ئامـــاژە بە وەزیفەکەی «ماکیاڤیلی» دەکات کە یەکێک بووە لەوانەی سیاســـەت و پلانەکانی کۆماریان داڕشـــتووەو نزیکەی ١٥ ساڵێک لەو وەزیفەیەیدا ماوەتەوە، لـــەو ماوەیەدا ٢٤ ســـەردانی دیبلۆماســـیانەی ئەنجامـــداوە، ئەمـــەش دەرفەتـــی ئـــەوەی بۆ ڕەخساندووە ڕاستەوخۆ کەسایەتییە گرنگەکانی ئیتالیـــاو ئەوروپـــای ئـــەو ڕۆژگارە ببینێت، لەوانە پاپاو پاشـــای فەرەنســـاو ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریەتـــی ڕۆمانی پیرۆز. «ماکیاڤیلی» لـــەو گـــەڕان و ســـەردانانەیدا شـــارەزاییەکی فراوانی بەدەســـتهێناوەو لە نزیکەوە ئاگاداری پەیوەندییە نهێنی و ژێربەژێرە نێودەوڵەتیەکان و شێوازی حوکمی ئەوروپی بووە. ئەو هەر خۆی بەتەنها چوار جار سەردانی کۆشکی پاشایەتی فەرەنسای کردووەو ئەو ســـەردانانەی چەندین مانگی خایاندووە، لەوێ شـــارەزای دابونەریتی فەرەنسییەکان و پیلانەکانی کۆشکی پاشایەتی و ئـــەو فاکتەرانەی بونەتە هـــۆی بەهێزکردنی حکومەتەکەیان بووە. لێرەوە ئەو شارەزابونەی لەگەڵ ئەزمونەکانی دیکەیدا بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لە کتێبەکانیدا ڕەنگدەدەنەوە، ئەمەش دوای ئەوەدێت «ماکیاڤیلی» هەســـتیکرد لەم جیهانـــەدا شـــتێک هەیە شـــایەنی تێڕامان و لێوردبونەوەیە.

هەروەها دانەر باس لە میتۆدی فەلســـەفی «ماکیاڤیلـــی» دەکات کە بەوە جیادەکرێتەوە گرنگییەکـــی لەڕادەبـــەدەری بە مێـــژوو داوەو بۆ ســـەلماندنی ڕاســـتی بیروڕاکانی، بەردەوام ڕووداوە مێژووییەکانـــی بەنمونـــە هێناوەتەوە. لێرەوە ئەو بە یەکێک لە دامەزرێنەرانی شێوازی شـــیکردنەوەی مێژوویـــی مۆدرێـــن دادەنرێت. چەندیـــن فاکتەر لە پشـــت ئـــەوەوە بووە کە «ماکیاڤیلـــی» بەو شـــێوەیە گرنگی بدات بە مێـــژوو هەروەهـــا کاریگەری لەســـەر فیکری هەبێت، لەوانە لاوازی دەوڵەتی ئەو ســـەردەمەو زۆری کێشە سیاسییەکان.

«مەجـــدی کامل» پێوایە ئەو تەســـەورەی «ماکیاڤیلی» بۆ سروشتی تاکی مرۆڤ هەیبووە، بەســـەر سروشـــتی تایبەتـــی هەڵســـوکەوتی دەوڵەتان بـــۆ مامەڵەکردنیان لەگەڵ چوارچێوە دەرەکییەکەیانـــدا پراکتیـــک دەکرێت. چونکە هەردوکیان مەیلیان بەلای بەدەستهێنانی هێزو دەســـتدرێژیکردنە سەر دەوڵەتانی دیکە هەیە، ئەوەشـــی بارودۆخەکەی خراپتر کردووە ئەوەیە لەسەر ئاســـتی جیهان هیچ حکومەتێک نییە نێوان دەوڵەتەکان لێکتر جیابکاتەوە.

دانـــەر لـــە نێـــوان کـــۆی بەرهەمەکانـــی «ماکیاڤیلی» کە ژمارەیان ٤٠ بەرهەمە، قســـە لەســـەر ســـێ گرنگترین بەرهەمـــی دەکات کە ئەمانەن: (ئەمیـــر)، (گفتوگۆکان)، (هونەری جەنگ). دانەر لە میانەی ئەو سێ کتێبەوە باس لە بیروڕا سیاسییەکانی «ماکیاڤیلی» دەکات و ئاماژ بەوە دەدات کە «ماکیاڤیلی» لە سەرەتادا ڕژێمی کۆمـــاری وەک گونجاوترین ڕژێمێک بۆ حوکمکردن داناوە. وەلـــێ «ماکیاڤیلی» دوای ئـــەوەی بارودۆخی ئـــەو ســـەردەمەی ئیتالیا

شرۆڤە دەكات، ئیتالیا لەسەردەمی ئەودا بۆ پێنج دەوڵەت دابەشببوو، پەیوەندی نێوان ئەم دەوڵەتانە پڕ ناكۆكی بووەو هەمیشە ئەگەری جەنگكردن لەگەڵ یەكدا لەئارادابووە، ئەمەش وایكردووە سەرتاپای نیشتیمان ئامانجێكی ئاسان بێت لەبەردەم داگیركاری بیانیدا. لێرەوە «ماكیاڤیلی» لە كتێبی میردا دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی باشترین ڕژێم لە توانایدابێت یەكێتی ئیتالیا بەدەستبێنێت ئەو ڕژێمەیە كە دەسەڵاتێكی مەركەزی دیكتاتۆریانەی ڕەهاو بەهێزی هەیە، دەسەڵاتێك هیچ پێودانگێكی ئاینی و دنیایی و ئەخلاقی نەتوانێت لەبەردەمیدا بوەستێت.

دانەر لەم خاڵەوە باس لە پەیوەندی نێوان سیاسەت و ئەخلاق لەلای «ماكیاڤیلی» دەكات، بەو پێودانگەی ئەوە یەكێكە لە كێشە هەرە ئاڵۆزەكان كە كتێبی ئەمیر دەیوروژێنێت، كتێبی ئەمیر بۆ هەموو ئەو كەسانەی لە كۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا بانگەوازی دادپەروەری و یەكسانی دەكەن، وەك شۆكێك وابوو. چونكە لەم كتێبەدا بە بیانوی واقیعیەت و پاراستنی بەرژەوەندی گشتی و جێگیركردنی حوكم، كۆمەڵێ تێكست و ڕێنمایی و ئامۆژگاری بۆ ئەمیر تێدایە كە دەبنە دەستورێك بۆ ستەم و چەوساندنەوە. ئەوەی وایكرد «ماكیاڤیلی» ئەم كتێبەی بەو شێوەیە بنوسێت، ئەو ڕق و بێزارییە زۆرەی بوو كە لە حوكمی كڵێساو پیاوانی ئاینی سەردەمەكەی هەیبوو. لێرەوە ئەو دەیویست بە تەواوی نێوان ئاین و سیاسەت جیابكاتەوە، بگرە ئەم جیاكردنەوەیە پەلی هاویشت بۆ ئەوەی نێوان سیاسەت و ئەخلاقیش لەیەكتر جیابكاتەوە.

دانەری كتێبەكە لەلایەكی دیكەوە ئاماژە بە بەناوبانگترین كارەكانی «ماكیاڤیلی» دەكات كە زیاد لە ٣٠ كتێبەو گرنگترینیان كتێبی (وتارەكان دەربارەی دە كتێبی لیتۆس لیفیوس) كە دواتر بە ناوی (گفتوگۆكان) ناونرا، جگە لەوە كتێبی (هونەری جەنگ)و كتێبی (ئەمیر)، ئەمەی دواییان دوای پێنج ساڵ بڵاوبووەوە، بۆیە هەندێ كەس لێی تێنەگەشتن و هێرشیان كردەسەر، تاوایلێهات ناوهێنانی ئەو كتێبە لەگەڵ ناوهێنانی خراپەكاریدا بێت، تەنانەت لە هونەری میلیشدا.

**سەرچاوە:**

مسارات البيان- ٢٠٠٨/١١/١

# چلەمین فێستڤاڵی نێو نەتەوەیی شیعری لە شاری ڕۆتردامی هۆڵەندە

سەردار فەتاح ئەمین



زۆرن ئەوانەی بە لایانەوە وایە، کە ڕۆڵی ئەدەب و شیعر بەسەرچوو بێت، گوایە ئیتر خوێنەرانی شیعر چوونەتە قاتی و دیوانە شیعرییەکانی شاعیران تۆزیان لەسەر نیشتووە، بەڵام ئەو فیستڤاڵ و کۆڕە شیعریانەی لە لەندەن و و پاریس و نیویۆرک و واشنتۆن و بەرلین و ئەمستردام و توکیۆ و پەکین زۆربەی شار و وڵاتانی دنیا ساز دەکرێن و ئەو جەماوەرە بێشومارەی بە عەشقەوە ئامادەی دەبن، دەیسەلمێنن ئەو بۆچوونانەی دەیانەوێ لە ڕۆڵی

شــیعر کەم بکەنەوە، ڕاستی تێدا نییە، هەموو ســاڵێک بووە بە نەریت لە شــاری ڕۆتردامی هۆڵەندە فیســتڤاڵی نێونەتەوەیی شیعری لە هۆڵی (ڕۆتردام سخاوبیورخ) سازدەکرێت.

ئەمســاڵ لە نێوان ڕۆژانی ٦/١٣ بۆ ٦/١٩/ ٢٠٠٩ چلەمین فێستڤاڵی نێونەتەوەیی شیعری ســازکرا و ٢٤ شــاعیری لە چەند وڵاتێکەوە لە خۆگرتبــوو، کــە بریتی بوون لەم شــاعیرانە (مەورید بەرخوتی لە فەلەســتین، داو بەی لە چین، لوکە داڤیس لە ئوســتورالیا، مورا دوڵی لە بەریتانیا، ئاریان دۆنکەر، ڕوتخەر کۆپلاند، ئێڵ فەی ڕوســن، خێرت کاوڤنار و ناخۆم ڤاین بێرخ لە هۆڵەندە، ئۆمبۆرتۆ فێۆری لە ئیتالیا، تووا فرۆســتۆرن لە فینلەنــدە، یانگ لین لە نیوزلەندە، دونیا میخایل لــە عیراق، فالزاینا مۆرت لە ڕوســیا، خێرت فوک نیڵ لە خوارووی ئەفریقــا، هنریک نۆرد براندت لــە دانیمارک، سیگیستاس پاروسکیس لە لیتوانیا، یاقۆسۆس ڕاوباود لە فەرەنسا، کازۆکۆ شیراشی لە ژاپۆن، پیوتەر ســۆمەر لە پۆڵۆنیا، ماتیۆ سیوینی لە ئێرلاندا، خیورخی سزیرتس لە هەنگاریا و براین تۆرنەر لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

شایانی باسە تەنها هۆڵەندە لەم فێستیڤاڵەدا بە پێنج شاعیر و وڵاتەکانی دیکە بە یەک شاعیر لە ڕۆژە جیاجیاکاندا بەشداریان کردبوو.

لــەم ڕاپۆرتەماندا تەنها بە کورتی دەربارەی ڕۆژی ٢٠٠٩/٦/١٧ دەدوێیــن، ئێوارەکە لەلایەن (خێرت بەولینــس) بەڕێوە دەبرا و باســێکی شــاعیرەکان و ئەدەبی جەنگــی کرد، هەروەها مۆســیقار(جۆزیف فان ڤیسەیم) بە ئامێرێکی سەرســوڕهێنەر (LUITSPELER) بــە چەند پارچە مۆسیقایەک بەشداری ئێوارەکەی کرد.

ســەرتاپای ئێوارەکە تایبەت بوو بە شیعر و ئەدەبــی جەنگ، یان لەو شــاعیرانە دەدوا، کــە دەربــارەی جەنگیــان نوســیووە، خاتو دونیا میخایل، کە شــاعیرێکی عێراقیەساڵی ١٩٦٥ لــە بەغدا لەدایک بــووەو کۆلێجی ئاداب بەشــی ئینگلیزی تەواو کردووە، لە سەرەتای هەشــتاکانەوە دەســتی بە نوســینی شــیعر کــردووە، وەک خۆی ووتی، نەوەی ئەمانیان بە شــاعیرانی جەنگ ناوزەد کــردووە، هەرچەندە زۆربــەی بەرهەمەکانــی لە ســەردەمی ١٩٨٠-١٩٨٨ی هەشــت ساڵەی جەنگی نێوان عێراق و ئێراندا نوســیووە، ئەو کاتە پانتایی ئازادی لە عێراقدا زۆر بەرتەســک بووە، سانسۆری ڕژێم لەسەر بەرهەمی خۆی و هاوڕێکانی بووە، بۆیە ناچاربــوون دەقە ئەدەبیەکانیان بە میتافۆر و ڕەمزو ئەفسانە دەوڵەمەند بکەن و لە ئاسانووسی دوور بکەونەوە.. لەم فیستڤاڵەدا دونیا میخایل چەند پارچە شــیعرێکی خوێندەوە، ناوەڕۆکی شــیعرەکانی هەمووی لە جەنگ و ماڵوێرانی و قوربانیەکانی شەڕ دەدوا.

دونیــا لە ســاڵی ١٩٩٦ەوە ئــاوارەی وڵاتە یەکگرتووەکانــی ئەمەریــکا بــووە. ئەمــەش نمونەیەکە لە شیعرەکانی:

چەند بەهەڵمەت و چالاکە شەڕ<br>
چەند کارایە<br>
شەڕ<br>
هەر لەگەڵ سپێدەدا شوتی ئاگادارکردنەوەکان<br>
بەئاگا دێنێ<br>
ئوتۆمبێلەکانی فریاکەوتن<br>
بە هەموو لایەکدا<br>
لاشە دەبا بە ئاسمانا و..<br>
نەقالە بەرەو لای بریندارān پاڵدەنێ<br>
بارانی فرمێسک لە چاوی دایکان<br>
دەبارێنێ..

زەوی هەڵدەدرێ و زۆر شت دەردێنێ
لە ژێر داروپەردوی کەلاوەکاندا
شتی بێگیانی بریقەدار و
شتی ڕەنگ لەبەربڕاوی ڕووح تیاماو
پرسیاری زیاتری بۆ منداڵان دەوروژێنێ
خواکان سەرگەرم دەکات بە هاویشتنی موشەک و
فیشەکە شێتە بە ئاسماندا
کێڵگەکان بە مین دەچێنێ و
چاڵ و کەندەڵان دەچنێتەوە
خێزانەکان دووچاری کۆچ دەکات و
لەگەڵ پیاوانی ئاینیدا ڕادەوەستێ
کاتێک کە نەفرەت لە شەیتان دەکەن
(داماوە هێشتا دەستی لە ئاگردایە و ئازاری دەدا)

شەڕ بەیانی و ئێوارە کار دەکات
ئیلهامی وتاری درێژ دەبەخشێتە زۆرداران
بە ژەنراڵەکان مەدالیای ئازایەتی و
بە شاعیران بابەت بۆ نوسین دەبەخشێ
بەشداری دروستکردنی دەست و قاچی دەستکرد دەکات
خواردەمەنی بۆ مێشەکان دەستەبەر دەکات و
چەند لاپەڕەیەکی نوێ دەخاتە سەر کتێبی مێژوو
یەکسانی نێوان کوژراو و بکوژ بەرپا دەکات
عاشقان فێری نامە نوسین و
کچان مەشقی چاوەڕوانی دەکات
ڕۆژنامەکان پڕ وێنە و بابەت دەکات
خانەی نوێ بۆ بێ باوکان دروست دەکات
تابوتسازان چالاک دەکات..
دەکێشێت بە پشتی گۆڕهەڵکەنەکاندا
زەردەخەنە لەسەر ڕووی سەرۆک دەنەخشێنێت
بەڕاستی بێ وێنەیە.. کارایی
کەچی کەس بە یەک و شەش ستایشێکی
ناکات......... شەڕ

### * براین تۆرنەر

شاعیری دووەمی ئەم ئێوارەیە (براین تۆرنەر) ساڵی ١٩٦٧ لە ڤیسیلیای هەرێمی کالیفۆرنیای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەدایک بووە، کۆلێجی (هۆنراوەزانی) زانکۆی OREGON تەواو کردووە، بە شێوازێکی ئەکادیمی لە بواری شیعر و شیعر نووسیندا شارەزایە، لە جەنگی دووەمی کەنداودا سەرباز بووە، بەشداری شەڕی عێراق ئەمەریکای کردووە، لەم فێستڤاڵەدا گەلێک یادگاری ڕۆژانی جەنگی عێراق ئەمەریکای گێڕایەوە، ئەو بڕوای وا بوو لە شەڕدا براوە و دۆڕاو نییە، (خێرت بەولینس) پێشکەشکەری کۆڕەکە پرسیاری ئەوەی لێکرد لە کاتی شەڕدا هەستت بەرانبەر بە دوژمن چۆن بوو..؟ بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە و وتی: هەستی چی من خۆم لەو شەڕەدا دوژمن بووم... !

(براین تۆرنەر) یەکێک لەو ڕووداوە سەرسوڕهێنەرانەی لە یەکێک لە شیعرەکانیدا ئاماژەی پێدابوو باسی یەکێک لەو سەربازە ئەمەریکیانەی هاوڕێی بوو، کە لە پاشاندا زانیبووی کە شاعیرێکی ناسراوی هەرێمەکەی خۆیەتی ئەویش سەرباز (موللەر) بوو، کە لەسەر کەناری دیجلە لە بەغدا خۆی کوشت بوو، وەک پرۆتۆستۆکردنی ئەو جەنگە، پاشان کە زانیبووی (موولەر) یەکێکە لە شاعیرە ناسراوەکانی هەرێمی (نیوجێرسی) ئەمەریکا، لەم هۆنراوەیەیدا درامای ئەو ڕووداوە دەگێڕێتەوە:

ماتەمینی
دووشەممەیەک بوو ڕوویدا
11.20 سەرلەبەیانی

کاتــێ پاســەوانانی بورجەکە ســەندویچیان ئەخوارد
نەورەسەکان بەسەر دیجلەدا دەگەڕان
دیلەکان سەریان بە خۆرئاواوە لار کردبۆوە
هەرچەندە گونیەکانی ســەرو شریتی بەستنی چاویان کوێری کردبوون
دەنگەکە بەسەر لۆچی ئۆکۆردیۆنەکەدا دەنگی ئەدایەوە
وەکو لەرینەوەی تاوی شلی پیانۆ..

بــەم جۆرە ڕوویدا لە ژێر ئاســمانی شــیدنی رۆژێکی هەتاویدا
کاتێ سەرباز (موللەر) پەلەپیتکەی ڕادەکێشێ و
دەمی خۆی پڕ دەکات لە قورقوشم و ئاگر
دەنگەکە مەلی سەرئاوەکەی هەڵفڕاند..
سیســارکە کەچەڵەیــەک* لــە ژێــر داری پرتەقاڵەکاندا هەڵوێستە دەکات
ئیتر هیچ شتێک ناتوانێت ئەمە بوەستێنێت
هەرچەندە جوڵەی دەوروبەری تێکدەچێت
هەرچەنــدە دەنگی بێتەلەکان بەشــێوەیەکی پەشۆکاو شپرزە دەبن

ئەگەر تەنیا بۆ یەک سات زەمان ڕاوەستایە و سەرباز موللەر ببینیایە
لەوێ لە ژێر سێبەری داری یۆکالیبتۆسەکەی کەناری ڕووبارەکەدا
چ بێدەنگیەک باڵی بەسەردا کێشاوە.

* سیســارکە کەچەڵە ئاژەڵێکی شیردەرە بە عەرەبی پێی دەڵێن (النمس) بە ئینگلیزی مۆنگۆسە (MONGOOSE).

# فرانز کافکای نامەکان و
# خوان ڕۆڵفۆ و پاتریك ساسکەند و ئەم سەردەمەی ئێستامان

ڕەبیع جابر
لە عەرەبییەوە: سەردەم



«خوان ڕۆڵفۆ» مرد، بەڵام «پاتریک ساسکەند» زیندووە. «ساسکەند» ڕۆژەکانی لە کوێ بەسەر دەبات؟ تەنانەت ئەگەر لە منشنیش نیشتەجێ بێت، شوێن و ڕێی پێنازانین. ئەبێت لە چ جیهانێکی خەیاڵیدا خۆی ونکردبێت؟ بۆچی وازی لە نوسین و بڵاوکردنەوەی ڕۆمان هێنا؟ نوسەری ڕاستەقینە (ساسکەندیش نوسەرێکی ڕاستەقینەیە)، چۆن دەتوانێت دەستبەرداری نوسین بێت؟ چۆن دڵی شەق نابات؟ ئەی چۆن کات (بە تاڵی کات) وێرانی ناکات؟ «خوان ڕۆڵفۆ» پێشتر وایکرد، جگە لە (پیدرۆ

پارامۆ) و کۆمەڵە چیرۆکی (دەشتی سوتێنەر)، هیچی دیکەی بڵاو نەکردەوەو دوای ئەوە بێدەنگ بوو. باسی ئەوەی دەکرد کە ڕۆمانێکی دیکە بە ناوی (زنجیرە شاخ) دەنوسێت، بەڵام لەسەرخۆ دەیکات و پەلەی نییە. ساڵ هات و چوو، ماڵئاوایی لە دنیا کرد و ئەو ڕۆمانەی هەر بڵاو نەکردەوە. ئایا «ڕۆڵفۆ» ئەینوسی؟ یان بێدەنگ بوو لە نوسین؟ چۆن تەحەمولی ئەو بێدەنگییە ناکۆتایەی کرد؟ «ڕۆڵفۆ» نوسەرێکی حەقیقییە. گەر یەکجار (پیدرۆ پارامۆ) بخوێنیتەوە درک بەوە دەکەیت، گەر خوێندنەوەکەت کرد بە دوو جار، ئەوا گیرۆدە دەبیت و ڕەنگە وەکی «گابریل گارسیا مارکیز» ئالودەبیت پێیەوە (ناوگەلێکی زۆر لە کۆمالاوە — گوندەکەی خوان ڕۆڵفۆ — دەچن بۆ ماکۆندۆ. ملکیادس نمونەیەکە لەوانە). یەک نهێنی هەیە کە هەردووکیان کۆ دەکاتەوە، ئەو نهێنییەش: (خەیاڵە). ڕاستە خەیاڵ نهێنی هەموو ئەدەبە، بەڵام لای «ڕۆڵفۆ» و «ساساکەند»، ئەمە زۆر بە ڕون و ڕەوانی دەبینین. هەر یەک لەم دوانە خاوەنی خەیاڵدانێکی تایبەتین. (پیدرۆ پارامۆ) لە بەردەم تاقیکردنەوەی ڕۆژگاردا خۆی ڕاگرت (نیوسەدە زیاتر بەسەریدا تێپەڕیووە)، بەڵام نازانین ئاخۆ (عەتر) و (کۆتر)یش خۆیان ڕادەگرن (ئەم دوو ڕۆمانە لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردودا نوسراون).

لە کافکادا مەرجەعی ئەو دوانە دەدۆزینەوە، بەڵام «کافکا»ی ڕۆماننوس نا (هەموو ڕۆمانەکانی کافکا تەواو نەکراون و گەر هەوڵی ماکس برودیش نەبوایە، هەموی تیا دەچوو)، بەڵکو «کافکا»ی نامەکان و بیرەوەری و کورتە چیرۆک نوس. ڕەنگە «کافکا»ی ڕاستەقینە (نوسەری ڕاستەقینە) لە ناو ئەو بەرهەمانەدا بدۆزینەوە، نەک لە ناو ڕۆمانە تەواو نەکراوەکانیدا، بەڵکو لە ناو نامەکانی و بیرەوەری و چیرۆکەکانیدا.

پێویستە بیر لەو ڕێکەوتە سەیرە بکەینەوە: (بۆچی کافکا ڕۆمانەکانی تەواو نەکرد؟ بۆچی تا دواین دێڕ و خاڵی کۆتایی ناچێت؟). تەنها (بەد گۆڕانی) تەواو کرد. ئەمەش زیاتر بە چیرۆکێکی درێژ دەچێت. (مارکیز دەڵێت لەگەڵ خوێندنەوەی یەکەم ڕستەی بەدگۆڕاندا چارەنوسی خۆم زانی).

«کافکا» نە (دادگا)ی تەواو کرد نە (کۆشک). ڕۆمانە تەواو نەکراوەکانی لە سەدەی سەر شێتی بیستەمدا، نێو و نێوبانگیان بۆ پەیدا کرد. لە پرێکدا و لە ماوەی شەو ڕۆژێکدا، جیهانی واقعی لەگەڵ خەون و پێشبینیە ڕەشبینەکانی «کافکا»دا بوون بەیەک، وەلێ ئەو ڕەشبینیە زۆر جوانتر لە نامە و کورتە چیرۆک و بیرەوەریەکانیدا دەبینرێت.

(دیواری مەزنی چین) نمونەیەکە لەوانە، (کتێبخانەی بابل)ی «بۆرخیس»، لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. (کۆلۆنیەی سزا) و (پزیشکی گوند) و (ڕاپۆرت بۆ ئەکادیمیا)، چیرۆک گەلێکی سەیر و فانتازی و واقعین وەکو ژیانمان. لە نامەکانیدا کە لە نەخۆشخانەی توشبوانی سیلەوە نوسیویەتی و دوا ساڵەکانی تەمەنی لەوێدا بردە سەر، «کافکا» جگە لە خۆی لە کەسی دی ناچێت. کێشی لە ٦٥ کیلۆوە دا دەبەزێت بۆ ٤٩ کیلۆ. لەوەها هەلومەرجێکدا و لە کاتێکدا سیل قوڕگی دەکرۆشت (جۆزڤینی سترانبێژی) نوسی، ئەو مشکەی ستران بۆ حەشامات دەچرێت. «ئەلیاس کانیتی» کە «کافکا» باش دەناسێت و دەربارەی نامەکانی نوسیویەتی، نهێنی ئەوەش دەزانێت کە پاڵ بە هەندێ نوسەرەوە دەنێت بەرەو شوێنێکی دوور. ئەو شوێنە دوورە لە کوێیە؟

بۆچی ناوبەناو نوسەر (وەک تاکە کەسێک)، ژیانی دوور لە خەڵک و کۆمەڵگە هەڵدەبژێرێت؟ ئایا ئەمە کوشتنی ئەدەب نییە؟ «کسینگیان» دەترسا تەنها بێت و چێژی ئەدەب و دۆستایەتی ئینسانەکان لە دەست بدات. لەلایەکی دیکەوە «تۆلستۆی»یش ترسی هەبوو (لانی کەم لە دوا ساڵانی تەمەنیدا) کە خەڵک و خوا ئارامی و سەلامەتی ناوەوەی بشێوێنن. «کافکا» دنیایەکی لەسەریدا دۆزیەوە. لە سەرەتای تەمەنیدا بۆ هاوپۆلێکی خۆی دەنوسێت کە لەبەردەم دووڕیانێکدایە: (یان ئەوەتا ئەوەی لە مێشکیدایە دەینوسێت، یان کەلەی شەق دەبات).

بەهای «کافکا» لە ئالودەبونیدایە بە نوسین و لەو خەیاڵەشدایە کە ئەو ئالودەبوونە تێر دەکات. لە بەدترین و ناخۆشترین کاتەکاندا (جەنگی جیهانی یەکەم بۆ نمونە)، سەر شار بوو بە وزەی نوسین و جوانترین شتی نوسی. «ڕۆڵفۆ» بێدەنگ بوو، «پاتریک ساسکەند»یش بێدەنگە و «کافکا»ش مرد. ڕەنگە دوای چەند ساڵێکی دیکە «ساسکەند» بیر بچێتەوە. کێ ئەم شتانە دەزانێت؟ ڕەنگە دوای سەدەیەک «کافکا»ش بیر بچێتەوە! تا ئێستاش «هۆمیرۆس» دەخوێنینەوە، هەروەها «تۆلستۆی»یش، بەڵام ئاخۆ دوای هەزار ساڵ «تۆلستۆی» دەخوێنینەوە؟ ئایا نەوە دوای نەوە دەیخوێننەوە؟ لەم ڕۆژگارەدا کەس لە هیچ تێناگات. بە دوای کتێب گەلێکدا ڕادەکەین کە ڕەنگە دوای چەند هەفتەیەک بیر بچێتەوە. ڕەنگە هەر ئەوە بکەین کە هەموان دەیکەن: نغرۆ بون لە پوچێتیدا.

تۆ بڵێی نهێنی وازهێنانی «ڕۆڵفۆ» و بێدەنگی «ساسکەند» لەم خاڵەدابێت؟ ئایا هەردووکیان لە دەست خەڵک و خوا هەڵهاتن؟ ئەدیبانیش هەر خەڵک و خوان؟ نەخێر، نوسەر دەیەوێت خۆی بێت. ئەی ئەگەر ئەوانەی خۆشیان دەوێت بونە مەترسی بۆ سەر شوناس و تایبەتمەندێتی، بۆ کوێ بچێت و ڕو لە کوێ کات؟ تۆ بڵێی «ڕۆڵفۆ» توانای دۆزینەوەی ئەو هاوسەنگیەی نەبوبێت کە دەیخواست؟ «کافکا» نەخۆشی سیل وێرانیکرد، بەڵام دەڵێت من خۆم ئەو نەخۆشیە کوشندەم گازکرد: کاتێک بە درێژایی شەوان بێدار دەبووم! نامەکانی «کافکا» ڕێبەرمانە بۆ لای تاکەکەسێک کە لە هەوڵی ئەوەدا بوو ببێت بە خۆی، لە کاتێکدا سەرگەرمی ئەوە بوو، جیهانێکی پێ عەتا کردین.

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی (الحیاە)، ٢٠٠٩/٣/٢٠.

# چاوپێخشاندنێك به‌ ژیان و به‌رهه‌مه‌كانی نوسه‌ری پیرۆیی ماریۆ ڤارگاس یۆسا

له‌ فارسییه‌وه‌:
دڵشاد خۆشناو



ماریـــۆ ڤـــارگاس یۆســـا ته‌مه‌نی بیست ساڵ بوو كه‌ یه‌كه‌مین چیرۆكی بڵاوبـــوه‌وه‌، كورتـــه‌ چیرۆكێـــك بوو به‌ناوی (رێبـــه‌ران) كه‌ له‌ یه‌كێك له‌ چاپه‌مه‌نییه‌كانـــی پایته‌خت چاپكرا. به‌ڵام رێگایه‌كـــی درێژی له‌پێش بوو، ره‌نگه‌ خۆشی هێنده‌ حه‌زی له‌ پله‌وپایه‌ نه‌كردبێـــت كه‌ رۆژێ لـــه‌ڕۆژان ناوی خۆی له‌ نێوان نووســـه‌ره‌ مه‌زنه‌كانی ئه‌مه‌ریكای لاتیـــن ببینێت. ئه‌مڕۆكه‌ ئه‌ده‌بی پڕ ڕه‌ونه‌قی ئه‌مه‌ریكای لاتین قه‌رزاری ماركیز و یۆسا و فۆنتزه‌.

یۆســـا له‌ ســـاڵی ١٩٣٦ له‌ شاری ئاركیپـــای وڵاتـــی پیـــرۆ له‌دایكبوو. بێبه‌خـــت بـــوو، هـــاوكات له‌گـــه‌ڵ له‌دایكبوونه‌كـــه‌ی، دایك و باوكی له‌ یه‌كتر جیـــا بوونه‌وه‌، دایـــك له‌گه‌ڵ ســـاواكه‌ی چووه‌ پۆلیڤیا. تا ته‌مه‌نی

نۆســاڵی لەوێ مانەوە و لە ئەنجامدا گەڕانەوە پیرۆ. هەر لەم تەمەنــە نەوجەوانییەوە لەگەڵ بڵاوکــراوەی لاکرونیــکا هــاوکاری دەکــرد. لەگەڵ بڵاوکردنەوەی یەکەمین شــیعرەکانی و ڕێکخستنی مانگرتنەکانی یەکەمین ساڵەکانی زانکۆ، ڕووی رۆشنبیرێکی تەواوی بەخۆوەگرت. رووی کردە کاری جۆراوجۆر کە جگە لە هەوڵدان بــۆ گوزەرانی ژیان شــتێکی تر نەبــوو. بەڵام بە عەشق و خۆشەویســتییەکی تایبەتیشەوە خەریکــی ئەدەب و ماف دەبوو. ســاڵی ١٩٥٨ بوو کە هەلی خوێندنی بۆ ڕەخســا لە زانکۆی مادرید. ســاڵی دواتر کۆمەڵــە چیرۆکێکی لە بەرشلۆنە چاپکرا. ســەرەنجام وەکو زۆرێک لە هونەرمەندان و رۆشنبیران لە پاریسەوە سەری دەرهێنا. ســەیر لەوەدا بوو کــە لە هەمان ئەو شــارەدا لەگەڵ بۆرخس، فۆنتــز و ژمارەیەکی تری نووسەری ئیسپانی زمان یەکتریان ناسی. لە ســاڵی ١٩٦٣ یەکەمین رۆمانــی بڵاوبووەوە، (سەردەمی پاڵەوان) سەربردەی دەستێوەردانی ســەربازان لە سیاســەت و لایەنە شوومەکانی کۆمەڵایەتیــی، ئابووری و کولتــووری ئەوانە. ئەو شــتەی بووە بۆچوونــی حەتمی زۆربەی گەلانی جیهانی سێیەم و بە تایبەت ئەمەریکای لاتین.

ئەم رۆمانە رووبەڕووی پێشــوازیی گەرمی خوێنــەران بــووەوە. هــەر ئــەو شــیکردنەوە بەرفراوانە بــەس بوو تا ناوی نووســەر وەکو رەخنەگرێکــی رادیکاڵ دەربکەوێت و ژمارەیەک لە کتێبەکانی بەناونیشانی سەرلێشێوێنەر لە مەراســیمێکی رەسمیدا ســوتێنرا. بەڵام ئەمە نابێتە هۆی بەربەســت لــە وەرگرتنی خەڵاتی رەخنەگران لە لایەن یۆســاوە. لە ساڵی ١٩٦٦ دوای چاپی دووەمین رۆمانی (ماڵی سەوز) لە پاریســەوە دەچێتە لەندەن و خەریکی دەرس گوتنەوەی ئەدەبی ئیسپانی- ئەمریکی دەبێت. ســاڵی دواتر دووەمین کۆمەڵــە چیرۆکی بڵاو دەبێتەوە و نووســەرەکەی دەکاتە براوەی دوو خەڵاتی ئەدەبی. کاتێ کە دەچێتە کاراکاس بۆ وەرگرتنــی خەڵاتی رەخنەگرانی ئیســپانیایی، چەندیــن وتــاری دا لەبــارەی چارەنــووس و لێپرسراویەتی نووســەری پیرۆیی. گرنگتریش لەوە دیداریەتی لەگەڵ گابریل گارسیا مارکیزدا کــە دواتر دەبێتــە هۆی هــاوکاری ئەدەبی و بڵاوبوونەوەی (رۆمان لــە ئەمەریکای لاتین). ســێیەمین رۆمانەکەی (گفتوگۆ لە کارتدرال) لە ســاڵی ١٩٦٩ بڵاودەبێتەوە. ســاڵێک دواتر دەچێتە بەرشــلۆنە تا دەستبکات بە نووسینی یەکێک لە باوەڕپێکراوترین ڕەخنەکانی لەسەر بەرهەمەکانــی مارکیــز. ئەم کتێبە لە ســاڵی ١٩٧١ بڵاودەبێتــەوە. پێش ئەوە یۆســا چەند جارێک ســەردانی کوبای کردبوو وەکو زۆرێک لە نووسەرانی ئەمەریکای لاتین، پەیوەندیەکی باشــی لەگــەڵ حکومەتی کوبا هەبــوو. بەڵام زیندانــی بوونی ئەبرتــۆ پادیلا، نووســەری کوبایــی بــوە زەمینەخۆشــکەری ناڕەزایــی بەرفراوانی نووسەرانی ئەمەریکای لاتین. یۆسا لەگەڵ نووســەرانی تری ناسراوی ئەو هەرێمە، ئەو ســەرکوتکردنەیان مەحکــوم کرد کە باڵی بەســەر کۆمەڵگای کوبادا کێشا بوو، تەنانەت خودی کاسترۆشیان مەحکوم کرد. بە هاوکاری ژمارەیــەک لە نووســەرانی هاوبیــری خۆی، بڵاوکراوەی (ئازاد)ی لــە پاریس بڵاوکردەوە و کتێبی (بەسەرهاتەکانی شاراوەی رۆمانێک) ی لە بەرشــلۆنە بڵاوکردەوە. چوارەمین بەرهەمی (پانتۆخای ئەفســەر و خزمەتــی تایبەت) لە ســاڵی ١٩٧٣ دا بڵاوبــووەوە. لە ســاڵی ١٩٧٤، دوای نیشــتەجێبوونێکی درێــژ لــە ئەوروپا، دەگەڕێتــەوە زادگای خــۆی. لە ســاڵی ١٩٧٦

به ســـەرۆکی (ئەنجومەنـــی قەڵەمی ئەمریکا) هەڵدەبژێردرێـــت و ســـەفەری زۆر بـــۆ زانکۆ جۆراوجۆرەکانی ئەورووپا و ئەمەریکا و یەکێتی ســـۆڤیەتی ئەو کات دەکات و وەکو مامۆستای بانکهێشـــتکراو خەریکی وانەگوتنەوە و کۆڕ و کۆبوونەوە دەبێت.

(پوورە خولیا و شانۆنامەنووس) بەسەرهاتی یەکەمین هاوســـەرگیری یۆســـایە کە لە ساڵی ١٩٧٧ چاپ بووە. رۆمانە گەورەکەی (شـــەڕی ئاخیرزەمـــان) کە لە ســـاڵی ١٩٨١ بڵاوبووەوە، بەرهەمـــی کاری هونەرمەندێکە کە ســـەردەمی گەنجی بەســـەرچوە. ئەم پرۆژە مەزنە، لەژێر قەڵەمـــی یۆســـا بە وەســـتاییەکی تـــەواوەوە رێکخـــراوە و قەبـــارەی کار و کەســـایەتییە زۆرەکانـــی و پەیوەندییە بنەڕەتییەکەی رۆمان بە بەشێکی مێژووی بەرازیل، هیچکات نابێتە هۆی سســـتی نووسینەکە. تا ئەو شوێنەی کە ئەم نووسینە بەناونیشانی شتێکی وەکو (شەڕ و ئاشتی) تۆلستۆی لە ئەدەبیاتی ئەمەریکای لاتینـــدا وەســـفکراوە. ئەوەی سەرنجراکێشـــە ئەوەیە کە بەســـەرهاتی ئەم رۆمانەش هەر لە ســـەدەی نۆزدەیـــەم دەگوزەرێت. یۆســـا دوای (شـــەڕی ئاخیرزەمـــان) چەند نووســـینێکی تریشـــی زیاد کردوە بۆ ســـەر نووســـینەکانی پێشتری کە لە نێوانیاندا (ژیانی ڕاستەقینەی ئەلخاندرۆ مایتـــا) و (جەژنی نێری) و (چەند پەندێک بۆ نووســـەرێکی لاو) گرنگی زیاتریان هەیە. بەڵام هێشتاش (گفتوگۆ لە کارتدرال) و (شەڕی ئاخیرزەمان) بە ناونیشانی گرینگترین بەرهەمەکانی نووسەر جێگای سەرنجی خوێنەر و ڕەخنەگرانە.

### سەرچاوە:

سایتی سیب گاززدە.

# بڵاوکراوەکانی
# دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

لە ماوەی دوو مانگی ڕابردودا، واتە لە مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٨و مانگی کانونی دووەمی ئەمساڵ، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم کۆمەڵێك کتێبی گرنگو بایەخداری بەچاپ گەیاندووەو کتێبخانەی کوردی پێ دەوڵەمەند کردووە. کتێبەکان گەرچی هەمویان پێویستیان بە قسەلەسەرکردنو ڕانان هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا ڕانان تەنها بۆ سێ کتێبیان دەکەین. ئەو کتێبانەش بریتین لە کتێبی کامێرای چاوەکانم، زمانی کوردیو دیالێکتەکانی، کەشتیە سپییەکە.

## کامێرای چاوەکانم

ئەم کتێبە بریتییە لە یاداشتەکانی نوسەرو هونەرمەندو ئەکتەری کۆچکردوو مامۆستا «عومەر عەلی ئەمین». بێگومان خوێندنەوەی کتێبی یاداشت، چێژو خۆشییەکی تایبەتی هەیە کە لە کتێبەکانی دیکەدا نییە، کتێبی یاداشت گەر لەلایەن کەسێکی ڕۆشنبیرو شارەزاو خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتییەوە نوسرابێت، کەسێك لە ژیانی گشتیدا ئامادەیی هەبوبێتو ئاگاداری بەسەرهاتو ڕوداوەکانی سەردەمەکەی خۆی بوبێت، کەسێك وەك نوسەری ئەم کتێبە، ئەوا کتێبەکە بایەخێکی گرنگو مەزنی دەبێتو خوێندنەوەشی دەبێتە کارێکی پێویست.

ئاشکرایە کاتێ نوسەرێك پەنا بۆ نوسینەوەی یاداشتەکانی دەباتو بڕیار دەدا بیرەوەریەکانی خۆی بخاتە سەر کاغەو لەوێشەوە بیخاتە بەردەستی خوێنەر، ئەوا مانای وایە ئەو نوسەرە کۆمەڵێ وێستگەو ڕوداوو لە ژیانیدا هەیەو دەیەوێ پێشماڵئاوایی کردن ئاشکرایان بکات. دەیەوێ هەندێ نهێنیو لایەنی شاراوە هەیە کە ئەم ئاگادارییانەو خەڵکانی دیکە لێی بێ ئاگان، ڕۆشن بکاتەوەو ئاشکرایان بکات. بە مانایەکی تر کاتێ نوسەرێك پەنا بۆ نوسینەوەی



یاداشتەکانی دەبات، مانای ئەوەیە ئەو نوسەرە لە بەرهەمەکانیدا نەیتوانیوە جێگا بۆ کۆمەڵێ حاڵەت بکاتەوە کە ڕەنگە بەسەر خۆیدا یاخود کەسانی دیکەدا هاتبێت، بۆیە دێتو لە ڕێگەی نوسینەوەی بیرەوەرییەکانییەوە تیشك دەخاتە سەر ئەو حاڵەتانەو زیندویان دەکاتەوە. نوسەر کاتێك هەستدەکات بەشێك لە یادەوەرییەکانی ماونەتەوەو لە کتێبو نوسینەکانی پێشتریدا دەستنیشانی نەکردوون، ناچار بۆ دەستنیشانکردنو نوسینەوەی ئەو بەشە لەبیرکراوەی یادەوەری، پەنا بۆ نوسینەوەی یاداشتەکانی دەبات.

ئێمە لە کتێبی کامێرای چاوەکانم، لەبەردەم نەك تەنها کۆمەڵێ یاداشتو بیرەوەری نوسەری کتێبەکەداین، بەڵکو لەبەردەم تەواوی ئەو کایە ڕۆشنبیریو هونەریانەداین کە سەردەمانێك بوبونە کایەو ڕۆشنبیری کوردی. کتێبەکە نزیکەی هەشتا ساڵێك دەمانباتەوە بۆ دواوە، دەمانباتەوە بۆ ساڵانی ۱۹۲٦و گەڕەکی سابونکەرانی ئەوکاتو هاتنەدنیای نوسەر. ئیدی لەو چرکەساتەوە ئێمە ئاشنای شاری سلێمانی ئەو سەردەمە دەبین‌و هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵ نوسەردا ئاشنای ئەو گۆڕانکاریانە دەبینە کە بەسەر ئەم شارەدا هاتووە. لە ڕاستیدا کتێبەکە گەشتێکە بە مێژوی هەشتا ساڵەی لەمەوبەری شاری سلێمانیدا، گەشتێك تێدا هەست بە ئارامیو هێمنی ڕۆح دەکەیتو لە دڵەوە سوپاسی نوسەر دەکەیت بۆ ئەو گێڕانەوە مێژووییە.

ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبە ۳۸٥ لاپەڕەی گەورەیەو تیراژی ٥۰۰ دانەیەو نرخی ٥ هەزار دینارە.

## زمانی کوردیو دیالێکتەکانی

یەکێکی دیکە لەو کتێبە نایابانەی دەزگای سەردەم لە ماوەی پێشودا بەچاپی گەیاندووە، کتێبی زمانی

کوردیو دیالێکتەکانی پرۆفیسۆر «د. فوئـاد حەمە خورشـید»ە. ئـەم کتێبـە بـە شـێوەیەکی زانسـتیو ئەکادیمیانە دێرینیو ڕەسـەنایەتیو سـەربەخۆیی زمانـی کوردی دەسـەلمێنێتو دەریدەخات کـە زمانی کوردی زمانێکـی سـەربەخۆیەو بـە گەشەکردنێکی مێژوویانەی خۆیدا تێپەڕیوە. هەروەها دەریدەخات زمانی کـوردی توانیویەتی بەناو قۆناغـە جیـاواز جیاوازەکانی مێژوی ئەم ناوچەیەدا تێپەڕێتو بەرگەی هەمو ئـەو نەهامەتیو نارەحەتیانـەش بگرێـت کـە هاتونەتە سەر ڕێی.

نوسـەری کتێبەکـە بـۆ سەلماندنی ئەوەی زمانی کوردی جیـاوازە لـە زمانی فارسـی، هەوڵێکی زۆری خستووەتەگەڕو لـەو هەوڵەشـیدا سـەرکەوتوو بووە. نوسـەر لە ڕێگەی کۆمەڵێ نەخشـەوە دەیسەلمێنێت زمانی کوردی زمانێکی سـەربەخۆیەو نە لقێکە لە زمانی فارسـیو نە دیالێکتێکی ناوچەیەکیشە کە لە زمانی فارسـییەوە وەرگیرابێت. نوسەر دوای ئەوەی بە وردی قسە لەسـەر جیاوازی نێوان هەردوو زمانـی کوردیو زمانی فارسـی دەکات، دەچێتە سەر بابەتێکی گرنـگو بایەخـداری دیکـە کە لەمڕۆدا بووەتە شوێنی گفتوگۆو قسە لەسەرکردن، ئەویش بابەتی دیالێکتیکەکانی زمانی کوردییە. نوسەر پێی وایە بوونی ئەو چەند دیالێکتیکەی زمانی کوردی بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە کە بریتین لە یەکەم هۆکاری جوگرافیو دووەم هۆکاری سیاسـی. دواتر نوسەر بە درێژی باس لەو دوو هۆکارەو کاریگەریان لەسەر زمانی کوردیو دەڵەمەندکردنـی زمانی کوردی دەکات. پاشان نوسەر بە وردیو بەشـێوەیەکی ئەکادیمی باس لە سەرجەم دیالێکتیکەکانی زمانی کوردی دەکات، لەوانە دیالێکتی کرمانجـی باکـوور، دیالێکتـی کرمانجی ناوەڕاسـت، دیالێکتی کرمانجـی باشـوور، دیالێکتی گۆران.

دواجـار نوسـەر لە بەشـی پێنجەمـی کتێبەکەیـدا باس لە زمانی یەکگرتوی کوردی دەکاتو پێشـنیار دەکات یەکێـك لـەم دوو دیالێکتـە بکرێت بە بناغەی زمانێکی یەکگرتووی کوردیو لە هەموو ناوچەکانی کوردسـتاندا بخرێتـەکار. ئـەو دوو دیالێکتە ئەمانەن:

١-کرمانجی ناوەڕاست
٢-کرمانجی باکور

بەپێـی تێڕوانینـی نوسـەر شـێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست هەرێمێکی فراوانی ناوەڕاسـتی کوردسـتانی گرتۆتەوە، لەوانە شـارەکانی هەولێرو سلێمانیو کەرکوكو خانەقینو سنەو مهابادو بۆکانو سـەقزو سەردەشـت. هەروەها بەپێی سەرنجی نوسەر ئەم دیالێکتە زمانی ڕۆشنبیریو فێرکـردنو پەروەردەکردنی ئەو ناوچانەیەو لە هەموو دیالێکتیکە کوردییەکانـی دیکـە زیاتر پێی دەنوسـرێتو بەرهەمـی پـێ بڵاوبوەتەوە.

هەرچی کرمانجی باکورە، ئەوا نوسەر پێیوایە زۆرینەی میللەتی

## خڵه كرا وه كان

كورد بەم دیالێكتە دەدوێن‌و لە فراوانترین هەرێمی كوردستان بڵاوە، لە كوردستانی توركیاو سوریاو بەشێك لە كوردستانی ئێران‌و عێراق‌و كوردەكانی ئەرمینیاو ئازربایجان پێی دەنوسن‌و زۆرینەی ئەدەبیاتی ئەم دیالێكتە بەپیتی لاتینی نووسراون.

ئەم كتێبە ١٠٩لاپەڕەی بچوكە، تیراژەكەی ٦٠٠دانەیەو نرخی ١٢٥٠دینارە.




### كەشتییە سپییەكە

ئەم كتێبە یەكێكە لە ڕۆمانە شاكارەكانی نوسەری بەناوبانگ «جەنگیز ئایتماتۆڤ»، ئەم ڕۆمانە لەپاڵ هەردوو ڕۆمانی (جەمیلە)و (ماڵئاوا گۆلیساری)، سێ شاكاری نایابی ئەم نوسەرە مەزنەیە. ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە ڕۆمانەكانی «جەنگیز ئایتماتۆڤ» پڕن لە خۆشەویستی‌و مەیلی مرۆڤدۆستانە، كارەكتەرەكانی لەناو واقیعی تاڵی ژیانەوە دێن‌و لێوان لێون لە ئومێدو بەختەوەری. نوسەر توانایەكی سەیری هەیە بۆ ڕۆچونە ناو قوڵایی ڕۆحی مرۆڤەكان‌و تیشك خستنە سەر ئەو شتە پەنهان‌و شاراوانەی لەو قوڵاییەدا پشتگوێخراون.

یەكێك لە خەسڵەتە جوان‌و سەركەوتووەكانی ئەم ڕۆمانەی بەردەستمان، ئەوزمانە شیعرییەیە كە ڕۆمانەكەی پێ نوسراوەتەوە، ئاشكرایە «جەنگیز ئایتماتۆڤ» یەكێكە لەو ڕۆماننوسانەی بایەخێكی زۆر بە زمانی نوسینی ڕۆمان دەدات‌و لە زمانی شیعری نزیكدەكاتەوە. بێگومان ئەم نزیككردنەوەیەی زمانی ڕۆمان لە زمانی شیعر، پێویستی بە سەلیقەو تواناو گەنجینەیەكی زمانەوانییە، چونكە ئاسان نییە بە درێژایی لاپەڕەكانی ڕۆمانێك، پارێزگاری لە ریتم‌و ئیقاعی زمانی شیعر بكرێت. ئەمە تەنها ئەو نوسەرە بلیمەتانە دەتوانن ئەنجامی بدەن كە شارەزاییەكی تەواویان لە نوسین‌و ئەدەبدا هەیە. هەڵبەتە نوسەری ئەم ڕۆمانە یەكێكە لەوان. لێرەدا

پێویسته دهستخۆشـــی له بهڕێز «گوشاد حهمه سهعید» بکهین که به زمانێکی سادهو به کوردییهکی جـــوان کاری وهرگێڕانهکـــهی ئهنجامـــداوه. ڕۆمانی کهشـــتییه سپییهکه ژمارهی لاپهڕهکانی ٢١٩ لاپهڕهی بچوکـــه، تیراژهکهی٦٠٠ دانهیهو نرخی ٢٥٠٠ دیناره.

## ئیلیاده

کتێبـــی ئیلیـــاده یهکێکه لهو کتێبه گرنگانهی دهزگای سهردهم بـــه دیزاینێکـــی جـــوان چاپ و بڵاویکردهوه. ئهم کتێبه لهلایهن نوســـهرو وهرگێڕ «حهمه کهریم عارف»هوه بـــه زمانێکی کوردی پوخـــت وهرگێـــڕدراوه، وهرگێڕ پێشهکییهکی بهپێزی بۆ کتێبهکه نوســـیوه که یارمهتـــی خوێنهر دهدات باشتر له کتێبهکه تێبگات و سودی زیاتری لێببینێت.

ئاشـــکرایه کتیبی ئیلیاده له نوسینی شـــاعیری گریکی ناودار «هۆمیـــرۆس»ه، ئهم شـــاعیره گهرچی تاکو ئێستا ساڵ و شوێنی لهدایکبونی وهک پێویســـت ساغ نهبوهتهوه، بهڵام بهپێی قســـهی مێژونوســـان دهڵێن له ســـهدهی نۆیهمـــی پێش زایـــن له ناوچهی (ئایۆنا) ژیاوه، ئهم ناوچهیه ئێستا دهکهوێته کهناری دهریای ئیجه له بهری تورکیا، ههر لهو شوێنهشدا شاری ترواده ههبووه. سهبارهت به ژیانی «هۆمیرۆس»یش هیچی ئهوتۆ نهزانراوه، ئهوهنهبێت ئهم شـــاعیره گێرهرهوهیهکـــی مهزن و پیاوێکـــی کوێر بـــووه. دهڵێن لـــه ســـهردهمی «هۆمیرۆس»دا شـــیعری مهلحهمی بهشێوهیهکی زۆر بهربڵاوبـــووه، بهشـــی ههره زۆری شـــیعرهکانیش باسیان له کهســـه ئـــازاکان و پاڵهوانییهتی ســـهرکردهکان یاخود باسیان له خهڵکانـــی خـــاوهن کاری چاکه کردووه. لێـــرهوه «هۆمیرۆس» سودی لهو شیعرانه وهرگرتووه و ههردوو داستانه مهزنهکهی خۆی (ئیلیادهو ئۆدیسه)ی نوسیوه.

ئیلیاده قهسیدهیهکی درێژه، ناوهرۆکهکهی باس له جهنگێکی کـــۆن (جهنگی تـــرواده)دهکات



کە هەندێک سەرچاوە دەڵێن نۆ ساڵ درێژەی کێشاوەو هەندێکی دیکە دەڵێن دەساڵ، لەو جەنگەدا گریکەکان شاری ترۆادە گەمارۆدەدەن، تاکو «هێلین» بگەڕێننەوە کە لەلایەن پاشای ترۆادەوە فرێنرابوو. لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتەپێشەوە، ئەویش ئەوەیە ئاخۆ هۆکاری ئەوە چییە کە ئیلیادە لە مێژووی گریکدا گرنگە؟ مێژونوسان گرنگی ئەو داستانە بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە کە سەرەتای دەستپێکردنی جەنگی ترۆادە خاڵی لەدایکبونی نەتەوەی گریکە، چونکە لەکاتی جەنگەکەدا بۆ یەکەمجار بوو گریکەکان وەک میللەتێک کۆبونەوەو یەکیان گرت، تاکو کارێکی جەماعی ڕاپەڕێنن، ئەویش جەنگ بوو لە دژی ترۆادەییەکان. جگە لەوە ئیلیادە پڕە لە بەهای ئەخلاقی بەرزو چەندین ڕوداوی مێژویی ئەو جەنگەی تێدایە، لێرەوە گرنگی و بایەخی ئیلیادە لە مێژوی گریکدا دەردەکەوێت.

ئەم کتێبە ٥٣٥ لاپەڕەی قەوارە گەورەیەو تیراژی ١٠٠٠دانەیەو نرخی ٦٥٠٠دینارە.




### کۆماری ئەفلاتون

ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە گرنگانەی پێویستە لە هەموو کەلتورو ڕۆشنبیرییەکدا هەبێت، کتێبێکە پێویستە بۆ هەموو زمانەکانی دنیا وەربگێڕدرێت، چونکە «ئەفلاتون» لەم کتێبەیدا وێنەی شارێکی یۆتۆپیی دەکێشێت وەک ئەوەی خۆی وێنایکردووەو ڕایدەگەیەنێت کە ڕەگەزی مرۆڤایەتی ڕزگاری نابێت، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە فەیلەسوفەکان ببن بە حاکم یاخود حاکمەکان ببن بە فەیلەسوف.

ئەفلاتون فەیلەسوفێکی یۆنانی کۆنەو یەکێکە لە مەزنترین فەیلەسوفانی ڕۆژئاوا، ئەم کەڵە فەیلەسوفە لە ئەسیناو لە خێزانێکی ئەرستۆکراتی لەدایک بووە، لەسەرەتادا قوتابی دەستی سفستائییەکان بووە، دواتر لە تەمەنی بیست



سـالّيدا پەيوەنـدى دەكات بە «سـوكرات»ى مامۆسـتايەوە. پاشان «ئەفلاتون» زۆر نارەحەت و بێـزار دەبێـت بەرامبـەر ئەو حوكمە ناتەندروسـتەى دەرهەق بە مامۆسـتاكەى دەريدەكەن و دەبێتە هۆى مردنى «سوكرات». مردنـى مامۆسـتاكەى وادەكات «ئەفلاتـون» گرنگـى و بايەخ بـە مەسـەلەى حوكمڕانـى و چۆنيەتـى بەڕێوەبردنى دەوڵەت بدات. لەمبارەيەوە ڕايدەگەيەنێت بـۆ دابينكردنـى دادپـەروەرى پێويستە فەلسەفە ببێتە بنەماى سياسـەت. دواتر «ئەفلاتون» دەڕوات بـۆ باكـورى ئيتاليـا، لەو سـەردەمەدا باكورى ئيتاليا وەک بەشـێک لە ولأتـى يۆنانى كۆن حسـابكراوە. لـەوێ چاوى دەكەوێـت بە فيتاگۆرسـەكان. پاشـان لەوێـوە دەچێـت بۆ سقلييەو «ديۆنسيس»ى پاشاى شارى (سيراكۆسا) دەبينێت. بەو هيوايەى ئەوشارە بكاتە دەوڵەتێک كـە فەلسـەفە حوكمـى بكات. وەلێ ئەم ئەزمونەى سـەركەوتن بەدەسـتناهێنێت و ناچـارى دەكات بەزوترين كات بگەڕێتەوە بـۆ ئەسـينا. دواى گەڕانەوەى لـە باخچەكانـى ئەكاديـۆس، فێرگەيـەک دادەمەزرێنێـت كە دواتر بە ئەكاديميـاى ئەفلاتون دەناسـرێت. بەڵام هەموو ئەمانە ڕێگرنەبوون لەوەى چەند جاريكێ ديكـە هەوڵى ئـەوەى دايەوە لە شارى (سيراكۆسا) ئەو دەوڵەتە دامەزرێنێـت كە فەيلەسـوفان بيبەن بەڕێـوە، وەلێ لە هەموو جارەكاندا شكست دێنێت، ئيدى بۆ دواجار بڕياردەدات لە ئەسينا جێگيـر ببێـت و ژيانـى لەناو قوتابييەكانيدا كۆتايى پێبێنێت.

ئەم كتێبـە لەلايـەن بەڕێز د. «محەمـەد كەمـال» لـە ئينگليزييەوە بە زمانێكى پوخت كـراوە بە كـوردى، كتێبەكە بە ديزاينێكـى قەشـەنگ لە ٣٥٦ لاپـەڕەى مامناوەنديـدا چـاپ و بڵاوكراوەتـەوە، تيراژەكـەى ١٠٠٠ دانەيـەو نرخى ٤٠٠٠ هەزار ديناره.

